# مەحمود مەلا عززەت

# زام و چرا

نیگاری: قادر میرخان

ڕۆڤار
34



بڵاوکراوەیەکی رۆشنبیرییە و هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێک
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێک دەریدەکات



سەربەرشتی گشتی

شێرکۆ بێکەس

ڕاوێژکار

ئەکرەم قەرەداخی

سکرتێری ڕۆڤار

یاسین عومەر

سەرپەرشتیاری هونەری

قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەر

یادگار ئەوڕەحمان

سەرپەرشتیاری چاپ

فەرهاد ڕەفیق

(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێک، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێک دەریدەکات



ناونیشان

سلێمانی – فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ڕۆڤار

ت: 3120690

لە دەرەوەی وڵات

Tel: 00441628477660

Fax: 00441628486008

Web Site

www.sardam.info

Email

Sardam@sardam.info



چاپخانەی (ڕەنج)







## شێوەکار قادر میرخان



- ساڵی 1952 لە گەڕەکی (حاجی احان)ی سلێمانی لەدایکبووە.
- لە کۆتایی شەستەکانەوە بە بەرهەم و نووسین تێکەڵی بواری شێوەکاری بووە.

## ژمارەکانی ڕابردوو

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، موحەڕەم محەمەد ئەمین، دڵدار، مەستوورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە ساڵح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، قازی محەمەد ...

# ژیاننامە

ڕۆڤار



مەحمود مەلا عززەت ناوێکی سەنگین و دیاری ناو بزوتنەوەی روناکبیریی کوردستانییە، هەمووومان کەمتازۆر بیستومانەو خوێندومانەتەوەو لەشوێنێ لەشوێنەکان بینیومانە یا ناسیومانە. بەشی زۆر لەوانەی دەیناسن و لەمێژوو تەمەنێکی بەر لەئێستا واتە لەشەست و حەفتاکاندا ناسیویانە بە ماموستا ناوزەدی دەکەن، لەوانە تیایدایە خوێندکاری خۆی، تیایدایە هاوتەمەن و بگرە جارجارەش گەورەتر لەخۆی، لەمبارەیەوە ئەوەی دەستمانکەوتبێت کەبۆ بەم جۆرەیە، هەندێك دەیانوت کەماموستایەکی زۆر بەتواناو شیرین بووە، هەندێکی تر دەیانوت کەهەر لەگفتوگۆو مامەڵەی شارستانییانەوە کاتێ گوێمان لێگرتووە، ئەو وەك ماموستا دەرکەوتووە، هەربۆیە بالێرەدا ئێمەش لەم دەروازەی ماموستایەتییەوە دوانێکی لەگەڵ سازبکەین. ماموستا ئەو سیاسییەی کە زۆربەمان لە دەروازەی کاروانی بێکۆتاییەوە، ژیانی ناو حەپسخانەو چیرۆکەکانی ناو زیندانەکان و ژیاننامەکەیمان خوێندۆتەوە، ئەو نووسەرەی کارەکانی (لەسەر کۆماری مهاباد بە پێنج کتێبی پڕ لە دۆکیومێنت، ئینجا دیبلۆماسییەتی بزووتنەوەی کوردایەتی، بازنەکانی ململانێ و ستراتیجی ئاسایشی نەتەوە، کورد و ململانێ و ستراتیجی ئاسایشی نەتەوەی کورد لەگەڵ چەندین دانراوو بەرهەمی وەرگێڕدراوی تر لە زمانەکانی عەرەبیی و سویدییەوە بۆ کوردی، جگە لە دامەزراندنی ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان لە سلێمانی بۆ پاراستنی بەڵگەنامەکان، رۆژنامەنووسی) ناسراوە، سەرەڕای ئەوەی خاوەنی دەیان لێکۆڵینەوەو وتار و چاوپێکەوتنی هەمەلایەنەیە لە دەیان ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی عەرەبی و سویدیدا. دواتر، هەمان ئەو پیاوەی لە خۆشەویستی سلێمانی و کوردستاندا، لە گوڕدانی خەبات و تێکۆشانی کوردایەتیدا، نەك نەبووە خاوەنی هیچ پلە و پایەیەکی ماددی بەڵکو ئەوەی کە هەشیبوو، کەوتە بەردەم هەڕەشەی سیاسەتی دوژمنکارانەی داگیرکەران و نەفی و زیندانیکردنی.

ئەم لێدوانە گەلێ لایەن و بابەتی هەمەجۆری بۆدروستکردین، ڕەنگە ئەوەی بیرمان لێکردبۆوە تەنها گفتوگۆیەکی بچوك بێت بەڵام دواجار دەوڵەمەندیی وەڵامەکان و درێژەدان بەوەرگرتنی زانیارییەکان وای لێکردین ئەم بەرهەمەی لێبکەوێتەوە.

ماموستا لەساڵی 1939 لە گەڕەکی گۆیژەی شاری سلێمانی لەخێزانی مەلاعززەت لەدایکبووە، لەو گەڕەکەوە منالی دەستپێکردووەو خوێندنی سەرەتایی، ناوەندی، ئامادەیی تیادا تەواوکردووە، پاش ئەوە بۆ خوێندنی بەرزی زانکۆیی رووی کردۆتە شاری بەغداو لە بەشی مێژووی زانستگای پەروەردەی زانکۆی بەغدا خوێندنی تەواو کردوەو بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لەمێژوودا وەرگرتوە. بوونیشی بەماموستا بەو چەمکە تەقلیدیە لەساڵی 1962 ەوە دەست پێدەکات.

*ماموستا لەسلێمانی و لەسەردەمە جیاجیاکانی نەفیکردندا بەهۆی چالاکی سیاسیەوە، لەنەجەف، کەربەلا، عەمارە، بەغدا و رومادی، بابەتەکانی کۆمەڵناسی و مێژووی لەقۆناغەکانی ناوەندیی و ئامادەیی و

خانەی مامۆستایاندا وتۆتەوە، لەرووی ئیداریشەوە پلەکانی بڕیوە تا گەیشتۆتە یاریدەدەری بەڕێوەبەری پەروەردەو لێپرسراوی کاروباری قوتابخانە سەرەتاییەکان لەپارێزگای سلێمانی.

*لەنێو رۆژنامەو گۆڤارو بلاوکراوە ئاشکراو نهێنییەکاندا، هاوبەشیو بەشداریکردووە، تیایاندا بەزمانەکانی کوردیو عەرەبی دەیان لێکۆڵینەوەو باسی نوسیوەو بلاویکردونەتەوە، بەتایبەتی لە "النور، برایەتی، رزگاری، گزینگ، رابوون، مامۆستای کورد،*نوێ دەم، کوردستانی نوێ، دەنگی مامۆستاو گەلێکی تر."

*مامۆستا لەسەردەمی سەرەتای لاوییەوە (لەکۆتایی پەنجاکان)ەوە هاوبەشی بزوتنەوەی نیشتمانی خەباتی سیاسیو ڕێکخراوەییو شۆڕشو چالاکیی یەکێتیی قوتابیانو مامۆستایانی کوردستانی کردوە، لەئاستو پلەی جۆراوجۆردا بەشداربووە تادەگاتە ئەندامی سکرتاریەتی ئەو دوویەکێتییەو ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی، (باڵی مەکتەبی سیاسی) بووە.

لەکۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستاندا پاشان بۆ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەشارو لەشاخ، نەفیگەو ئاوارەیی، لەناو زیندانەکانی رژێمی حزبی بەعس لە هەیئەی خاصەی کەرکوكو ئەمنی عامەی بەغدا، یا لەپەناهەندەیی ژیانی دوور لەنیشتمان هەمیشەو بێوچان، بێکۆڵدانو نوشوستخواردن تێکۆشاوەو تائەمڕۆ، درێژەی بەخەباتی ئاشکراو نهێنی خۆی داوە.

*مامۆستا لەناو ململانێو هەڵەو وەچەرخاندنی سیاسیو دووبەرەکیدا، بەپێی پەرژەوەندی بەرزی نەتەوەی کوردو سودی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان، هەڵوێستی وەرگرتوە، ئەگەر بەپێچەوانەی راوبۆچوونو هەڵوێستی ڕێکخراوەکەی خۆشی بوو بێت.. وەك خۆی دانی پێدا دەنا هەرلەو مەڵبەندەشەوە بیری سەرجەم نوسینو لێکۆڵینەوەو بەرهەمی بلاوکراوەو چالاکیە هەمەجۆرەکان سەرچاوەیان و ئیلهامیان هەڵگرتووە.

*لەساڵی 1987-وە لەئەرشیفی هەرێمی شاری ئۆپسالا لەسوید Landsarkivet بە Arkieassestent دامەزراوە.

*ئەندامی یەکێتی نوسەرانی سویدە.

مامۆستا تا لە ژیاندا بوو، سەرباری تەندروستیە خراپەکەی، بۆ ساتێکیش لە نووسین و خوێندنەوە خزمەت غافڵ نەبوو، لەماوەی ئەو 66 ساڵ تەمەنە پڕ لە کوێرەوەری و نەخۆشی و ناخۆشیەی خۆیدا چەندین کتێبی بەهاداری نووسیوە.

## هەندێ لەبەرهەمە بلاوکراوەکانی بریتین لە:

**یەکەم-نوسینو دانراو:**

1-دیپلۆماسێتیی بزوتنەوەی کوردایەتی، سلێمانی 1973.

2-کۆماری میللی مەهاباد.

*چاپی یەکەم: کوردستان 1984(یەکێتیی نوسەرانی کوردستان بەچاپی گەیاند).

*چاپی دووەم، ستۆکهۆڵم 1986.

3-رەگو ریشەی مێژوی تەقەلای بەعیراقیکردنی کوردو مەسەلەی کوردستان. سوید 1987.

4-کوردو ململانێو ستراتیجی ئاسایشی نەتەوە، کوردستان-1988(کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان چاپی کردو بلاوی کردەوە).

5-دەوڵەتی جمهوری کوردستان-نامەو دۆکومێنت-بەرگی یەکەم، ستۆکهۆڵم-1992.

6-دەوڵەتی جمهوری کوردستان-نامەو دۆکومێنت-بەرگی دووەم، ستۆکهۆڵم-1995.

7-دەوڵەتی جمهوری کوردستان-نامەو دۆکومێنت-بەرگی سێیەم، ستۆکهۆڵم-1997.

8-بازنەکانی ململانێو ستراتیجی ئاسایشی نەتەوەی کورد،

چاپی یەکەم، سلێمانی-1998 بنکەی ئەدەبیی و رووناکبیری گەلاوێژ بەچاپی گەیاندو بلاوی کردەوە.

چاپی دووەم، سلێمانیی-1999(لەسەر ئەرکی کتێبخانەی سلێمانی چاپو بلاوکراوەتەوە.)

9-کاروانی بێ کۆتایی،

**-چاپی یەکەم سلێمانی-2000 (دەزگای چاپو پەخشی سەردەم).**

**-چاپی دووەم، سلێمانی 2000(لەسەر ئەرکی کتێبخانەی سلێمانی چاپکراوە).**

**دووەم-وەرگێران:**

1-دەروێشەکان بەدوای راستیدا ئەگەڕێن، شانۆگەرییەکی سیاسییە، نوسینی: مستەفا حەللاج. لەگەڵ نوسینی پێشەکییەك بۆ دەقە کوردییەکەی.

- چاپی یەکەم، ئۆپسالا-1983.

-چاپی دووەم-سلێمانی2000.

2-جولانەوەی رزگاریخوازانەی کورد لەخەباتیدا بۆ سەربەخۆیی نەتەوایەتیو سیاسیی، نوسینی: پرۆفیسۆر رادوڤان پاڤیچ، لەگەڵ نوسینی پێشەکییەكو ڕێکخستنی فەرهەنگیلەیەك بۆ دەقە کوردییەکە.

-چاپی یەکەم-ستۆکهۆڵم-1985.

-چاپی دووەم- کوردستان-1986(کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان چاپو بلاوی کردەوە).

3-کورتەی مێژوی فەلسەفە-بەرگی یەکەم-سوید-1988 لەگەڵ نوسینی پێشەکییەکی 39لاپەڕەیی لەژێر ناوی: " ئەم بەرهەمەو فەلسەفەو وشەیەك بۆ جولانەوەی نیشتمانیی کوردستانو نرخاندنی زانستیانە"لەگەڵ ڕێکخستنی فەرهەنگیلەیەك بۆ لێکدانەوەی زاراوە فەلسەفیو سیاسییەکان.

4-لەپێناوی گەشەپێدانی ئەرشیفە نوێ دامەزراوەکانی کوردستان (چۆن ئەرشیف دادەمەزرێنرێت)سلێمانی 2000.

5-چۆن بنووسین، وەرگێڕان و ئامادەکردن، لە بڵاوکراوەکانی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ.

سێهەم-بەرهەمی تری نوسەر کەبەناوێکی ترەوە بڵاوکراوەتەوە:

-خەباتی کرێکاران-سلێمانی 1973: بەناوی یەکێتی نەقابەکانی ناریزگای سلێمانی بڵاوکراوەتەوە.

چوارهەم-

چەندان دیدەنیی و لێکۆڵینەوەو باسی بڵاوکراوە لەگۆڤارو ڕۆژنامەکاندا، لەوانە: ڕۆژنامەی: خەبات، النور، برایەتی، التآخی، کوردستانی نوێ، الاتحاد، ئاڵای ئازادی. گۆڤاری: رزگاری، گزینگ، مامۆستای کورد، رابوون، نوێدەم، ئاران، پەیڤین، نڤار، ڕۆژنامەی UPPSALANYATIDNING(بەزمانی سویدیی).


سەرچنار 1956


مەحمود مەلا عززەت 1954


لە چەپەوە: مەحمود مەلاعززەت ، محەمەد مەلا عززەت، ڕەوف مەلا عززەت
سلێمانی 1957


لە چەپەوە: مەحمود مەلاعززەت ، نەناسراو، نەناسراو، شێخ حسێن شێخ قادر - 1954

# پێشکەشکردنی هەندێ لەبەرهەمەکانی مەحمود مەلاعززەت

ئامادەکردنی: پێشڕەو ئەحمەد

ناوی کتێب: کۆماری میللی مەهاباد- لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسی‌یە
چاپی یەکەم: کوردستان
ساڵی چاپکردن: 1984
یەکێتیی نووسەرانی کوردستان بەچاپی گەیاندوەو بڵاویکردۆتەوە.
(237) لاپەڕەیە لەگەڵ پێشەکی‌و دە بەڵگەنامەدا.

چـاپی دووەم/ سـتۆکهۆڵم سـاڵی چـاپکردن: 1968 هــەمان ناوەڕۆکی چاپی یەکەمـە، لەگـەڵ پێشـەکییەکی نـوێ کـە چیرۆکی بەچاپگـەیاندنی بەرهەمەکـە تـەواو دەکـا لەسـاڵەکانی (1971-1984)دا.

"یەکێك لە بنەماکانی نەتەوە مێژووەکەیەتی..." مێژوو لەپێناو ناساندنی رابـردووی خەڵکەکـەیدا... ئەگـەر سـەرەتای مێـژووی نەتـەوەی کـورد لـەرووی نـەبونی سـەرچاوەی بـاوەڕپێکراوو بەڵگەنامەو دەکۆمێنتی رەسەنەوە کە ئەمەش لەخۆیدا بۆ دوو هۆی سەرەکی دەگەڕێتەوە: یەکەم: لاوازی هۆشیاری نەتەوەیی لای کورد کەبەلایەکەوە پێویست نەبێ مێژووی رابردووی خۆی تۆمار بکا، دووەم: داگیرکـاریی بـەردەوامی ناوچەکـەی بەشـێوەیەك هــەموو کەرەسـتە کۆکـراوە مـادی‌و مەعنـەوی‌و هـێزە بازووییەکـەی لەمەترسی لەناوچوون دابووە.. بەمە سەرەتایەکی مێژوویی باشمان دەست نەکەوتبێ... ئەوا لەمێژووی نوێ‌و سەدەی نوێدا هەڵەیەکی کوشندەیە... پێویستیی مێژوویی بۆ ئەو نەتەوانەی کە خاوەنی قەوارەی سیاسی‌و دەوڵەتی خۆیانن لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە دوپاتبکرێتـەوەو هـەموو لایـەك ئـەو مێـژووە بناسـن. بـەڵام بـۆ نەتەوەیـەکی ژێـر دەسـتی وەك کـورد جگـە لـەوەی پێویسـتە نەهامەتییەکانی رابردووی خـۆی بناسـێ، پێویستیەکی دیکـەیش هەیـە ئـەویش وەرگرتنـی دەرس‌و پـەندی مێژووییـە لـەو رووداوو هەلومەرجـە تایبەتیانـەی کـە هاتوونەتـە رێـی... کـەوابوو دەکـرێ مێـژوو ئـەرکی کەرەسـتەیەك ببینـێ لـە کاروبـاری رۆژانــەدا... بەمانایەکی دیکە مێژوو دەتوانێ بەشێك لە پرسیارەکانی رۆژگار لە ئـەمرۆو داهـاتوودا وەڵام بداتـەوە... نموونـەیـەك کـە لـەم کتێبـەی مامۆسـتا مـەحمود مـەلاعززەتدا بـەدی دەکـرێ خستنەڕووی وانـە مێژووییـەکانی ئەزمونێکی کوردستانە کەتائەمڕۆش بەزۆربەیانەوە دەنـاڵێنێن‌و بونەتـە کێشـەیەکی دەرگـا لەسـەر داخـراو، بەمـەش چەندین ساڵ مەسـەلەکەمانی بـەرەو دوا گـەڕاندۆتـەوە. دوابـەدوای ئـەزمونی شـێخ مـەحمودی نـەمر لـەم سـەدەیەدا، کۆمـەڵێك تایبەتمەندی‌و خاسیەتی جیاواز روو دەکاتە ناوچەکە کەدوو شێوە تێڕوانینی لەسەرە:

*پاشەکشەی بزووتنەوەی کوردایەتی.

*خۆگونجـاندنی بزووتنـەوەی کوردایـەتی لەگـەڵ واقیعـی نێودەوڵـەتیدا. بـەمانای وەك دابـەزین لـەدروشمی کوردایـەتی‌و ناسینی سیاسەتی دنیاو هەوڵدان بۆ جێگاکردنەوە لەنێویدا. هەموو ئەو خەسڵەتانەی لە (دەوڵەتی جمهوری کوردستان)دا گرتبوویە بەر جێگەی قسەو باسێکی زۆرن. دەبوایە چەندین کتێب‌و گفتوگۆنامە لەمەڕ لایەنە شاراوەکانی چاپ‌و بڵاوکرایەتەوە.

سـەرەڕای ئـەوەش ببوایەتـە مەسـەلەی توێژینـەوەی زانسـتی‌و چەندین کەسانی تایبەتمەند لـەو بارەیـەوە کـاری پێویسـتیان تیـا ئـەنجام بدایـە. یەکـەمین لێکۆڵینـەوەی زانسـتی لـەو بارەیـەوە" مەبەستم کۆماری میللی مەهاباد"ە نووسەر لەم کتێبەدا زۆر لایەنی ئەو کۆمارەی تاووتوێ‌و پێشکەش کردووە.

لێکۆڵەر لەبەشی یەکەمی لێکۆڵینەوەکەیدا بـاس لـەو کۆسپ‌و تەگەرانـە دەکـا کـە دێنـە رێـی توێـژەر لـەکاتی نوسـینی باسـێکی مێژوویـدا ئـەویش دەسـتکەوتنی چاوگـەی مێژووییـە. زۆرێـك لەرووناکبیرانی ئێمە ئەم لێکۆڵینەوەیەیان بینیوەو خوێندۆتـەوە، و وەك سەرچاوەی یەکەم لە ناسینی ئـەو کۆمـارەدا بەکاریانـهێناوە، لەبەرئـەوەی رەنگدانـەوەی زانستیانەی هەلومـەرج‌و مێـژووی ئـەو رووداوە گرنگەیـە لـەمێژوودا. مـاندوبوونی لێکۆڵـەر لـەوەدا بـەدیار دەکەوێ کە هیچ باسێکی وەك سەرچاوەی سـەرەکی لەبەردەسـتدا نـەبووە.. هـەموو ئـەو چاوگەیانـەی ئـەو پشـتی پێ‌بەسـتوون پێکهاتوون لەرۆژنامەو بڵاوکراوەکانی سەردەمی کۆمارو ئەو دیوانە شیعری‌و نامیلکەو وتـارو باسـە مێژووییانـەی تیشـکیان خسـتۆتە سەر کۆمارەکە.

لێکۆڵەر لەبەشی دووەمـدا بەلایـەنی سۆسـیۆلۆژیای کۆمـەڵگای کوردیـدا رۆدەچـێ‌و لەوبارەیـەوە باسـی گەشـەکردنی نائاسـایی کۆمەڵگای کوردی‌و سیاسـەتی ئیمپریـالیزم لـە کوردسـتاندا دەکـا، لەبەشی سێیەم‌و چوارەم‌و پێنجەمدا باسی زەمینـەی لـەبار دەکا بۆ

دامەزراندنی ئەو کۆمارە هەروەها وتوێژەکان لەگەڵ سۆڤیەت، هەر لەوێدا بەدرێژیی باسی دامەزراندنی کۆمەڵەی (ژێ. کاف)و ئەندامان و پرۆگرام و دروشمە نەتەوەییەکەی دەکاو دواتر بەحزبی دیموکرات و سەردانەکانی وەفدی کوردی و دامەزراندنی دەوڵەتی جمهوری کوردستان و پێکهاتنی دام و دەزگاکانی بەڕێوەبردن لەو کۆمارەدا دەخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. لەبەشی شەش. و حەوت و هەشتدا بەوردی هەڵسەنگاندنی چینایەتی و دەستکەوتەکانی و ئەو پیلان و نەخشە دوژمنکاریانەی لەدژی کێشراون تاروخانی کۆماری باسدەکا.

گرنگیی هەرە گەورە لەوەدایە لێکۆڵەر توانیویەتی بێ پێچ و پەنا ئاماژە بەو هۆییانە بدا کە (دەوڵەتی جمهوری کوردستان)ی پێ رووخا. لەوانە باسی هۆ ناوخۆییەکان دەکاو پەنجە دەخاتە سەر ناتەواوی و خاڵە لاوازەکان، ئەمەش بەدرێژی لەبەشی نۆیەمدا هاتووە.

لەبەشی دەیەمیشدا کۆمەڵێك دەرس و پەند ریز دەکاو پێی وایە تا وردو ژیرانەتر لەو وانەو پەندە مێژووییانەی بڕوانرێ سودبەخشتر دەبین و ئەزموونەکانی پاشترمان دەوڵەمەتر ئەبن. ئەمڕۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە لەرووی زانستی‌یەوە بەسەرچاوەیەکی دروست و پەسەند دەژمێردرێ و لەبابەتە زانستییەکاندا سەبارەت بە مێژوو پشتی پێ دەبەسترێ.

لەم ڕوانگەیەوە د. کەمال مەزهەر لە نامەیەکی تایبەتدا گرنگیی ئەم کتێبەی لە رووی مێژوویی و زانستییەوە نرخاندووەو دەقی نامەکەش لە بەرگی سێیەمی دەوڵەتی جمهوری کوردستاندا بڵاوکراوەتەوە.



**ناوی کتێب: رەگ و ڕیشەی مێژوی تەقەلای بەعیراقی‌کردنی کوردو مەسەلەی کوردستان- بەشی یەکەم**

**ئابی 1987**

**چاپی یەکەم- سوید- 88 لاپەڕەیە.**

کۆلۆنیالکردنی نیشتمانی کوردو بەتاڵانبردنی داهاتە ئابوورییەکەی تا سڕینەوەی کەسێتیی نەتەوەیی و لاوازکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و پەرتەوازەکردنی بەشەکانی کۆمەڵگای کوردی، پرۆژەی داگیرکەرانی کوردستان بووە لەسەرەتای پرۆسەی داگیرکردنەوە.. نەمەینی هەستی نەتەوەیی و شەڕەکوتەك و بەرژەوەندییخوازیی ناوخۆو دزینی ژێرخانە ئابوورییەکەی، کۆمەڵە هۆکارێك بوون کەرێگرییان لەبەردەم هاتنەکایەی دەوڵەتێکی کوریدا دروستکردووە.

بۆ حاڵەتەکانی شەڕی داگیرکەران، هەمیشە " کوردستان" مەیدانی ململانێی ئەوان بووە، بەمەش ماڵکاول و کوشتوکوشتار بۆ کورد بەجێدەما.. لەویش مەترسیدارتر حاڵەتەکانی دوای شەڕو ئارامبونەوەی بارودۆخەکە کاتی جێبەجێکردنی پرۆژەکانیان بووە.

جیا لەم باسە گرنگانەی مێژوی کورد، هەوڵەکانی بەعێراقیکردنی مەسەلەی کورد لەباشووری کوردستان ئەو باسەیە کە مامۆستا مەحمود مەلاعززەت لەم بەشەدا لێی دەدوێ.

بیری بەستنەوەی کوردستان بەعێراقەوەو مەسەلەی نەتەوایەتی گەلی کورد بەسنوری سیاسی و جوگرافیی دەوڵەتەکەیەوە.. تەقەلای بەعێراقیکردنی گەلی کوردو ئامانجە پلەیی و ستراتیژییەکەی... گەلەدیاردەیەکی نوێ نین و لەدایکبووی پێشترەو بنکەو بنەچەی ئابوری و مەتریالیی مێژوویی خۆی هەیە... ئەو راو دیدو نەخشەو تەقەلایانە لەرێڕەوی روداوە یەك لەدوای یەکەکانی ساڵانی پێش و سەردەم و پاش جەنگی یەکەمی جیهانیدا سەریان هەڵداوە و گەشەیان پێکراوە، زەمینەو بنکەو سنوری سیاسی و جوگرافی بۆ رەخسێنراوە، ئینجا هەوڵی چەسپاندن و بەهێز کردن و بەئەزەلیکردن و خولقاندنی هەلومەرجی رەسیویی ژیانی و بەردەوامی دراوە. لەسەردەمێکی تری دواو ناو ئەو دیاردەیەدا تێندێنسی بەعەرەبکردن و تەقەلای تواندنەوەی نەتەوەی کورد سەری هەڵداو ئەم بیرکردنەوەیە بەجۆرێ خۆی لەسەر شانۆی رووداوەکان سەپاند کەبەتەنیا لەسنوری بەعێراقیکردنەکەدا نەمێنێتەوە. بەڵکو لەو کاتانەدا کە سەرجەم گەلانی عێراق بەنەتەوەی کوردیشەوە هەموو سنوری سیاسی ئێستای عێراق، بەکوردستانیشەوە، بەبەشێکی هەرگیز لێ جیانەبووەی نەتەوەو نیشتمانی عەرەب لەقەڵەمبدات،ئەمە گەوهەرە راستەقینەکەی بەعسگەرایی بووە. لەناو ئەو دیاردانەدا ململانێ و خەباتی جۆراو جۆری دژ بەو تەقەلایانە هاتە روو.. هەروەك دژە کرداری ئەو دیاردانەو رەنگدانەوەی خواست و ئارەزووی سەربەخۆیی نەتەوەی کورد، بووە هێزێکی مەتریالی و چەسپیووی ئەوتۆ کە لەناو زۆرانبازییەکی نابەرابەرو سەختدا تێکۆشانی دژ بەداگیرکەرو ئەو نەخشانە درێژە پێبداو بگاتە ئەم مەڵبەندە هەستیارەی ئەمڕۆ.. زۆرجار مەسەلەی بەعێراقی کردن لە تەماهی بونی دروشم و ستراتیژی حزبە کوردی‌یەکاندا بوەتە بەشێك لەداخوازیەکانیان... پێیان وایە کێشەی کوردستان کێشەی گەلانی عێراقەو بە کۆمەڵێك پاساوی ئابووری و جیوپۆلەتیکی ئەوبڕوایە دەسەپێنن کە کوردی عێراق و باشووری کوردستان لەگەڵ ئەو بەشەی نیشتمانی عەرەب پێکهاتەیەکی یەکگرتوون و بەدابڕانیان لەیەکتر، کێشەکان خەستتر دەبنەوە... تا ئەو رادەیەی بەجیا لەیەك ناژین.

ئەم کتێبەی مامۆستا مەحمود هەوڵئەدا ئەو بیرکردنەوانە پووچەڵبکاتەوەو لەوێوە بدوێ کەمەسەلەی کوردستان مەسەلەیەکی سەربەخۆو تایبەتەو ناشێ بە بەعێراقیکردنی، چارەنوسی مەسەلەکە لەیادبکرێ.

**ناوی کتێب: تێڕوانینێکی سەردەم بۆ کۆمارەکەی مەهاباد**

**بۆ یادی 52 ساڵەی دامەزراندنی کۆماری میللی مەهاباد نوسراوە.**

**49 لاپەڕەیە.**

ناشێ ئاخاوتن لەمەڕ کۆماری میللی مەهاباد کۆتایی هاتبێ، پاش(52) ساڵ بەسەر دامەزراندنی ئەو کۆمارەدا کەچی گەلێك بواری شاراوەیەو وەك پێویست باسی لێ نەکراوە... ئەم کۆمارە سەرەڕای ئەوەی ئەزمونێکی گەورەو جولانەوەیەکی رزگاریخوازانە بوو زۆر گرنگی دیکەشی لەخۆیدا بەرجەستە کردبوو... لەوانە: ئەو دەسەلاّت و ڕێبەرییە ڕەهایەی سەرەك خێلی لەبۆتەی بڕیاری دەستە جەمعیدا تواندەوە، جولانەوەی خەلکی لەسنوری حزبدا یەکخست و بۆ یەکەم جاریش بوو دەسەلاّتی کوردی لەشێوازی سیستەمی کۆماریدا ڕێکخرا.

لەمانگی ئەیلولی ساڵی 1941دا سۆڤیەت و ئینگلیز ( تاران)یان ئاگادارکرد کە ئەگەر لەماوەی (24) سەعاتدا جاسووسەکانی دەرنەکات بەهێزی چەکدارەوە دێنە ئێران. ئەوە بوو بەهێرشی سوپای ئینگلیز لەباشوور و سوپای سۆڤیەت لەباکوورەوە، ئێران داگیرکراو رەزا شا لێخراو بۆ دروگەی مۆریس دوور خرایەوە.. لەشکری سوور ناوچەکانی ئازەربایجان و بەشێکی کوردستان- ناوچەی موکریان-ی دەست بەسەداگرت، ئەو بۆشاییە ئیدارییەی لەناوچەکەدا هاتە دروستبون، هانی زۆر کەس و لایەنی‌دا بەڕێوەبەرێتی خۆ بەخۆ پێکبهێنێن. لەناو کوردەکاندا کۆمەڵەی ئازایخوازانی کوردستان لە (1939-1941) دروست بوو بوو. دواتر لە 16ی ئەیلولی 1942 کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان پێکهات و بووە بناغەی ڕێکخراوە نوێیەکە (حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران) سەردانی چەند جارەی وەفدی کوردان بۆ باکوور داخوازی و گوتارە لاوازەکەی میللەتی ئازەربی بەرپێیەی فیرقەی دیموکرات گۆڕانیان لەدروشم و کاری کوردەکاندا لێکەوتەوە، کە بەگشتی زۆرێك لە کێشەکان لەدوو تەوەرەی رامیاری و سەربازیدا فۆرمەلە دەکرێن. لەتەوەری یەکەمدا ساکاری روانینی خود وەك سەرکردەو بچووککردنەوەی قەوارەی خودی گەورە شوێنەواری باشیان بەسەر ئایندەوە جێ نەهێشت. بەدوای گوتاری دەولەتخوازیی جولانەوەکەی شێخ مەحمودا دروشمی (خود موختاری) تەرحدەکرێت. بەمەش کورد وەك نەتەوە لەمافی رەوای خۆی پاشەکشێ دەکات بۆ مافی پلە پێنج واتە بەبازدان بەسەر (کۆنفدراڵی و ئۆتۆنۆمی نێو دەوڵەتی و فیدراڵیدا).

لێرەدا وەك داوای ناوەوە دەبێتە خودی موختاری، لەدەرەوەشدا داواکرا بوو کە بۆ ئەوەی مەسەلەی کورد نەبێتە هۆی شڵەژانی پەیوەندی نێودەوڵەتان لەهەلومەرجی ناسکی جەنگی دووەمدا لایەنە پێشکەوتنخوازو چەپڕەوەکان لەپێناوی وەدەست هێنانی مافە نەتەوایەتیەکان و سەلماندنی مافی ئۆتۆنۆمی گەلی کورد.. خەبات بکەن و مەسەلەی یەکگرتنەوەی هەموو پارچەکانی کوردستان و پێکەوەنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ قۆناغێکی تر دوا بخەن. هەر بۆیە دروشمی- خەباتدەکەین لەپێناوی مافی ئۆتۆنۆمیدا بەرزکرایەوە. (جولانەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان د. عەزیز شەمزینی بەشی سێیەم، وەرگێرانی فەرید ئەسەسەرد 1984 ل15)

بەرامبەر بەم رازیبوونە بە ئۆتۆنۆمی و رەتکردنەوەی پارچەبوونی خاکی ئێران، هیچ ئامادەییەك لە پایتەخت و ناوەندەوە نەدەبینرا وەك نوسەر ئاماژەی پێ دەدات:" ڕاپەڕاندنی کۆماری بەنوسین و بە گوتەو جووڵە کۆمارەکەیان بەبەشێکی جیانەبووەوەو لەئێران دادەنا... لەگەڵ ئەوەشدا هیچ جۆرە نەرمیەیەك ئامادەبونێك بۆ سەلماندنی جۆرێ لەمافی نەتەوایەتی پیشان نەدەدرا، بگرە، بەئاشکرا لەسەر نەخشەی لەناوبردن کاریان دەکرد" لا 15. بەمانای لەرووی رامیارییەوە بەرنامەی دەسەلاّتدارێتی کۆماری بۆ ئەو هەلە مێژووییە لەناوخۆدا بەو کێشەیەوە دەینالاند.. لەسەر ئاستی ئیقلیمیش "گەلێ پەیمان و ڕێککەوتن لەنێوان دەوڵەتانی هاوپەیمان و لەگەڵ تارانیشدا مۆرکرا... لەوانە پەیمانی سێ قوڵی (الاتحاد) لە 29ی کانوونی دووەمی 1942"لا25. بەمەبەستی لەناوبردنی ئەو ئەزمونە.

هەروەها لەسەر ئاستی جیهانی: سۆڤیەت یارمەتی داو لێیشی پاشگەزبووەوە. دەوڵەتانی خۆرئاواش "نەك هەر ئاوڕیان لەکۆمارەکە نەدەدایەوە، بەڵکو بۆ رووخاندنیشی نەخشەیان بۆ تاران سازدەکرد و یارمەتیان دەدا".لا24

هەرچەندە جارەجارە دەوڵەتێکیان بەئازادی خوازو دۆستی سەربەخۆیی لەقەڵەم دەدا (کۆمەڵەی ژێ. کاف زۆرجار دۆست و دوژمنی تێکەڵ دەکرد، سەرنج بدەنە ئەم لایەنە لەژمارە (3،4)ی ساڵی یەکەمی گۆڤاری (نیشتمان)دا هاتووە: کورد ماوەیەکی زۆر لەمێژە هەستی بەنەجابەت و مرۆ خۆشەویستی بەریتانیا کردوە، ئەم حکومەتە گەورەیە بەدرێژیی مێژووی ئیمپراتۆریەتی خۆی هەمیشە پارێزگاری ئازادی و سەربەخۆیی و پەروەرێنەر و پێگەهێنەری نەتەوە بچوکەکانی گێتی بوە. تاکۆتایی نوسینەکە بەم جۆرە دێت"بژی الا هەڵگری ازادی گێتی بەریتانیای مەزن"، ل69 کۆماری میللی مەهاباد، مەحمودی مەلا عززەت بەشی یەکەم 1984.) بەمەش دەردەکەوێت کەلاوازیی کورد لەسەرئاستی دیبلۆماسی و نەبوونی خوێندنەوەی تەواو و پشت بەستن بەدەرەوە چەندە زیانیان لەکێشەکەمان داوە. هەروەها نەبوونی خوێندنەوەی شەرعیەتی هەرێمی و نێودەوڵەتی کێشەکانی قەبەتر کرد...

لایەنی سەربازیش تەوەرەی دووەم پێك دەهێنێ. دوابەدوای هاتنی بارزانیەکان بۆ ژێر دەسەڵاتی کۆمارو دوای رێکخستنی سەربازی بەعەشیرەتو پێشمەرگەو موریدان، بەسوارەو پیادەوە، ژمارەی گەیشتە (12750) دوانزە هەزارو حەوت سەدو پەنجا پێشمەرگە.( یاداشتەکانی ژیانی قەوامولسەلتەنە گۆڤاری کلتور ژمارە 2–3 ساڵی 1988 هەروەها حکومەتی کوردستان –نەوشیروان مستەفا ئەمین 1993 ل175). ئەم ژمارەیە بۆ رژێمێکی ناوچەیی وەك کۆمار دەبوایە سودی لێوەربگیرایە، ..

هەموو ئەو شەڕانەی لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندا دەکران، لەوانە شەڕەکانی سەراو مامەشا، نەقۆزرایەوە، بەمانای ئەوەی کار بۆ فراوانکردنی سنوور نەکرا، مانەوەش لەو قەیرانە ئابووریو سەختەدا بەچاوەڕوانیی گفتوگۆوە بەبەرژەوەندیی ئێران کەوتەوەو، ستراتیژی بەرگری پەیڕەو کرا.

ئەم خوێندنەوە نوێیەی مامۆستا بەکارێکی شیاو دادەنرێت کەبێگومان پاش ئەو بەرهەمو خوێندنەوانەی تر دێت کەمامۆستا لەم بارەیەوە پێشکەشی کتێبخانەی کوردی کردووەو جێی دەستخۆشییە، بەتایبەت بۆ ئەوەی بتوانرێت روئیاو بیرکردنەوەی نوێ بۆ ئەو رووداوە مێژوویانە دوای قاڵبون، بکرێت.



**دەوڵەتی جمهوری کوردستان**

**نامە دۆکومێنت**

**مەحمود مەلا عززەت**

**سێ بەرگ 1015 لاپەڕە**

**-چاپی یەکەمی بەرگی یەکەم: ستۆکهۆڵم 1992-373 لاپەڕەیە، 239 بەڵگەنامەی تیا بڵاوکراوەتەوە**

**پێشەکیو شەش پاشکۆ و پەراوێزی لەگەڵدایە.**

**-چاپی یەکەمی بەرگی دووەم: ستۆکهۆڵم 1995، 300 لاپەڕەیە –209 بەڵگەنامەی تیابڵاوکراوەتەوە**

پێشەکیو شەش پاشکۆو چوار نەخشەو پەراوێزی لەگەڵدایە.

–چاپی یەکەمی بەرگی سێیەم: ستۆکهۆڵم 1997، 342 لاپەڕەیە– 109 بەڵگەنامەی تیا بڵاوکراوەتەوە. پێشەکیو باسێك لەسەر ئەزمونەکەو دە پاشکۆو پەراوێزو چوار نەخشەی لەگەڵدایە.

بەشێوەیەکی گشتی کاری زانستیو لێتوێژینەوەی وردو دروست پێویستی بەسەرچاوەی ڕەسەن هەیە، لەنێو ئەو سەرچاوانەشدا بەڵگەنامەو دەکۆمێنتەکان دەتوانن شاڕۆڵ ببینن. بێگومان لەکاری بەڕێوەبردنو خۆسازداندا کۆمەڵێك دەستنووسو کەرەستەو پەیڤینی جۆراوجۆر هەبوونو جێ‌ماون... کەدەتوانین بڵێین ناسنامەی ئەو بەڕێوبەرایەتیو ئەزموونە زیاتر لەو دەستنووس بەڵگەنامانەدا بەدیار ئەکەوێ وەك لەچیرۆکێکی گێڕدراوە یا تەنانەت لەبیرەوەرییەکانیش.

کەوابوو بۆ سەلماندنی روداوە گرنگەکانی رابوردو و دڵنیابوون لەبڕیارو کارەکان بەڵگەنامەی مێژوویی رۆڵێکی گەورە ئەبینێ، بەم پێیە بەڵگەنامە مێژوویەکان سەرچاوەی یەکەمین کەدەتوانن راستییە مێژوییەکان پێشچاوبخەن... ئەگەر بەردەوام هەوڵێك هەبووایە بۆ ساغکردنەوەی رووداوەکانی رابردووی گەلەکەمان (ئەمەش ئەوکاتە دەبوو کەکەسانی زمان حاڵو پەیوەست بەو کاروبارانەی ئەو سەردەمە توانیبێتیان بەهێشتنەوەی ئەو نوسراوو بەڵگەنامانە سودێك بەئەمڕۆ بگەیەنن..) ئەوا بەردەوام تەمی گومانو ناراستیەکان دەڕەوێنەوە... وەك چۆن کەسێکی وەك حەمە رەشیدخان بەپاراستنی کۆمەڵێك نامەو دەکومێنتی دەوڵەتی جمهوری کوردستان بووە هەوێنی بەچاپ گەیشتنی سێ‌بەرگ لەبەڵگەنامە تایبەتەکان بەو ئەزمونە.

ئەزمونی دەوڵەتی جمهوری کوردستان بەرێبەری حزبی دیموکراتی کوردستانو فەرماندەیی قازی محەمەد لەگەڵ ئەوەی رووداوێکی فرە دێرین نیە کەچی وەك پێویست لێکۆڵینەوەی مێژویی لەبواری ئابووری و فەرهەنگی و سیاسیو سەربازیو کۆمەلایەتیو یەوە لەمەڕ ئەنجامنەدراوە... بەم پێیە ونبونی رووداوەکانی رابردوی ئێمە لەنێو مێژوویەکی داگیرکراودا کارەساتێکی گەورەیەو مەترسیەکی زۆریشی هەیە بۆ ئایندە... بۆ یەکەمین جار بوو گەلی کورد بەمافی دەوڵەتێکی بچکۆلەی لەو شێوەیە (مەبەست لەدەولەتی جمهوری کوردستانە شادبێو بتوانێ کاروبارەکانی ولاتی خۆی بەڕێوەبەرێ، ئەم کتێبەی مامۆستا مەحمود مەلا عززەت) گرنگیەکی گەورەی هەیە لەوەدا کە رووداوەکان وەك خۆی لەزمانی کەسانی بەشدار لەرووداوەکاندا دەگێڕێتەوە.... لەگەڵ ریزبەندیی زەمەنی بۆی کەلای ئێمە یەکەمین جارە لەوشێوە کارە ئەنجامئەدرێ، بەوەی کەئەو کۆمەڵە بەڵگەنامەیە بەجیا لەچاپبدرێ، جگە لەروونکردنەوەی تایبەت لەسەر هەریەك لەبەڵگەنامەکان کەئەمەش دەلالەت لە سەلیقەییو وردەکاریی مەحمود مەلاعززەت دەکات لەرێکخستنیاندا.

ئاشکرایە حەمە رەشیدخان لەبەرئەوەی خۆی لەسوپادا بووە زۆربەی ئەو بەڵگەنامانە نامەی رەسمی تایبەت بەئالۆوێڵی راوبۆچوونەکانە سەبارەت بەشەڕگەو ژمارەی ناوچەوسودەکانی شەڕ... کەئەمڕۆ بۆ لێکۆڵینەوە لەشەڕو لایەنی سەربازی کۆماری میللی مەهاباد باشتری چاوگەیە..

لەڕووی سیاسیشەوە لەنێوان ئەم نامانەدا چەندین لێکدانەوەو تێڕوانینی سیاسی هەلومەرجی ئەوکاتەی تێدایە کەگرنگیەکی گەورەی هەیە. هەروەك لەڕووی زمانەوانییەوە دەبێتە پیشاندەری

خەت و نوسینی ئەوکاتە... بەمەش دەبێتە چەند دۆکۆمێنتێکی بنچینەیی بۆ لێکۆڵینەوە لەباری زمانی کوردی لەوسەردەمەدا.

لەرووی کۆمەلایەتیشەوە چەندین کێشەی کۆمەلایەتی تیا باسکراوە، بەمەش لێکۆڵەر دەتوانێ لەرووی سۆسیۆلۆژیەوە پشت بەم نامەو دۆکۆمێنتانە ببەستێ. وەك ئاماژەمان پێدا بۆیەکەمین جارە لەمێژووی کورددا کاری لەو شێوەیە بکرێ، بەمەش مامۆستا مەحمود مەلا عززەت دەبێ بەیەکەمین مێژوونووس کەلەگەڵ کاری لێکۆڵینەوەو خوێندنەوەی نوێ و لێتوێژینەوەی تایبەتی سەبارەت بەدەولەتی جمهوری کوردستان بەکاری کۆکردنەوەو ئامادەکردن و چاپکردنی ئەو بەڵگەنامانەش هەستاوە...

ئەگەر بەخێرایی لەگرنگیی ئەم کتێبە وردبینەوە، ئەوا ئەم چەند رووەی دیارو ئاشکرایە:

1-دەبێتە سەرچاوەیەکی سەرەکی و گرنگ بۆ لێکۆڵینەوە وەك لەپێشتر باسمان کرد.

2-پاراستنی ئەو بەڵگەنامانەیە لەفەوتان و لەناوچوون.

3-هاندانی خەڵکی دیکە کەبەم شێوە کارە هەستن و بەڵگەنامەکان بپارێزن و کاری لەم شێوەیە ئەنجامبدەن.

4-لەم ئەزموونەی ئێستادا بەڵگەنامەکان بپارێزرێن و بۆ ئایندە سودیان لێ ببینرێت.

کاك کەریمی دانشیار- نوسەرو چیرۆکنوسی رۆژهەلاتی کوردستان کەنیشتەجێی ولاتی سویدە.. لەبایەخی ئەم کتێبەدا لەنامەیەکدا ئەنوسێ:

**زانای بەرێز، مامۆستا مەحمود**

1995/10/9

بەدڵ شادم کەبەرهەمی رەنجی شەوان و رۆژانی ئێوەی بەرێز بەچاوان دەبینم و شادو خۆشحاڵتریشم کەدەزانم ئەم بەرهەمە نایاب و بەنرخەتان لەکتێبخانەی گەلی بێ ئەرشیفی کوردا جێگەی تایبەتی دەگرێ. ئێوەی بەرێز ئەم ئەرکە گرنگەتان نەگرتبایە ئەستۆو ئەم رچەیەتان نەشکاندبایە، بێشك ئەم بەشەی مێژووی نەتەوەکەمان هەروا لەتاریکایی ئەنگوستە چاودا دەمایەوەو چاوی دوژمنانمان بەبێ مێژوویمان گەشدەبۆوە، بەلام چالاکی و گیانی ماندونەناستان ئەم هومێدەی دوژمنانمانی پوکاندەوە، دەستەکانت خۆش و سەرت سلامەت.. کوردستان بەبونی رۆڵەیەکی وەك جەنابتان بێکەس نیەو کورد بە بونتان شانازی دەکات.))

مامۆستامەحمود مەلاعززەت لەپێشەکی بەرگەکانی ئەم کتێبەدا لەسەر دووخاڵی گرنگ راوەستاوە:

1-ئەوەی تایبەت بێت بەدەولەتی جمهوری کوردستان:

ا-کۆکردنەوەی هەموو بەڵگەنامەو دەستنووس و بلاوکراوەکانی ئەو سەردەمە.

ب-کۆکردنەوەی هەموو ئەو بەڵگەنامەو دەستنووس و بلاوکراوەو نامەو رسوماتەی کە ئەوکاتە کاری پێکراوە.

ج-کۆکردنەوەی بیرەوەریی کەسانی زیندووی ئەوسەردەمە.

د-کۆکردنەوەی راگەیاندنەکانی ریئاسەتی کۆمارو گفتوگۆی رۆژنامەنووسی لێپرسراوانی کۆمارو رێکەوتننامەکان. هەروەها وێنەو پسولەی رەسمی و... کۆبکرێتەوەو سەر لەنوێ بەچاپ بگەیەنرێن.

2-ئەوەی تایبەتە بەدەسەلات، دروستکردن و گەشەپێدانی ناوەندێکی ئەرشیفییە لەکوردستاندا کەئەبێتە مایەی ناساندن و گەشەپێدانی مێژوو سەرچاوەیەکی زۆر رەسەنە بۆ بەزانستیکردنی ئەو رووداوانەی رابردوو، جێی خۆیەتی ئاماژەش بەوە بدەین کەمامۆستا پسپۆرە لەبواری ئەرشیف و نوسخەی یەکەمی ئەو بەڵگەنامانەی لەولاتی سوید پاراستووەو چاوەروانە لەهەلێکی ئارام و لەبارو رەخساودا بیانهێنێتەوە بۆ کوردستانی فدراڵ و بیکاتە بەشێك لەئەرشیفی نەتەوەیی حکومەتی کوردی.

**جولانەوەی رزگاریخوازانەی کورد-لە خەباتیدا بۆ سەربەخۆیی نەتەوایەتی و سیاسی**

**نوسینی: پرۆفیسۆر رادۆڤان پاڤیچ**

**وەرگێرانی: مەحمود مەلا عززەت**

**چاپی یەکەم: سوید حوزەیرانی 1985**

**چاپی دووەم: مارتی 1986**

**کوردستان/ 72 لاپەرە**

چارەنەکردنی ئەو گرفت و کێشانەی هەرەمی شۆرش و جولانەوەی رزگاریخوازانەی کورد پێوەی دەنالێ بوەتە هۆی دوپاتکردنەوەی ستراتیژ و پرۆگرامی هەلە پاشان پەیرەوکردنی دووخاڵی نێو بازنەی زەمەنی "شۆرشکردن - هەرەسهێنان".

لە روانگەیەکی دیکەوە نەبونی:

ا-مێژوویەکی دروست کە بتوانێ هەموو خاڵە لاوازەکان دیاری بکا و بەهەڵەکان بڵێ هەڵە و دوور بێ لە هەستی سۆز بەرامبەر سەرکردە و شۆرشگێران.

ب-رەخنەگرتن لە بەرنامەو ستراتیژ و بریارەکانی سەرکردایەتی جولانەوەی کوردی لە رووی هەڵسوکەوتی لەناوخۆداو پەیوەندییەکانی دەرەوە و گفتوگۆ ئاگر بەس و بریاری شەر.. بوەتە هۆی وەستان و نەگۆری لەو جولانەوەیەدا هەر بۆیە نوسینەوەی مێژوو کارێکی زۆر گرنگە، ئەمین زەکی بەگ پێی وایە سێ جۆر مێژوونوس هەیە کە سەبارەت بەرۆژهەلات نوسیویانە "مەبەست لێی رەگەز و میللەتانی رۆژهەلاتە":

1-هیچ مەبەستێکیان نەبوە تەنها ئەوە نەبێ کە پێیان بوترێ مێژوونوس.

2-بە پێی میتۆدێکی دیاریکراو، لە شوێنی خۆیەوە باسەکانی نوسیوە واتە ئەگەر بیەوێت لەسەر کورد بنوسێ دەڵێ: (کوردە شاخاویەکان).

3-زانا پایە بەرزەکان کە باسەکانیان بە ڕێگەی زانستی ڕاستدا دەڕوا.

لەگەڵ ئەمەدا بەشێکی زۆر لەو ژێرخانە مێژووییەی کە لەمەڕ کورد و جوڵانەوە ڕزگاریخوازیەکەی نوسراوە هی ڕۆژهەلاتناس و پەیامنێرە بیانییەکانە..

ئەم کتێبە مێژوونوسی یوگسلاڤی - پرۆفیسۆر ڕادۆڤان پاڤیچ دوای ڕێکەوتنی 11ی ئازاری 1970 بەموحازەرەیەک خوێندوویەتییەوە و لە ساڵی 1972 لە Politicka Misao واتە رای سیاسیدا بەشی یەك و دوو سییێی بڵاوکراوەتەوە.. دەقە ئەسڵیەکەی یوگوسلاڤییە و وەرگێردراوەتە سەر زمانی عەرەبی و لە شوباتی 1987دا لە ژێر ناوی "کوردستان و المسالە الکردیە"دا بڵاوی کردۆتەوە.. لەبەر گرنگیی ئەم باسە لەلایەن مامۆستا مەحمود مەلا عزەتەوە وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی.. باسەکانی نێو ئەم نامیلکەیە لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەلە سەبارەت بە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی کە پشتی بەستووە بە ئەزموونەکانی شۆڕشی کوردو تیایدا لە مەڕ ئەسڵی ڕەگەزی‌و دابەشکارییەکانی نیشتمانەکەی و ڕۆڵی جیۆپۆلەتیك و سنوور و جێگەی جیوستراتیژی کوردستان و باری کۆمەڵایەتی و چۆنێتیی گەشەکردنی، لەگەڵ جوڵانەوە ڕزگاریخوازانەکەیدا.. دەدوێ..

"پاڤیچ لەم نامیلکەیەدا هەموو ئەو هۆو فاکتەرە یارمەتیدەرە سروشتکردانەی دەستنیشانکردووە کە هەلومەرج و زەمینەی لە بارن بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆو یەکگرتووی کوردستان. نەتەوەی کورد خۆشی لە مێژەوە، هەر لە سەردەمی میرنشینەکانەوە.. ئینجا ڕونتر و لەبارتر، لەو کاتانەوە کە هەستی نەتەوایەتی و گیانی نیشتمانپەروەری جوڵاوە.. بەتایبەتی لە کۆتایی سەدەی رابردووەوە تا ساڵەکانی نێوان هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی، خولیای ئەو ئامانج و هیوایە بووە. دوای ئەوەش ڕێکخراوو پارتی و هێزە سیاسییە کوردستانیەکان، لە خواست و ئامانج و سەرچاوە و بیری بەشە کۆمەڵایەتیە جلەو بە دەستەکەی سەر شانۆی سیاسی و بارودۆخی نوێی کۆمەڵ، و هەندێ جاریش هێزە سیاسیە ناسراوە عێراقیەکانیش، لە مەبەست و بیر و سەرچاوەی جیاجیاوە، بەڵام لە ناوەڕۆك و سەرئەنجامدا، هاوبەش و هاوبەرژەوەند.. دروشم و ئامانجی خودموختاری و ئۆتۆنۆمی و ماف ڕۆشنبیرییان بەرزکردۆتەوە".

وەرگێری زمانی کوردی بەم پەرەگرافە پێشەکی چاپە کوردییەکەی دەستپێکردووەو هەر لەوێدا لەمەڕ ڕەوتی گەشەکردن و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و ئابوری دەدوێ..

ئەو ململانێ گەورەیەی دوابەدوای دابەشکردنی کوردستان لەلایەن کۆنیالیزمی نێو دەوڵەتییەوە لەناوچەکەدا هاتەکایەوە، بووە هەوێنی بەرپابونی شۆڕشی ڕزگاریخوازی و ئازادیخوازی نەتەوەیی کورد کە توانی ناسنامەی کوردی لەفەوتان بپارێزێ. ئارادەیەکیش جوڵانەوەکەی گەشەپێبدا.. وەرگێڕ لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە ئەم باسەی وروژاندووە، تا ئەگاتە ئەو رادەیەی کە بڵێ "دروشم و ئامانجی خودموختاری و ئۆتۆنۆمی‌و ماف ڕۆشنبیرییان بەرزکردۆتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا سەربەخۆیی کوردستان هەمیشە ئامانجی سەرەکی گەل و خواستی زۆربەی زۆری جەماوەر بووە کە بەدیهێنانیان هەنگاو هەڵهێنانە بەرەو پێشەوەو ڕووەو ئامانجە ستراتیژییەکە، جگە لە بەناچاری قایلبون و نەبونی جێگرێکی تری باشتر لەوە.. ل 8" وەرگێری زمانی کوردی لە زۆر جێگەدا گەڕاوەتەوە لای ئەو کەسانەی زمانە ئەسڵیەکە دەزانن و بۆ ساغکردنەوەی‌و، دەقە ئەسڵییەکەی کردۆتەوە بە سەرچاوە.

"پاڤیچ" زۆر بە وردی خوێندنەوەیەك بۆ کوردی عێراق پێشکەشدەکات دوای کۆماری مەهاباد وە دوو هەنگاوی جوڵانەوەی کوردی بەهەند وەردەگرێ کە لە دوای روخانی ڕژێمی پاشایەتی ناویەتی، ئەوانیش:

1-ڕێکەوتن لەسەر بەرنامەی حکومەتی ناوەندی بڵاوکراوە لەساڵی 1966 کە بریتی بوو لە 12 خاڵ تیایدا حکومەتی عێراقی دانی بە بونی کورد و بەشێك لە مافەکانیا نا لە سنوری یەکێتی عێراقدا.

2-لەو گرنگتر ساڵی 1970 و ڕێکەوتنی (کورد - عێراق) بوو کە لەو ساڵەدا حکومەتی بەعس رایگەیاند کێشەی کورد چارەسەرکرا، بەرامبەر بەوەش شۆڕشی کورد پەسەندی کرد. بەم ڕێکەوتنە دان نرا بە ماف کورددا لە بەڕێوەبردنی کاروباری خۆی و خوێندن بە زمانی کوردی و بەشداریکردن لە ئەنجومەنی یاسادانان و جێبەجێکردن‌و بریاریش درا کە جێگری سەرۆك کۆمار کورد دەبێ..

پاڤیچ دوای دەستنیشانکردنی کۆمەڵێك فاکتەر بە شێوەیەکی زانستی، چەند پرسیارێك جێ دەهێڵێ کە باسیان لێوە نەکرابوو، بەڵام زەمەن لە دوایدا وەڵامی پڕ بە پێستی دایەوە.. "پاڤیچ" دەڵێ: "لەگەڵ ئەوانەشدا زۆر مەسەلە هەیە تا ئێستا روون نین، بۆ نمونە وەرگرتنی بەشی نەوت بە پێی ژمارەی دانیشتوان چۆن ئەبێت؟ ئایا لەشکرەکەی بارزانی چی لێدێ؟.. هتد. ئاشکراشە کە بەدیهێنانی هاوسانی تەواو، ئارامییەکی هەمیشەیی پێویستیان بە کۆششی گەورەو وەختێکی زۆر هەیە.. ل52"

لە کۆتایی سەدەی بیستدا جوڵانەوەکانی کورد گەر بوبێتنە خاوەنی ناوچەیەکی ڕزگارکراو ئەوا ناوچە نەوتییەکانی تیادا نەبووە، تەنانەت داگیرکەران ناوچە نەوتییەکان بە خاکی کوردستان لە قەڵەم نادەن و بەردەوام لە هەوڵی ڕاگواستنی خەڵکەکەیدان. هەر بۆیە ئارامی تەواوو چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەوێوە دێتەدی

کە رژێمە داگیرکەرەکان رازی بن بەرێزگرتن لە ماف و خواستەکانی مرۆڤ و دیموکراتی کردنی ولآت و سەلماندنی مافی چارەنوسی گەلی کورد.

ئەم وەرگێردراوە، کارێکی پڕ لەزانیاری گرنگەو جێی بایەخە، بەتایبەت لەو کاتەدا کەکوردییەکەی بەچاپگەیشت، گەلێ زانیاریی نوێی خستە سەر خەرمانی بزوتنەوەی کوردایەتی، کەبەر لەهەموو شتێ پێویستی بەمەتریالی زۆر هەبوو.

لەرێکخستنەکانی کۆمەڵەدا لەناو شارداو پاش بلآوبونەوەی، ئەم کتێبە زۆر بەبایەخەوە دەخوێندرایەوەو کرابووە یەکێك لەجەمسەرەکانی گفتوگۆکردن.

**کورتەی مێژووی فەلسەفە**

**دانانی: کۆمەڵێ لە مامۆستایانی سۆڤیەت**

**کۆرینی بۆ کوردی: مەحمود مەلا عززەت**

**بەرگی یەکەم – چاپی یەکەم 1998 سوید**

**368 لاپەرە**

فەلسەفە بۆ خۆی تێگەیشتن و تێروانینی مرۆڤە لە ژیان.. و. بونی مێژووی فەلسەفیش بەڵگەی بونی خوێندنەوەو و موتالآی خەڵکییە بۆ ژیان.. "کورد فەلسەفەی هەیە یان نییەتی؟" ئەمە پرسیارێکە و لەسەر وەلآمدانەوەی ناکۆکین.. بەشێك پێیان وایە ئەدەبیاتی کلاسیکی کورد هەڵگری مانا فەلسەفییەکانن و بەشێکی دیکە دیوارێك لە نێوانیاندا دروست ئەکەن..

بە مانایەکی دیکە زۆر کەس لایان وایە کە دەقە شیعرییەکانی "ئەحمەدی خانی و مەلای جزیری و عەلی حەریری و نالی و. سالم و.. دەتوانرێ بکرێن بە سەرەتای تێروانینی روناکبیریی کوردی کە لەمەشەوە سەرەتای فەلسەفەی کوردی رێچکە دەبەستێ، هەندێکی دیکە، کتێبی پیرۆزی ئاینزایی و تەریقەکانی کۆمەڵگای کوردەواری بە فەلسەفە لە قەڵەم ئەدەن، هەندێکی دیکە پەندو وتە بەنرخەکان دێننە پێش چاوو بەبەراورد لەگەڵ گوتەی بیریار و فەیلەسووفەکانی دنیا، بونی فەلسەفەی کوردی دێننە ئاراوە..

د. حوسێنی خەلیقی لە کتێبەکەیدا "کۆمەڵناسی کوردەواری" چەند نمونەیەکی لەو شێوەیەی هێناوەتەوە.. ئەوانەی دیکەش بونی فەلسەفەی کوردی رەتدەکەنەوەو، پێیان وایە کە ئەڵمانی و یۆنانی و ئینگلیز و فەرەنساییەکان تەنانەت عەرەبیش:

1–پەند و وتە بەنرخەکانی خۆیان کردوّتە بەشێکی جودا لە کلتوری دێرینی خۆیان و ژێرخانێکی سەربەخۆیە لە ئەدەبیاتی پێشینەیان.

2–بە شاعیری دێرینی خۆیان دەڵێن شاعیر و بە دەقەکانیشیان تەنها دەڵێن (شیعر).

بەشێوەیەکی گشتی گرنگیی زانینی رێبازە فیکری و تێروانینە فەلسەفییەکان لەوەدایە کە فێرمان دەکا واقیعییانە و دوای خوێندنەوەی مێژوو و لایەنە پەیوەستەکان بە مەسەلەیەکەوە هەڵسەنگاندن بەئەنجامو بڕیاری لەسەر بدەین و بۆ سەرکەوتن لە پرۆژەیەکی بنیادناندا هەم ئامادەیی هەبێ و هەم رەخنەگرتن.. هەر لەمەوە کاری هەڵسەنگاندن لە هزری کوردیدا بۆتە کێشە.

یەکێکی تر لەخاڵە لاوازەکانی شۆرشی کورد و بزوتنەوە رزگاریخوازەکەی ئەوە بووە کە بڕیار و کارەکانی وەك بەشێکی زۆر لە پرۆگرامەکەی هەڵقوڵاوی نێو ئەو بیرە فیکری و سیاسیە نییە کە بەهۆکاری گەیشتن بە ئامانجەکانی دادەنێ.. نمونەی ئەو هەڵانەی کە فیکرە سیاسی و ئایدۆلۆژییەکان بە درێژایی نیوسەدە لە کوردستاندا کردویانە لە ئەنجامی تێنەگەیشتن و قبوڵنەکردنی رەخنە و ئەنجامنەدانی کاری هەڵسەنگاندنەوە بووە.. وەرگێر لە پێشەکییەکەیدا بە درێژی باس لەم کێشەیە دەکا و بە وردی شەن و کەوی رووداوەکانی نیوەی دووەمی سەدەی بیستی کردووە.

لەگەڵ ململانێی ئەو دوو رایەی لەسەرەوە باسمانکرد. ناسینی فەلسەفەی دەرەوە و کارکردن بۆ وەرگێرانی کاری فەیلەسووفەکان لەلایەن خەڵکی ئێمەوە زۆر خواستراو بووە بەلآم تا ئەمڕۆ کتێبخانەی کوردی بە کێشەی کەمی سەرچاوەی لەو بارەیەوە ئەناڵێنێ.

زۆر درەنگ و بەکورتی ماتریالیزمی مێژوویی و ماتریالیزمی دیالەکتیك و قۆناغەکانی گۆرانی کۆمەڵ و مانیفێستی حزبی کۆمۆنیست بە زمانی کوردی بە چاپ گەیەندران، نزیکەی 50 ساڵ دوای مردنی لینین "لینینی مەزن و کورتەی ژیانی لینین"مان بە زمانی کوردی پێش چاو کەوت.. تا ئەمرۆش نەتوانرا بەرگەکانی سەرمایەی مارکس و بەرهەمەکانی ئەنجلز بکرێنە کوردی.. لە کاتێکدا زۆربەی روناکبیرانی ئێمە قوتابخانەی مارکسیزم بەمەرجەع دادەنێن.

ئەوەی لەسەر فەلسەفەی یۆنانی کراوە بە کوردی لە کتێبخانەی کوردیدا لە ژمارەی پەنجەکانی دەست تێپەرناکەن.. ئەوەی لەمەر فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی لەدروستبونی قوتابخانەی هیگڵیو هەڵوەشاندنەوەی و فەلسەفەی فێورباخ و.. بە دانسقە چەند سەرچاوەیەکت ئەگەر دەست بکەوێ..

هەر بۆیە تەنها وەرگێرانی ئەو پەرتوکانە بۆ ناساندنەوەی ئەدەبیاتی میللەتان گرنگییەکی زۆری هەیە. ئەم کتێبەی مەحمود مەلاعززەت بە کورتکراوەیی بەرگێکی بەکوردی لێ بەچاپگەیاندووە، هەوڵێکی نوێیە و سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردییە. دەقە عەرەبییەکەی سێ بەرگە و 21 بەشی لەخۆگرتووە.

ئەگەر لەزمانی وەرگێرانەکە بدوێین، ئەوا دەکرێ بڵێین کەزمانێکی سادەو پێکەوەبەستراوی بەکارهێناوە لەپێشکەشکردنی مێژوو لێکدانەوەی ئەو تەرحە فکرییانەدا کەئەنجامدراون.

بەداخەوە بەشی دووەمی ئەم کتێبە وەك پێویست نەتوانرا لەکاتی خۆیدا ئامادەی وەرگێڕان بێت، چونکە وەك مامۆستا خۆی ئاماژەی پێداوە هەندێکی ئامادەکراوە، بەڵام کاری تر ڕێگەی تەواوبوونی نەداوە لەکاتی خۆیدا.

بەندە ئەوەندەی ئەم کارەم پێ جێی دەستخۆشییە، ئەوەندەو زیاتریش پێشەکیی ئەم کتێبەم لا پەسەندە چەند جار بیبینمەوە حەز بەخوێندنەوەی سەرلەنوێی دەکەمەوە.

**دەروێشەکان بە دوای ڕاستیدا ئەگەڕێن**

**نوسینی: مستەفا حەللاج**

**شانۆگەری**

**وەرگێڕانی بۆ کوردی: مەحمود مەلا عززەت**

**چاپخانەی شەهید جەمال تاهیر – سوید**

**1983 – چاپی یەکەم "157" لاپەڕە**

لە نیوەی دووەمی ئەم سەدەیەوە کۆمەڵێك دیکتاتۆر دەسەڵاتی وڵاتانیان گرتبووە دەست، لەئاسیاو ئەمریکای لاتین و بەتایبەت لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست.. شۆڕشی ڕزگاریخوازی کرێکاران و جوتیاران بەشێوەیەك کەوتبووە جوڵە، کەقەڵای دیکتاتۆریی هەراسانکردبوو.

لەناوەڕاستی حەفتاکاندا لەکوردستان شۆڕشی ئەیلول هەرەسی هێنا، ئەمە وایکردبوو کەهەڵێکی گەورە بۆ ڕژێمی داگیرکەر بێتەکایەوە تابتوانێ بەیەکجارەکی، کورد لە نیشتمانی خۆیدا قەتلوعام بکا. وتەی ئەو کاتەی صەدام حسێن: ئەگەر دارخورمایەك لەو شاخانە بڕوێن ئەوجا کورد دەبێتەوە بە خاوەنی شۆڕش". تەنها بۆ رووکەش بوو، ئەگینا هەر دوابەدوای خامۆشکردنەوەی شۆڕشی ئەیلول، بزوتنەوەی کوردایەتی بە شێوازێکی نوێ هاتەوە مەیدان، ئەمجارە شۆڕش لەناو هەناوی خەڵکیدا بەچەوساوەو جوتیارو کرێکاریەوە بە میتۆدێکی تازەتر هاتە کایەوە.. شۆڕشگێڕی کوردی قۆناغێکی دیکەی بڕی، ئەو کاتە حەماسەتی تێزەکانی گیڤاراو شۆڕشی بەردەوام تا روخانی دوژمنان و بەدیهێنانی ئازادی خێراخێرا تێکەڵاوی واقیعی کوردی دەبون و دەگونجان.

خەباتی چەکداریی شۆڕشگێڕان بووە زنجیرە مقاوەمەتێکی پۆڵاین دژ بە دوژمنان، رۆڵەی کورد هێندە بە شانازییەوە دەچووە بەردەم پەتی سێدارە وەك ئەوەی ئەرکێکی سەرشانی بێ و بەجێی بهێنێ، مەگەر تەنها لە چیرۆکە خەیاڵییەکاندا هاتبێ.

زۆر لە شاعیران شیعری خۆیان کردە خەنجەر و دەروونی دوژمنانیان پێ دەدڕی، زۆر لە چیرۆك نوسان ئەو حەقیقەتانەیان پێش چاو دەخست و بە نەمری دەیانهێشتەوە کە دوژمنان لێی دەتۆقان.

شان بەشانی ئەمان شانۆ و تارو لێکۆڵینەوەکان بوژانەوەو ئامێزی خۆیان خستە سەر پشت بۆ پیشاندانەوەی زوڵم و زۆرداری دوژمن لەلایەك و مقاوەمەت و بەرگری شۆڕشگێڕان لەلایەکی دیکە.

نابێ ئەوەشمان لەیادچێت کە ئەدەبی بەرگری بووە هۆی پەروەردەکردنی نەسڵێك و جۆشدانیان بە بیرو باوەڕی شۆڕشگێڕانەو پتەو تابتوانن بەرگەی نەهامەتی و جەورو ستەمی رۆژگاری ژێر دەسەڵاتی داگیرکەران بگرن.

ئەم کارە وەرگێڕدراوەی مامۆستا مەحمود مەلا عززەت لەگەڵ ئەوەی دەوڵەمەندکردنی ئەدەبیاتە بە دەقێکی شانۆی وەرگێڕدراو، پیشاندانی جەور و ستەمی زۆرداریشە بەرامبەر بە (دەروێش) وەرگێڕ لەبەرئەوەی خۆی راستەوخۆ لە نێو کارەساتی زیندانی کردندا بووەو خاوەنی تاقیکردنەوەیەکی دووروودرێژی (205) رۆژی ناو زیندانەکانی (هەیئەی خاصەی کەرکوك) بووە، وێنەی ئەم شانۆگەریەی رۆژانە هاتۆتە پێش چاو.. هەر توندوتیژیو زوڵم و زۆرداریی فاشستەکانیش بونە هاندەر بۆ وەرگێڕانی ئەم دەقەو بڵاوکردنەوەی لە ماوەیەکی کورتدا.

شایەنی باسیشە ئەم شانۆگەرییە یەکەم خەڵاتی ئەو پێشبڕکێیەی ئەنجومەنی بەرزی سەرپەرشتی هونەر و وێژە و زانیارییەکانی کۆمەڵایەتی وەرگرتووە کە لە ساڵی 1972دا بۆ شانۆگەریی درێژ ئەنجامدرا.

لەرووی ناوەرۆکەوە، دەروێشەکان بە دوای راستیدا ئەگەڕێن چیرۆکی دەروێشێکە لە زینداندا دەیەوێت حاکم تێبگەیەنێ کە بە زوڵمی لێکۆڵەرەکانی بووەتە تاوانبار، تاوانی ئەو، تەنها بێ تاوانییە.. کە لە دوایدا بە کوشتن سزای ئەدەن. دەروێش "رووبەڕوی حاکم دەڵێ: گەورەم هەموو شتێك ئەو دوانە (مەبەستی دوو لێکۆڵەرەکەیەتی) ئەیکەن تەنها ئەو دوانە بەرپرسیارن لە هەموو شتێك. ئاخر من چیم هەبوو بەسەر راستییەوە؟ من هەر هەقم بەسەر هیچەوە نەبووە.. ئەم دوانە بونە هۆ.. هەردووکیان بونە هۆی ئەو نەفرەتەی لە خوێنما گڕی گرت و وایان لێکردم وێڵی راستی بم.. بە دوایا بگەڕێم.. گەورەم راستی لە دەرەوەی ئەو مەلەفەدایە (مەبەستی ئەو مەلەفەیە کە دوو لێکۆڵەرەکەی ئامادەیان کردووە) ل 141.

بەڵام حاکم هیچ لەو گوتانەی دەروێش تێ ناگا و تەنها لە مەلەفەکەی بەردەمی دەڕوانێ کە لەلایەن دوو لێکۆڵەرەکەیەوە ئامادەکراوە.

دەروێش پێی وایە بە سزادانی ئەم، راستی وندەبێ لە دنیادا، و جیهان لە بەردەم مەترسییەکی گەورەیدایە.. لە کۆتایی گفتوگۆکەیدا لەگەڵ حاکم، ئازایەتیەکی ئەوتۆ باڵ ئەکێشێ بەسەر دەروێشدا کە هەروەکو شێتی لێ دێ لەسەر قسەکانی بەردەوام ئەبێ: "ئا ئەو دووانە من... ئەوان دەروێشکیان ئەویست ئیتر ئەوە ناوێکەو هەزاران دەروێش ناو هەیە... ومنیش بۆ نەگبەتی

ناوم دەروێشە... یەکێکیان پیلانگێڕێکی ترسناکەو... یەکێکی تریان سادەو ساکارەو ئاگای لەهیچ نییە... گومانیش تەنها لەناوەکەدایە، هەر تەنها ناوەکەو هیچی تر... ئیتر گومان گەورە کرا... گەورەکرا... گەورەکرا... تا سەرانسەری زەمین و هەموو خەڵکی گرتەوەو لەدوایشدا کاسەکەیان لەسەری منا شکاند... کردمیان بەدەروێشێکی ترو ئیتر هەردوو لێکۆڵەرەکە مەسەلەکەیان داخست. فایلەکەیان پێ پڕکردمەوەو تاوانباریان کردم... ئیتر لەوکاتەوە گەورەم حاکم... خەم دەستی پێکرد... گەڕان بەدوای راستیدا دەستی پێکرد... باشە گەورەم ئەگەر من خۆم لەشتێکەوە کردبێ بەشتێکی‌تر... ئەی چی وا لەشتەکانی دەوروپشتم ئەکات کەهەروەکو خۆیان بمێننەوە؟ راستی بوو بەخەیاڵ و خەیاڵیش بوو بەراستی... ئەوەی نەبوو هێنرایە ئاراوە... و نەبوو بوو بەبوون... ئیتر لەو رۆژەوە گەورەم دۆو دۆشاو تێکەڵ کران و هەمووشتێك ئاوەژووکرا... سادەیی بوو بەورایی... بێ هۆشی بەزیرەکی... ئاقڵی بەشێتێتی و هێمنیش بەئاژاوە... شتەکان هەموو جێ گۆڕکێیان پێ کرا... ڕاستی لەگەڵ درۆ، چاکە لەگەڵ خراپە، تاوان لەگەڵ بێ تاوان... بووم بەپیاوێك دوونا و دوومال و دووژن و دوونیش و دووجیهانی هەبێ.

یەکەمیان لێپرسراو ئەوی تریان فڕی بەسەر لێپرسراوییەوە نییە... بێ تاوان و تاوانبار، شاکارو فێلباز. ئاشتی خوازو ئاژاوەچی. بازرگان و ماموستا، دە گەورەم خۆت پێم بڵێ لەناو ئەو گێژاوەدا ئەم توانی چی بکەم؟ توخوا بێ دەسەڵاتێکی وەکو من ئەی توانی چی بکات؟ خۆ نەم ئەتوانی خۆم دەرباز بکەم، ئەیٌ شێت بم شێت؟ ل 143"

–بەڵام حاکم هیچ لەم تاوانە گەورەیە ناگاو بڕیاری خۆی ئەدا...

مستەفا حەللاج نووسەری ئەم شانۆگەرییە زۆر وردبینانە ئەو دیمەنانەی وێنەکردوە... هەروەك گەورەیی وەرگێڕراوە کوردییەکەی بۆ سەلیقەی ماموستا مەحمود مەلاعززەت دەگەڕێتەوە کەتوانیوێتی ماناو چێژی وێنەکان وەك خۆی بهێڵێتەوە.

وەرگێر لەدوتوێی 13 لاپەڕەی یەکەمی ئەم کتێبەدا لەمەڕ ئازدی و خەبات و زۆرداری فاشیزم و زیندانەکانیان دەدوێ... باسی خەباتی گەلی کوردو پەیوەستی و لێکچوونی رووداوەکانی ناو ئەم شانۆگەریەو بارودۆخی کوردستان دەکات... بەگشتی سەرکەوتویی ئەم کارە لەوەدایە کەهەردوولا (نووسەرو وەرگێڕ) لەنێو زینداندا دیمەنی لەو شێوەیەو بگرە زۆر ئاڵۆزو ناهەموارتریشیان بینیوە... بەمەش توانراوە ئەو رووداوانە وەك خۆیان دابڕێژرێنەوە.

خاڵێکی دیکەش پێویستە ئاماژەی پێ بدرێ ئەوەیە کەچاپی یەکەمی دەقی وەرگێڕدراوە کوردیەکەی بەدەست و خەت نووسراوەتەوە و لەلایەن خودی وەرگێڕەوەپێشەکییەکی شایستەی بۆ نووسیوە، بەڵام چاپی دووەمی کتێبەکە لەلایەن خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی سەربەوەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەنجام دراوە.



**دیبلۆماسێتیی بزوتنەوەی کوردایەتی**
**ساڵ: 1973 چاپخانەی راپەڕین/ سلێمانی**
**لەبڵاوکراوەکانی یەکێتی ماموستایانی کوردستان/ لقی سلێمانی**

دوابەدوای کتێبی(کوردایەتی) لەنوسینی مام جەلال کە سەرەتایەکی نوسراو بو بۆ بیری کوردایەتی، ئەم پرۆژەیەی ماموستا مەحمود مەلا عززەت دێت کە لێی دەدوێین.

ئەگەر چی ئەمە پێشەکی و سەرەتا بو بۆ کارێکی گەورەتر لەسەر دیبلۆماسێتی بزوتنەوەی کوردایەتی بەڵام هەر خۆی کارێکی گرنگە. لەبەرئەوەی هەر بەتەنها قسەکردن لەلایەنی دیبلۆماسی لەخەباتی کوردیدا بابەتێکی نوێیەو دەهێنێ زۆر لایەنی پێوە بخرێتە ژێر باس و لێکۆڵینەوە.

ماموستا لەکاتی خۆیدا کتێبەکەی بۆ پێنج بەشی سەرەکی پۆلێن کردبوو بەشی یەکەم سەرنجێکی خێرا لەمێژووی کۆن و نوێی گەلی کورد، بەشی دووەم باس لەدیبلۆماسێتی بزوتنەوەی کوردایەتی دەکات لەسەردەمی میرنشینەکانی ئەردەڵان، بابان، سۆران و پاش ئەوانیش.

لەبەشی سێیەمدا دێتە سەرباسی شۆڕشە نیشتمانی و نەتەوەییەکان، لەوانە لەشۆڕشەکانی بەدرخان، شەمزینان، دەدوێت.

بەشی چوارەمیش تەرخانە بۆ شۆڕشەکانی کوردستانی عیراق بەسەرکردایەتی شێخ مەحمودو دیبلۆماسیەتی ئەو سەرکردەیە. دوا بەشیش کە بەشی پێنجەمە تەرخانە بۆ قسەکردن لەسەر پرسیارێکی گرنگ، ئەویش بۆچی نەتەوەی کورد ئامانجە سەرەکیەکەی بەدی نەهێنا؟.

ئەم کتێبە بەتێکڕا بابەتێکی هۆشیاری کۆمەڵایەتی پێك دەهێنێ، لەبەرئەوەی لێدوانێکی گشتی‌یە لەدۆخی کوردەواری و شیکردنەوەی قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆمەڵی کوردی، هەروەك باسکردنە لەژیانی کۆمەڵایەتی لەچێوەی نیمچە دەرەبەگیدا پاش ئەمەش و هەر لەم نامیلکەیەدا سەبارەت بەچین و بەشەکانی کۆمەڵی کوردەواری و شیکردنەوەی پەیوەندی و بایەخیان رونکردنەوە پێشکەش کراوە.

پاشان بەراوردکردنی ئەم بابەتانە لەگەڵ ئەو سودو بایەخانەی بویانە بۆ شۆڕش و گەشەپێدانی، یاخود بەپێچەوانەوە بۆ زیان خستنەوەو پەك خستنی.

بەگشتی لێدوان لەم بارەیەوە، باسێکی نوێیە، ئەگەر چی بزوتنەوەی کوردایەتی کە بەرهەمی خەباتی کوردەواری بووە لەسەرەتای دەست پێکردنیەوە تا ئەمڕۆ سودو قازانجەکانی نەنرخاندووە. مامۆستا لەم نامیلکە کورتەدا کەپتر لەچارەکە سەدەیەك بەسەر دەرچونیدا تێپەڕیوە هێڵەکانی ئەو بزوتنەوەیەی کێشاوەو بەبایەخەوە سەیری کردووە. وەك خۆی لەلاپەڕە(16)دا دەنوسێت:(ئەم هەنگاوە، ئەو لێکۆڵینەوەیە سەرنجێکی نوێیە لەگۆشەیەکی نوێی خەباتی نەتەوەی کورد کە بۆ یەکەم جارە تیشك ئاراستەی چەند مەسەلەیەکی گرنگو نیمچە شارراوە بکرێ.

ئەم هەنگاوە جگە لەوەی خزمەتی مێژوو سامانی مێژویی نەتەوەی کورد ئەکات، لەوەش بایەخ دار تر ئەوەیە کە ئەتوانرێ لەبەر رۆشنایی راستیە هەڵهێنجراوەکانی مێژوی زانستیانەی نەتەوەکەمان سەرنج لێ بدرێ، کەبەوەش راستیو چەوتیو هەڵەی راپەڕینو شۆڕشەکان روون تر دەست نیشان ئەکرێنو ئەبنە چرای رۆشنکەرەوەو رێگا نیشاندەری جەماوەر بۆ خەباتو بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجو ئاواتانەی لەمێژەوە فیداکارییان بۆ ئەکرێتو هەزاران قوربانیان بۆ پێشکەش کراوە. هەر بەو جۆرەش لایە چەوتو نادروستەکان دەست نیشان ئەکرێنو ئەبنە پەندو تاقی کردنەوەی زیندو بۆ خۆلادان لێیان دووپات نەکردنەوەو پیا نەچونەوەیان.

ئەم کورتە لێکۆڵینەوەیە هەوڵ دانێکە بۆ ئاراستەکردنی چەند تیشکێك بۆ ئەو رێگەیە.

ئەمە سنوری ئەو بابەتەیە کە مامۆستا لەم نامیلکەیەدا روونی کردۆتەوە.

لەلایەکی تر باری کۆمەڵایەتی لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەبەردی بناغەی کارەکە دانراوە، هەر بۆیە لەگەڵ ئەو یاسایەدا بابەتەکەی ئاراستە کردووە کەرادەو خەملینی هۆشیاریی کۆمەڵایەتی پابەندە بەرادەو خەملینی هۆشیاری سیاسی دەستەو تاقمەکانەوە بەدرێژایی مێژوو، هەر کاتێکیش بیری کۆمەڵایەتی گەشەی کردبێو پێکهاتەکەی گۆڕا بێ، ئەوا بیری سیاسیش رانەوەستاوەو پلە بەپلە لەگەڵی چووە.

گەر قسە لەسەر کۆمەڵگای کوردی بکەین بەتایبەت لەچەرخی نۆزدەو سەرەتای بیستەکانیشدا دەبینین باری کۆمەڵایەتی لەدوتوێی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتیدا هێشتویەتیەوە، ئەمە بابەتێکی کراوەی نێو ئەم نامیلکەی بەردەستمانە کەگشت لایەنەکانی خستۆتە بەر رۆشنایی لێدوانو گفتوگۆ، نەك هەر ئەمەش بەڵکو هێڵە گشتیەکانی پێشکەوتنی سیاسیو کۆمەڵایەتی کوردی بەئاراستەی گەشەکردنی بزوتنەوەی کوردایەتی پشت گوێ نەخراونو زیاد لەوەش پشت راست کراونەتەوە.

**ئەم پرۆژەیە بەرهەمێکی گرنگەو بەرای ئێمە جێی خۆیەتی خوێندەوارانی کورد لەدووبارە چاپکردنەوەیدا لەخوێندنەوەی بێ بەش نەبن**



# پێگەی دیپلۆماسیەتی بزووتنەوەی کورد لە ئێستادا

مەحمود مەلا عزەت

لەو کاتەوە کە کوردستانی نیشتمانی نەتەوەی کورد داگیر کراو بوە مەیدانی شەڕو شۆڕی دەوڵەتە داگیر کەرەکان و توانیان بەئارەزووی خۆیان پارچە پارچەی بکەن و هەر کاتەش بەپێی هێزو سەرکەوتنی لایەك نەشتەرو مقەستی لێ بخرێتە کارو پارچەی لێ بکرێتەوەو بلکێنرێ بە بەشە کەیەوە. لەو ڕۆژانەوە کەهەست و گیانی نیشتمانی و نەتەوایەتی گەلی کورد سەری دەرهێناو بەرە بەرە گەشەی ئەکرد..

وەکو ئەنجامێکی لەباری ئەو داگیرکردن و دابەشیو چەوساندنەوەو زوڵم و زۆرداریيە، لەو کاتانەوە گەلی کورد لەهەر شوێنێکی کوردستاندا هەلی بۆ هەڵکەوتبێ و زروفە مەوزوعی و زاتیەکان بارێکی وایان هێنابێتە کایەوە... میر نشین و قەوارەی تایبەتی دامەزراندوە، جوڵانەوەی چەکداری کە لەو ڕێرەوەدا ڕۆڵە و نیشتمان پەروەرانی کوردستان چەند تەقەلایان دابێ و خەبات و فیداکاریان کردبێ لەوە زیاتر ناحەزو دوژمنەکان پیلان و ڕێگەو شوێنیان داناوە بۆ لێدانی بزوتنەوەی کوردایەتی‌و بۆ درێژەدان بەداگیر کردن و چەوساندنەوەو بەندەگێتی گەلی کورد.

باری ئاڵۆزو تێکچرژاوی کوردستان، بێ هێزو لاوازیی بزوتنەوەی کوردایەتی بە ڕادەیەك کە توانای ئەوەی نەبێ بەرەنگاری داگیرکەران بکات و لەزۆرانبازی نیشتمانی و نەتەوایەتیدا نەتوانێ مافەکانی گەل لە قورگیان دەربێنێت پارچە پارچە کردنی کوردستان و یەك نەخستنی هێزو توانای کوردو مانەوەی بەپچر پچری و لەیەك دابراوی، بەرپا بوونی شۆڕش و ڕاپەڕینی تەسکی ناوچەیی بێ پشت و پەناو بێبەش لە هێزو تواناو یارمەتی پارچەکانی تری نیشتمان. وەلە دوایشدا دانەمەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوایەتی یەکگرتوی بەهێزی ئەوتۆ کە ئەرکی پاراستنی گەل و نیشتمان بگرێتە ئەستۆو بەرەنگاری هێرشی دڕندانەی داگیر کەران بکات: ئەوانە هەمووی بوبونە یارمەتیدەری دەوڵەتە داگیرکەرو ئیمپریالیستەکان کە هەمیشە لووت بژەننە کوردستان و دەست بخەنە ناو هەموو کاروبارێکیەوە. لە ئەنجامی ئەمەشدا میرو پاشا و سەردارانی کورد پێش دەست پێکردنی سەردەمی شۆڕشی نیشتمانی و نەتەوایەتی- ناچار بوون کەم و زۆر پشت بەلایەك ببەستن و داواو فەرمانەکانیان جێبەجێ بکەن و دژی لاکەیتر بوەستن و لە دواییشدا بەئاسانی کێشکرێن بۆ گێژاوی ئەو ناکۆکیە توندو تیژەی نێوان داگیرکەران کە هەزاران کوردی هەژار ئەبوونە خۆراکی ئەو شەڕو شۆڕانە بێئەوەی هیچ دەستکەوتێکی کوردو کوردستانی لێ بەدی بکرێ لەگەڵ ئەوەی کەهەموویان لە ڕاستیدا دژی گەلی کوردو مافەکانی بوون لە کاتی پێویستیشدا لە بەرەیەکدا یەکیان گرتوە، بەتایبەتی لە سەردەمی بزوتنەوەو شۆڕشە نەتەوایەتییەکاندا، ئەگەر جارو بارێکیش دەوڵەتێك بێلایەن وەستابێ بەیارمەتیدەرو پاڵپشت خۆی پیشان دابێ ئەوە کاتی بوە و بۆ جێبەجێ کردنی پیلانێکی تایبەتی بوەو هەرکە بەمەبەست گەیشتبێ و مەترسیەکانی بەردەمی نەمابێ ئیتر شوێنی ئاسایی خۆی گرتۆتەوە لەبەرەی دوژمنایەتی کردنی بزوتنەوەی کوردایەتیدا.

لەو قۆناغەدا کەرژێمی دەرەبەگایەتی کوردستانی گرتبوەوە وەکو ئەنجامێکی سروشتی ئەو سەردەمەو وەکو کارێکی پێچەوانەی داگیرکردن و دابەش کردنی کوردستان، قەوارەو میرنشینی کوردی دامەزرێنرا، کەزۆر جار هەر میرنشینێك سەربەخۆیی خۆی ئەسەپاندو هەموو پەیوەندیەکی لەگەڵ پایتەختدا ئەپچراندو بەرەنگاری هێرشە سەربازیەکانیشی ئەکرد، تائالەو کاتانەدا لەبەر ئەوە و بەهۆی بەربەرەکانی و شەڕو شۆڕی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستانەوەو بەهۆی لاوازی و شکستی لایەکیان لەهەر کاتێکدا، لەبەر ئەوانە جاروبار سەریان نەئەپەرژایە سەر کوردستان یان بەیارمەتی دەر خۆیان پیشان ئەدا بەتایبەتی هەر دەوڵەتێك پێویستی بەهێزو یارمەتی و خەڵکی کوردی سەر بەو میرنشینانە هەبوە. بۆیە پەردەی دۆستایەتی‌و پاڵپشت و یارمەتی دەربیان ئەدا بەڕووداو ڕووی ڕاستەقینەی خۆیان ئەشاردەوە... هەرکە ڕێگە بۆ لایەك تەخت بووبێ ئیتر سیاسەتی توندو ناوەندی کردنی حوکمڕانی گرتوە، ئەوە لەلایەك، لەلایەکی تر سروشتی دەرەبەگێتی قەوارە کوردیەکان و بێ هێزی و ناکۆکی و دووبەرەکی ناوخۆی هەر یەکەیان هۆیەکی تری ئەو بارە ئاڵۆزو بێ بنچینانەی میر نشینە کوردەکان بووە. جا هەر چەندە سیاسەتی توندو تیژی ناوەندی کردنی حوکمڕانی پایتەخت هۆیەکی لاواز کردنی ڕژێمی دەرەبەگایەتی بوو، بەڵام




مەبەستی سەرەکی داگیرکەران، چی دەوڵەتی فارسی سەفەوی بێ و، چی دەوڵەتی عوسمانی، هەڵتەکاندنی ئەو رژێمە نەبووە، چونکە یەکێك لە پیلانەکانیان هێشتنەوەی کوردستان بوو بە دواکەوتویی، وە هەر بەمەو بەپاڵپشتی دەرەبەگە خۆفرۆشەکان درێژەیان بەداگیرکردن داوە، بەتایبەتی کاتێك کە کۆمەڵی کوردی لەرژێمی نیمچە دەرەبەگایەتی دا خۆی گرتەوە.... کۆڵەکەو پایەگای داگیر کردن لەناو خۆیدا بەشە دەرەبەگ و خاوەن موڵکە خۆفرۆشەکان بووە.

ئەو بارە ناهەموارو پڕ کوێرەوەریەی دوو چاری نەتەوەی کورد بوو، مێژووی دوور و درێژی خوێناوی و پڕ رووداوو کارەساتی پێك ئەهێنێ، ناکۆکی سەرەکی نێوان بزوتنەوەی نەتەوایەتی گەلی کوردو بەرەی دوژمنان هەر لەو سەرچاوەیەوە دەست پێ ئەکات، بۆیە زۆرانبازی و پێکدادانی ئەم دووبەرە ناکۆکە بە توندو تیژی سەری دەرهێناو، تا بزوتنەوەی کوردایەتی بەهێز تر بوبێ توندو تیژ تربوە، لەبەر ئەوە هەموو سەرنجێکی زانستیانە لە مێژووی نەتەوەی کورد لەبزوتنەوە نەتەوایەتیەکان و ناکۆکیەکانی، ئەبێ لەبەر رۆشنایی ئەوڕاستیانە بێت.. پێویستە بنچینەکانی لێکۆڵینەوە لە دیپلۆماسیەتی بزوتنەوەی کوردایەتی هەر لەسەر ئەو زەمینە پتەوە دابڕێژرێ. جالێرەدا بابزانین بۆچی دیپلۆماسیەتی بزوتنەوەی کوردایەتیمان هەڵبژاردوە لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی روداوە سیاسی وئابوری وتۆمەلایەتی ونەتەوایەتییەکانی کوردستان، روون کردنەوەی زنجیرەی روداوەکان وبەراورد کردن وهەڵسەنگاندنیان، دەست نیشان کردنی رادەی پێشکەوتن و سەرکەوتن وگەشە کردن وخەملاندنی بزوتنەوەی نەتەوایەتی لەهەر پلەو قۆناغێکدا. هەڵوێستی هەر میرو سەرکردەیەك کە هاتونەتە سەر شانۆی حوکمڕانی و سیاسی کوردستان لەهێزو دەوڵەتەکانی دراوسێ و پەیوەندیدار بە ناوچەکەوە... تا چی رادەیەك کەڵك لەپشێوی ناوچەکەو ناکۆکی نێوان دەوڵەتان و شەڕو شۆڕەکانیان وەرگیراوە دەرخستن و بەراورد کردن و هەڵسەنگاندنی سیاسەتی هەریەکەیان بەپێی باری ناوچەکەو روداوەکان وە بە پێوانەی دەست کەوتەکانی گەل و رادەی پێش کەوتنی بزوتنەوە. روی ڕاستی پەیوەندیەکان و بنچینەکانیان چۆن بوون...؟ ئەنجامەکانی چی بوون..؟ مەبەست و هۆی سەرەکی هەڵوێستی هەر یەکێك لەهەر روداوێك چی بوەو چۆن کەڵکی لێ وەرگیراوە.؟ دەرخستنی هەڵە ولایە نادروستەکان لەو پەیوەندیانەدا، دەوری هێزو دەوڵەتەکان لە بزوتنەوە وجولانەوەکانی کوردستان... کێ پاڵپشت و یارمەتیدەری کورد بوەو بۆچی...؟ چون دوژمنان ناکۆکی و دووبەرەکییان لە کوردستاندا تەقاندوتەوە و بەچی بارێکدا روداوەکانیان وەرگێڕاوە..؟ روون کردنەوەی ناکۆکیەکانی نێوان دەوڵەتە پەیوەندارەکان و دەوری هەر ناکۆکیەك لەدیاری کردنی هەڵوێست بەرامبەر روداوەکانی کوردستان ناکۆکی و ناتەبایی وشەڕی میرو پاشاو سەردار وسەرکردەکانی کورد لەناو خۆیانداو چۆن دوژمن کەڵکی لێیان وەرگرتوەو کراونەتە هۆیەکی کاریگەری لێدانی بزوتنەوەی کوردایەتی.

لێکۆڵینەوەو دەرخستنی رووی راستی ئەوانە چەند لایەکی سەرەکی و گرنگی(دیپلۆماسیەتی بزوتنەوەی کوردایەتی) دەرئەخەن.

هەر چەندە وشەی دیپلۆماسیەت بۆ مانا تایبەتی وبەکارهێنراوەکەی لە سنوری هەڵوێست و پەیوەندیەکانی دەرەوەی هەر دەوڵەتێك دایە بەرامبەر بەدەوڵەتەکانی تر کە هەموو کێشە سیاسی وئابوریەکان ئەگرێتەوە، کە هەموویان

بەرەسمی وبە پێی یاسا دانراوو بڕوا پێکراوو ناسراوەکان لەسەری ڕێکەوتون وپەیمانی پەیڕەوکردنیان داوە کە مەبەستی هەرە سەرەکی هەر دەوڵەتێك پارێزگاری کردنی سەربەخۆیی وبەرژەوەندی خۆیەتی ئەو پەیوەندیانە تەنیا هەر رووی دۆستایەتی وچارەسەر کردنی کێشەکان بەو ڕێگەو شوێنەی پەسەندی ی حردووە ناگرێتەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی ماف و چارەنوسی زۆر نەتەوەو دەوڵەت فەرامۆش کراون و یاسا گشتییە دەوڵەتییەکان نایانگرێتەوە، یا بە زۆر هاوپەیمانی زۆرەملی ویستراوە بەرکەناریان خەن و دەنگیان کپ بکەن. بۆیە هەریەکە لەوانە بەناچاری ڕێگەی تایبەتی خۆی ئەگرێ بۆ چارەسەر کردنی کێشەکانی بێگوێ دانەلاکانی تر.. جاری واش هەیە کە دەوڵەتێکی بەهێز هەموو یاساو رژێم وپەیمان وڕێککەوتنە گشتییەکان ئەخاتەژێر پێوەو ڕێگەی تایبەتی خۆی ئەگرێ بۆ بەدی هێنانی مەبەست و دەست کەوتەکانی.. یا هەردەوڵەتێك بەپێی پێش بینوودەست کەوتی وەبەپێی پیلانی تایبەتی خۆی لە سیاسەتی دەرەوەیدا جوڵاوەو ئەجوڵێ بەڵام لەبەر ئەوەی کە:

1. نەتەوەی کورد بەو جۆرە نەیتوانیوە دەوڵەتی تایبەتی وبەرەسمی وبڕوا پێکراوی خۆی دابمەزرێنی، خۆ ئەگەر سەرخۆییەکی ناوخۆیی دەستگیر بوبێ ئەوا چەند توانراوە ماوەی نەدراوە ڕێگەی سروشتی خۆی بگرێ وەکو پێویست دام ودەستگاکانی حوکمڕانی چۆنی ئەوێ دابمەزرێنی و لەچوار چێوەی تەسکی سنورەکەیدا پەل بهاوێژێ وپەیوەندی لەگەڵ دەرەوەدا ببەستێ... لەگەڵ ئەوەشدا چەند میرنشین وقەوارە یەك زۆر جار وەکو دەوڵەتی سەربەخۆ چەند هەلی بۆ هەڵکەوتبێ جوڵاوەتەوەو هەنگاوی هاویشتوەو هەر یەکە لە لاپەڕەکانی مێژووی ناوچەکەدا دەورێکی دیاری کراوی بۆ دانراوە.

2. بەهۆی شوێنی جوگرافی کوردستان ولەبەر ئەو بارەی بەسەریدا تێپەڕ ئەبوو و بەهۆی چاوچنۆکی داگیرکەرانەوە، هەر لە کۆنەوە روداوە جۆربەجۆرەکانی کوردستان بەدەرنەبوون لەدەست تێوەردانی دەوڵەتان بەمەبەستی دەست بەسەرا گرتن و سنور فراوان کردن و ئاراستەکردنی ڕووداوەکان هەریەکە بەئارەزوو بەپێی دەستکەوتی تایبەتی خۆی. ئەگەر سەرنج لەهەر رووداوێکی مێژوویی بدەین بەڵگەیەکی ئەو ڕاستیەمان بەرچاو ئەکەوێت. لەبەرئەوە پەیوەندیەکانی دەرەوەی بزوتنەوەی کوردایەتی و پەیوەندی وهاوکاریەکانی دەوڵەتان کە هاوپەیوەند بوون بە کوردستانەوە ئەوەندە بایەخدارە بەلای جوڵانەوەی نیشتمانی و نەتەوایەتی گەلی کوردەوە کە پێویست ئەکات لێکۆڵینەوەیەکی وردو زانستیانەی بکرێت.

3. ئاڵۆزکردنی مەسەلەی کوردستان بەدابەشکردن و بەقەتیس کردنی کێشەی نەتەوایەتی گەلی کورد لە سنوری ناوخۆی هەر دەوڵەتێك لەلایەك، بێ هێز کردن و لێدانی بزوتنەوەکە لەلایەکی تر، و نانەوەی ئاژاوەو دووبەرەکی هەتا لە نێوان براو باوکو کوڕدا.. ئەوانەو نزمی ئاستی هۆشیاری و دواکەوتویی و خۆپەرستی بو ئەهۆی ئەوەی کەزۆربەی میرنشین و میرو پاشاکان ببەسترێنەوە بەدەوڵەتێکەوە یابە ناچاری پەنابەرنە بەر لایەك، بگرەجاری واهەبووە کە میرنشینێك سەربەخۆییەکی فراوانیشی دەستگیر بووە کەچی باری ناوچەکەو سیاسەتی داگیرکەرانەی دەوڵەتەکانی دراوسێ وتەسکیی بیرو هەڵەشەیی وبەرژەوەندی تەسکی تایبەتی کاربەدەست پاڵی بەو پاشاومیرەوە ناوە کە دەستبەردار نەبێت لەم دەوڵەت یالەو دەوڵەت، بەتایبەتی لەو کاتانەدا کە دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی سەفەوی فارسی دەوری سەرەکیان ئەبینی لەرۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاستدا.

4. لەسەردەمی ڕاپەڕین و شۆڕشە نیشتمانی ونەتەوایەتی‌یەکانیشدا دوژمنانی نەتەوەی کورد هەموو لەیەك بەرەدا/دژی بزوتنەوەکانی وەستاون، نەك هەر بۆ ئەوەی درێژە بدەن بە داگیر کردن و چەوسانەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەش کە مەترسی لەسەر هەر لایەك پەیدا بووبێ هەموو لایەك بەمەترسیان داناوە لەسەر خۆیان.. بۆیە زۆر جار لەبەرەیەکدا یەکیان گرتوە بۆ لەناو بردن و نەهێشتنی ئەو مەترسییە.

5. کێشە نەتەوایەتی و سیاسی و ئابورییەکانی کوردستان بە جۆرێك تێهەڵکێشی کێشەکانی رۆژهەڵاتی نزیك بووە کە ناتوانرێ مێژووی هیچ لایەکیان باس بکرێت بێ باس کردنی لاکەی تر، هەر ڕوویەکی دیپلۆماسیەتی هەر دەوڵەتێك باس بکرێت پەیوەندی بەکوردو کوردستانەوە هەیە.

6. بوونی کەمە نەتەوایەتی وئاینییەکان لە کوردستاندا هەندێ جار بۆتە مەڵبەندی دروستکردنی کێشەی لابەلا کە زۆر جار سەرکردەکان توشی هەڵەی واکراون کە بکرێتە بەڵگە بۆ لێدانی بزوتنەوەی کوردایەتی... هەر چەندە زۆر جار زیرەکیی سەرکردەو ڕێزگرتنی ئەو کەمایەتیانەو باش ڕاگرتنی پارسەنگی تەرازوی یەکێتی ڕیزەکانی گەل بۆتە هۆی تێکەڵ کردنی خەباتیان بەخەباتی نەتەوەی کورد وجێگیر کردنی برایەتی لە ناویاندا بە جۆرێك کە هەموویان بەرگری لە نیشتمانەکەیان بکەن و هەل لەدەست دوژمنان بدەن.

کەوابو جوڵانەوەی نیشتمانی و رزگاریخوازی نەتەوەی کورد هەر چەندە لەودوو قۆناغەدا بەئامانجەسەرەکی یەکەی نەگەیشتوە بەلام لەهەموو پلەو قۆناغەکانی خەباتیدا وەکو مەسەلەیەکی کلیەسەندوی گەلێکی زیندوی خاوەن نیشتمانی تایبەتی و شوێن ستراتیژی گرنگ سەیرکراوەو هەردەم نیشانە بوە بۆ تیری دوژمنان و داگیر کەران کە هەمیشە بەپیلان و گەلە کۆمەکێیان ئامانجەکانی نەهێنراونەتەدی، و پەیوەندیە ئاشکراو نهێنیەکانیان دەوری گرنگیان بینیوە لەلاواز کردنی بزوتنەوەی نەتەوایەتی و لەلێدانی شۆرش و راپەرینەکان کە ئەوانەش ورەیان بەگەلی کورد بەرنەداوەو لە هەموو پلەکاندا درێژەی بەخەباتی داوە.

لەبەر ئەوانە بۆ بزوتنەوەی کوردایەتی لەبارە کە لێکۆڵینەوەیەکی زانستیانەی وردی دیپلۆماسیەتی سەرکردایەتیەکانی هەبێ کەروی راستی پەیوەندییە ئاشکراوو نەهێنییەکان دەربخات. بێ گومان ئەم کارە پێویستی بەشیکردنەوەیەکی قوڵی جوڵانەوەکان هەیە لەهەر پلەو قۆناغێکدا بەجیا جیاو پێکەوە بەستراوی، پێویستی بە تێگەیشتنێکی تەواوی مێژووی کوردە، ئەبێ لە کۆمەڵی کوردستان بگەین لە روی کۆمەڵایەتی و چینایەتی و سیاسی و ئابوری و رۆشنبیری و خوێندەواریەوە. ئەبێ سروشتەکانی کۆمەڵی کوردو قۆناغە کۆمەڵایەتیەکان وجۆری گەشەکردنی وهۆیە کارتێکەرەکانی ناوەوە ودەرەوەی روون بکرێتەوەو کۆسپەکانی رێگەی ئاشکرا بکرێن، یاسا گشتیە کاریگەرو ئاراستەکەرەکان دەربهێنرێن، سروشتی کۆمەڵایەتی هەر سەرکردە وسەرکردایەتییەك. وجۆری بیر کردنەوەو سەرچاوەکەی روون و ئاشکرا بکرێن چونکە هەر یەکێك لەوانە دەورێکی باڵای بووە لە رووداوەکاندا.

ئەم هەنگاوە.. ئەم لێکۆڵینەوەیە سەرنجێکی نوێیە لە گۆشەیەکی نوێی خەباتی نەتەوەی کورد کە بۆ یەکەم جارە تیشك ئاراستەی چەند مەسەلەیەکی گرنگ و نیمچە شارراوە بکرێ و:

1. سەرنجێکی خێرا لەو بارەیەوە لەمێژووی کورد بدرێ.

2. چەند مێرنشینێکی گرنگ لەباری ئەو سەرنجانەوە هەڵبسەنگێنرێن وبەراورد بکرێن.

3. شۆرش و راپەرینەکانی سەردەمی جوڵانەوەی نیشتمانی ونەتەوایەتی گەلی کورد بخرێتە سەر دەسگای شیکردنەوەی دیپلۆماسیەتی سەرکردەکان.

ئەم هەنگاوە خزمەتی مێژوو سامانی مێژوویی نەتەوەی کورد ئەکات، لەوەش بایەخدار تر ئەوەیە کە ئەتوانرێ لەبەر رۆشنایی راستییە هەڵهێنجراوەکان مێژووی زانستیانەی نەتەوەکەمان سەرنج لێبدرێ کەبەوەش راستی و چەوتی و هەڵەی راپەرین و شۆرشەکان روون تر دەست نیشان ئەکرێن و ئەبنە چرای رۆشنکەرەوەو رێگا پیشاندەری جەماوەر بۆ خەبات و بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانج و ئاواتانەی لە مێژەوە فیداکاریان بۆ ئەکرێت وهەزاران قوربانیان بۆ پێشکەش کراوە. هەر بەو جۆرەش لایە چەوت ونادروستەکان دەست نیشان ئەکرێن و ئەبنە پەندو تاقیکردنەوەی زیندو بۆ خۆلادان لێیان و دووپات نەکردنەوەو پیانەچوونەوەیان.

ئەم کورتە لێکۆڵینەوەیە هەوڵدانێکە بۆ ئاراستە کردنی چەند تیشکێك بۆ ئەو رێگەیە.

## دوو قۆناغ و دوو رژێم لە کۆمەڵی کوردستاندا

لەبەر ئەوەی باسە بنچینەییەکانی دیپلۆماسیەتی بزوتنەوەی کوردایەتی ئەکەونە دوو قۆناغی کۆمەڵایەتی جیا جیاوە کە کۆمەڵی کوردستان لە هەریەکەیاندا سروشتی تایبەتیو گۆران و گەشە کردنی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوری و رۆشنبیری تایبەتی خۆی هەبوە کە بە گشتی ئاراستەو کارتێکەری رووداوەکان بوون و لەو سنورەشدا چینی دەسەڵاتدار رەفتاری کردووەو گەر بۆی لوابێ رژێمی تایبەتی خۆی دامەزراندوە، یا هەوڵ و تەقەلای دامەزراندنی داوە بۆ ئەوەی بیکاتەچەکی پارێزگاریکردنی شوێن و جێگەو دەسەڵاتی سیاسی و ئابوری. بۆیە پێشەکی پێویستە لەو دوو قۆناغە کە: قوناغی دەرەبەگی، و قوناغی نیمچە دەرەبەگییە بگەین و سروشتەکانی هەر قوناغێك تێ بگەین و بزانین، و سەرنجێك لە کۆمەڵی کوردستان و باری و روداوەکان و رێگەی گەشە کردنی بدەین.. لایەنە سیاسییەکەش بەو پێیانەو بەو پێوانانە شیبکەینەوە، چونکە دەرخستنی رادەو جۆری گەشەکردن و پێشکەوتنی کۆمەڵی کوردستان ئەبێتە چاوگەی روون کردنەوەو شیکردنەوەی ئاستی هۆشیاری وجۆری بیرکردنەوەی خەڵکی کورد وسەرکردەکان وئاشکرا کردنی باری سەرنجیان لەروداوەکان، و لەم رێگەیەشەوە ئەگەینە ئەنجامێکی بەجێی دەرخستنی هەڵوێست و هەنگاوو بیرو کرداری هەر سەرکردەیەك و ئەتوانرێ بەجێو نابەجێیەکان دەست نیشان بکەین، بەپێی شوێن و کات وباری هەر سەردەمە. جگەلەوەی

کەهەر بەو جۆرەو لەو ڕێگەیەوە یاساگشتییەکانی کۆمەڵایەتی و پێوانە بەجێیەکانی هەڵسەنگاندنی هەموو ئەو شتانەی مەبەست بێت دەرهێنرێ ولەبەر ڕۆشناییان نەخشەی لێکۆڵینەوەی ڕاست دائەنرێت و ڕاستیە مەوزوعیەکان دەست نیشان ئەکرێن و خۆمان لائەدەین لەهەڵەو بڕیاردانی پەلەی دوور لەبنچینەی زانستی وسۆزی وشکی بێبناغە.

لەشیکردنەوەو لێکۆڵینەوەی هەر قۆناغێکی مێژوویی‌دا ئەبێت ڕێگەی زانستی گەشەکردنی ڕژێمە کۆمەڵایەتییەکان بگیرێ کە بنچینەکەی: جۆری بەرهەمهێنان و پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنانە، پەیرەوی ئەو ڕاستییە ئەکەین کە: ناکۆکی‌یەکان و هۆی کاریگەرو کارتێکەری هەرە گرنگی گەشە کردنی کۆمەڵایەتییە کە لە سەرەتاوە لەنێوان مرۆڤ و سروشتدا بووە؛ ئینجا لەنیوان هێزی بەرهەمهێنەرو پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنانی کۆندا دەرکەوتوە، و لە دواییشدا لەنیوان پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنانی نوێ و سەرخانی ڕژێمە کۆنەکەدا پەیدا بووە جگە لەو ناکۆکیە سەرەکیەی کەدوژمنی داگیرکەر هێناویەتییەکایەوە و بۆتە هۆیەکی گرنگی ڕوداوەکان و کارکردنەسەر جۆری گەشەکردنی کۆمەڵایەتی کە ئەنجامەکەشی لە هەرقۆناغێکی ڕابوردودا وەبەپێی سروشتی هەر کۆمەڵەو بەپێی زروفە مەوزوعی و زاتیەکان، هەرەسهێنانی کۆن و دامەزراندنی نوێ بووە. واتە هەر ڕژێمێکی کۆمەڵایەتی نوێ لەئەنجامی ناکۆکییە کۆمەڵایەتییەکانی ڕژێمی پێشوو و لەناو گێژاوی ناکۆکییەکان و زورانبازی و خەباتی کۆمەڵایەتی چین وبەشەکانی کۆمەڵ، نوێ، شوێن وجیگەی کۆنی گرتۆتەوە. جگەلەوە:

هەر ڕژێمێکی کۆمەڵایەتی لە باوەشی کۆمەڵ و ڕژێمەکەی پێشوتریدا تۆوی چاندراوە و دوای ئەوەی ناکۆکییەکانی ناو کۆمەڵی هەر ڕژێم و قۆناغە توندو تیژتر بووە، ئیتر پێشکەوتوترین چینی نوێی ناو کۆمەڵ ئاڵای ڕووخاندنی ئەو ڕژێمەی هەڵگرتووە چونکە: ناکۆکی ئابوری وجۆری بەرهەمهێنان ئەگەیشتە ئەو ڕادەیەی کە دەستکەوتی چینە نوێیەکە لەوەدا بێت کەشێوەی بەرهەم هێنانی کۆن هەڵ بتەکێنێ و لەشوێنەواری شێوەی بەرهەم هێنانی پێشکەوتو تر بهێنێتە کایەوە وبیشیکاتە بنچینەی ئەو ڕژێمە تازەیەی کەئەیەوێت دایبمەزرێنێ.

هەروەها ناکۆکییەکانی نێوان یاساکانی ڕژێمێکی کۆمەڵایەتی ئاوێنەی ناکۆکییە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو ڕژێمەیە و لەلایەکی تریش هەر ڕژێمێکی کۆمەڵایەتی یاسای ئابوری و شێوەی تایبەتی بەرهەم هێنان و سروشتی جیای خۆی و یاسای ئابوری سەرەکی خۆی هەیە کەرێگەو شوێنی شێوەی کارکردنی ڕژێمەکە بەگشتی وتایبەتی دەرئەخات، مانای یاسای ئابوری وشێوەی تایبەتی ویاسای ئابوری سەرەکی و شێوەی کارکردنی ڕژێمی کۆن ئەبونە ناکۆکییەکی سەرەکی وتوندو تیژ لە نێوان چینی کۆنی دەسەڵاتدارو چینی نوێدا، ئیتر لەم سەرچاوەیەوە زۆرانبازی کۆمەڵایەتی سەری دەرئەهێناو ڕۆژ بەڕۆژ توندو تیژتر ئەبووەوە لە دواییشدا ئەنجامەکەی بەهەرەس هێنانی کۆن و سەرکەوتنی نوێ دوایی ئەهات.

ئەو هێڵە سەرەکیانەی سەرەوە گیانگەی لێکۆڵینەوەو تێگەیشتنی یاسا مێژووییەکان وگەشە کردنی کۆمەڵایەتییە لەو دوو قۆناغە مێژووییەدا.. ئەوەندە هەیە نابێت لەو گۆڕان و گەشەکردن و زۆرانبازی ڕوخاندن و بیناکردنەدا وابزانرێ کەئەوەندە بە ئاسانی دێنەکایەوە کە لەماوەیەکی کەمدا ڕووئەدەن و مرۆڤ بە چاوی خۆی ئەیانبینێ یا هەستی پێئەکات. نە ئەو ناکۆکی‌و گۆڕان و زۆرانبازیانە لەماوەیەکی دورو درێژی سەدان ساڵی یا زیاتردا ڕوو ئەدەن و هەر قۆناغێك بەپێی باری هەر وڵات وناوچەیە جیاوازە لەوی تر هەتا لەوڵاتە هەرە پێشکەوتووەکاندا هەر یەکێك لەو قۆناغە مێژوییە کۆمەڵایەتیانە سەدان ساڵ ماوە، لە ماوەیەکی دوورو درێژیشدا گۆڕان وگەشەکردنەکان ڕوویداوە، لەبەر ئەوە وڵاتی واهەیە سەدان ساڵ زیاتر لەمەوبەر ڕژێمی دەرەبەگی تیاهاتوتە کایەوەو ئێستاش هەرماوە، هیواش هەیە کە تیایا لاواز بوە یا ڕژێمی نیمچە دەرەبەگی شوێنی گرتۆتەوە، لە کاتێکدا کە وڵاتی‌وا هەیە یەکدوو سەدەیەك لەمەوبەر ئەوڕژێمەی تیا هەڵتەکێنراوەو ڕژێمی سەرمایەداری تیادامەزرێنراوە بەڵکو لە هەندێ وڵاتیشدا ڕژێمی سەرمایەداریشی ڕوخێنراوەو سوشیالیستی هێنراوەتە مەیدانەوە.. هەرچی چۆنێك بێت ئەوەی مەبەستی ئێمەیە ڕژێمی دەرەبەگی و نیمچە دەرەبەگییە لە کوردستاندا..

جالەبەر ئەوەی نیشتمانی کوردستان لەزۆر ڕووەوە ڕێگەو شوێن و شێوەی گەشە کردنی کۆمەڵایەتی خۆی بوەو جیاوازە لە وڵاتەکانی تر هەتا لەدراوسێکانیش، ئەمەش سەبارەت بەو بارو زروفە جیاوازو تایبەتیانەیە کەلە سەرەتادا باسمان کرد. بەتایبەتی داگیر کردنی کوردستان و زەوت کردنی هەموو مافەکانی گەلی کورد.

بۆیە و لەبەر تیشکی ئەو ڕاستیانەی سەرەوە و بە ڕەچاوکردنی باری تایبەتی کوردستان و زروفە مەوزوعی و زاتیەکان کە نەخشەی ڕێبازێکی تایبەتی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی‌و ڕژێمەکانی کوردستانی کێشاوە دێینە سەرکورتە لێکۆڵینەوەیەکی ئەم دوو قۆناغە.

# قۆناغی دەرەبەگی

رژێمی دەرەبەگی قۆناغێکی تەواو لەمێژووی گەشەکردنی کۆمەڵی کوردستان پێکئەهێنێ کە سەدان ساڵی خایاندوە، و وەکو رژێمێکی کۆمەڵایەتی و مێژوویی هەموو روویەکی ژیان: ئابوری، سیاسی، رۆشنبیری، ئایینی یاساو نەریت و خوو رەوشتی گرتبوەوە، کە ئەمانەش هەموی سروشت وروخساری قۆناغەکەی دەست نیشان کردووە، وەکو قۆناغێکی نوێی جیاواز لە هەردوو قۆناغی پێش و پاشی لەکایەدا بووە. دیاری کردنی سەرەتای دەست پێکردنی ئەم قۆناغە لە کوردستاندا کارێکی ئاسان نییەو پێویستی بەلێکۆڵینەوەیەکی ورد هەیە، بەتایبەتی تائێستا لەم بارەیەوە لێکولینەوەیەکی زانستیانە نەکراوە شتێکی ئەوتۆ نەنوسراوە کەبکرێتە سەرچاوە. بەلام بەگشتی ئەتوانین ئەو سەدەو ساڵانەی کەمیرنشین و قەوارە کوردییەکانی تیا دامەزراوە بە پلەی گەشەکردنی رژێمی دەرەبەگی دابنێن. کەزیاتر لە هەزار ساڵ لەمەوبەر ئەگرێتەوە، لەم بارەیەوە دکتۆر عبدالرحمن قاسملۆ ئەڵێ:

(بەرەبەرە و پێش هێرشی عەرەب رژێمی دەرەبەگی چەسپی، زەوی بەرهەم هێنراو بەدەست ئەم کۆمەڵانەی خوارەوە بوو: 1. پاشا2. خێزانی پاشا 3. پیاوە ئایینیەکان 4. سوپا 5. فەرمانبەرەکان 6. خاوەن موڵکەکان[1]

دەستپێکردنی قۆناغی دەرەبەگی لەڕوی مێژووییەوە بۆ ئەو سەردەمە گۆڕان و گەشە کردنێکی کۆمەڵایەتی پێشکەوتوانە بوە، چونکە ناکۆکیەکانی ناو کۆمەڵ گۆڕاوەو شێوەو جۆر و رێگەیەکی تازەی گرت، مروڤ لە قۆناغی کۆیلەییەوە گوێزرایەوە بۆ قۆناغێکی تازەی جیاواز، چونکە لە قۆناغی کۆیلەییدا مروڤ ئامرازی بەرهەمهێنەر بووەو هەر وەکو کەل و پەل و ئاژەڵ، خاوەنەکانی کۆیلە بەئارەزووی خۆیان لەهەموو روویەکی ژیاندا بەکاریان هێناون، بێنەوەی جیا بکرێنەوە لە ئاژەڵ ومەڕو مالآت، چۆنیان ویستبێ وایان لەناو بردوون، بێ ئەوەی هیچ کەسێك رێگەیان لێبگرێ، یا یاسا ماوەیان نەدات، چونکە بێ لێپرسنەوەو چەندو چوون بە کڕینی یابە دیلگرتنی بۆتە موڵکی تایبەتی خۆیان. کۆیلە هیچ جورە کەلوپەل و شتێکی تایبەتی لەهیچ روویەکی ژیانەوە نەبوەو نەیتوانیوە خاوەندارێتی تایبەتی لە سادەترین شێوەشدا بەخۆیەوە ببینێ.. بۆی نەبووە ژن بێنێ و ببێتە خاوەن شوێنی حەسانەوە، سەرچاوەی ئەم ئامرازی بەرهەمهێنانە-کۆیلە- کڕین و فرۆشتن و شەڕ وشۆڕو بەدیلکردن بووە، ئەمەبناغەو رووی قۆناغی پێش قۆناغی دەرەبەگییە، کە بۆ بەراوردکردن وهەڵسەنگاندن و دەست نیشان کردنی جیاوازیەکان خستمانە پێش چاو.

بەلام لە قۆناغی دەرەبەگیدا: بناغەی دامەزراندن و گەشەکردنی: زەوی وکشتوکاڵ وبەخێوکردنی مەڕومالآت بووە کە لەو سەردەمانەوە لەسەرەتادا خێڵە کۆچکەرەکان پێی هەڵساون، هەر چەندە لە دواییشدا کە ڕژێمی دەرەبەگی خۆیگرت، بووبە کۆسپی رێگەی خێڵو هۆزە کۆچکەرەکان، نەك هەر لەبەر ئەوەی کە هاتووچۆو گەرمیان و کوێستان کردن نەئەگونجا لەگەڵ سروشتی ناوچەیی دەرەبەگی و سنورە داخراوەکەیدا، بەڵکو لەبەر ئەوەش کە وردە بازرگانی کردنی ئەو خێلانە لەڕێڕەوەکانیاندا کارێکی رێگە پێنەدراو بووە، سەرەرای ئەوەش خێڵو هۆزبەستنەوە بەزەوی و کشتوکاڵەوە بە درێژایی ساڵ نەدەگونجا لەگەڵ کۆچ و ڕەودا، بۆیە ئەو خێڵ و هۆزە کۆچ کەرانە، کەسەرەتای دەرەبەگیان هێنایەکایەوە، بونە بەشێکی جیاواز لەچینی دەرەبەگ.

لەڕوی هاتنەکایەی رژێمی دەرەبەگییەوە، دکتورعبدالرحمن قاسملۆ ئەڵێ:

(دامەزراندنی دەرەبەگایەتی لە کوردستاندا کە لەناو رژێمی بەندەگێتیدا بووە، سروشتی ئەم رژێمی بەندەگێتی‌یە بەباشی گەشەی نەکردبوو، کەئەمەش کاری کردبووە سەر گەشە کردنی خاوەندارێتی تایبەتی بەشێوەیەکی ئاشکرا، خاوەندارێتی کۆمەڵ لەکاتی دامەزراندنی دەرەبەگایەتیدا هەر مابوو، کەلە ولآتەکانی تردا لە ژێرسایەی کۆیلەیەتی پێگەیشتودا نەما، و خاوەندارێتی کۆمەڵ پاش چەند سەدەیەك هەر درێژەی کێشا و رژێمی بەکۆمەڵ (النظام الجماعی) لە دێهاتدا تارادەیەکی زۆر لەسەرخاوەندارێتی گشتی بەندبوو[2] ) بۆ روونکردنەوەی سروشت و روخساری رژێمی دەرەبەگی واچاکە لایەنی ئابوری و سیاسی و یاساو سەربازی و ئاینی رژێمەکە دەربخەین و ناکۆکیە کۆمەڵایەتیەکان دەست نیشان بکەین و چین و بەشە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵی کوردستان لەو سەردەمەدا چۆن بوون دەریان بخەین.

[1] دکتور عبدالرحمن قاسملۆ(کوردستان والاکراد) چاپی یەکەم بیروت1970 لاپەڕە137

[2] دکتور عبدالرحمن قاسملو سەرچاوەی ناوبراو ل136و137

رژێمی ئابوریی دەرەبەگی سروشتی و سادەو داخراو بووە، کە بنچینــە ساکارەکەی بــۆ خۆبــەڕێوەبردن و داپۆشــینی پێویستییەکانی ژیان بووە لەسنوری ناوچە دەرەبەگییەکـەدا، کەجوتیاران بەئامرازو کەرەسەی ئەوسەردەمە پێویستییەکانی ژیانیان بەرهەم هێناوە لەرێگەی کشتوکاڵ و زەوییەوە، جگە لەوەی کە هەر لەو سنورەی ناوچەی دەرەبەگی و بۆ داپۆشینی پێویستییەکانی ژیانــە سادەکە، ئـامرازی بەرهــەم هێنـانی کشتوکاڵ و بەسـاکاری جلوبـەرگ، پێـڵاوو قـاپ و قاچـاغ و پێخـەف و بەرهـەمی سادەی پیشەسازی دەستکرد دروست ئەکرا، خانوو دروستکردن و شوێنی مەڕومالاَت ڕێکخستن هەر بەجوتیاران ئـەکرا. خۆ ئەگـەر لەشاروچکەکانی کوردستاندا وردە پیشـــەگەری هـــەبوبێ ئـــەوا هـــەر بەســـتراوە بـــووە بەکشتوکاڵەوە.

لەبەرئـەوەی دەسـەلاَت و فـەرمان بەدەست چینـی خـاوەن دەسەلاَتەوە بووە، بۆیە زۆربەی زۆری زەوی و زار موڵکی میرو پاشاو کاربەدەستی گـەورەو خزمانیـان بـووە، دوابـە دوایـان کاربەدەســتانی تـرو پیاوەئاینییــەکان هــاتوون لـﻪخاوەن موڵکێتیدا، بـەلاَم زۆربـەی زۆری دانیشوان بەشـێکی زۆر کـەم زەویان بەرکەوتووە کەزۆربەی ئەم بەشە بەسترابونەوە بەناوچە دەربەگەکەو زەوی کشتوکاڵیەوە هـەر چـەندە ژمارەیـەکی کـەم خـاوەنی پارچـەی زەوی بچـوك بچـوك بـوون بـەلاَم هــەموو جوتیـاران بەگشـتی بـە مـاڵومنداڵ و خێزانـەوە لەبـەر دەسـت ئاغـادا چـاوەڕوانی فـەرمانیان کـردوە، سـەرەڕای ئـەوەی کـە کارگـەری زەوی وبەردەســتەی بـوون هــەموو جــۆرە بــاج وسـەرانەیەکیان لێ سـەندراوە، بێگاری هەمە جۆریـان بەسـەردا سـەپێنراوە.. سـورانە، مەڕانـە، جەژنانـە، سەرخوشـانە، مریشـکانە، هێلکانـە، ڕۆنانـە، تەپاڵانـە، پوشـانە، گوریسـانە، سەرانەو شانەیان لێوەرگیراوە بـەزۆر، جگـە لـە بێگـاروجنێوو لێدان و فەلاقەو دەربەدەر کردن کوشتنیش هەربەشیان بووە، سـەربازی پارێزگـاری کردنـی سـنوری ناوچـەو دەسـەلاَتی دەرەبەگی هەر جوتیاران بوون، بە ئارەقی ناوچەوان و ڕەنجی شـان وخوێـن و فرمێسـکیان دیوەخانـەکانیان ڕازاندوێتـەوەو کۆڕی ئاهـەنگ و بـەزمی شـەوانیان تیـا سـازکردووە، بەناوی ئاینیشـەوە پـارەو بەرهــەمی ڕەنجـی شـانیان لێ سـەندراوە ئەمەجگە لەبەشی مەلاو پیاوە ئایینیەکان، ئەم بارە هەموو دێ وشــوێنێکی کوردســتانی گرتبــوەوە.. لــەم ڕووەوە تــەنیا نموونەیـەکی ناوچەیەك لـە ناوچەکانی کوردستان ئەهێنینـەوە کە باسیل نیکیتین باسی ئەکات و ئەڵێ:

(کوردە یەزیدیەکان دەیەکی بەرهەمی ساڵانەیان ئەدەن بەمیر، ئەوەندەش شێخ وسەرکردەی هۆزەکان وەری ئەگرن ئەمەش مانای وایـە کەهـەر کوردێـك دوو بـەش لـەپێنج بـەش بەرهــەمی ئـەدات بەسـەرکردە ڕوحـیو ئاینییـەکان. جگەلـەوە کوردەکـان خێمـەو کەلوپـەلی ئاغاکانیـان ئەگواسـتەوە، ئـەبو هـەر زاوایـەك مانگایـەکی بداتێ، ئاغا خۆی پارەی بە سزا لەسەرپێچیکەران وەرئـەگرت، بـۆ خەتەنە شێخ لە دوو گوێرەکەوە تادەی وەرئەگرت، بۆ ئاهەنگی ژن هێنـان لـە پێنـج گوێرەکـەوە تاپـانزەی وەرئـەگرت، بـۆ دەرکردنـی جنۆکەو شـەیتان دوو تاسیێ وەرئەگرت... هتد، جگە لـەباج هـەر کـە سـەرکردە فـەرمانیدا ئـەبوو هـەر کوردێـك چـەك هـەڵبگرێ و کاروباری تایبـەتی خۆی بەجێ بهێڵێ، جا بە زوربێ یابەخۆشی.. هـەروەها سـەربازو شـەرکەری ڕژێمـی دەرەبـەگی بـوو بـەخۆرایی.. دەرەبەگیش باجی لەسـەر گـەل زۆر تـر ئـەکرد بـۆ ئـەوەی مانگانـەو کەلوپـەلی پێویسـت بـۆ شـەڕکەرەکانی پـەیدا بکـات. لـە سـەدەی نوزدەهـەمدا سـەرفی هـەر شـەرکەرێك ئەگەیشـتە 163 ڕۆبلـی زیـو، جگە لە پارەی ساڵانە کە 24 ڕۆبڵ بوو. جگە لەوانە هەمووی لەسەر هۆزەکـان پێویسـت کرابـوو کـە جلوبـەرگ و چـەك و ئەسـپ بـدەن بەشەڕکەرەکان[3])

هەر چەندە لەپلەی گەشەکردنی ڕژێمی دەرەبەگیدا بازرگانی و ئـاڵوگۆڕ کردنـی کەلوپـەل کـەمێك گەشـەی کردبـوو، ئـەو قازانجانەی لەو ڕێگەیەوە دەست ئەکەوت لە سنورێکی تەسکدا بـووەو دەورێکـی وای نەئـەبینی لـەژیانی ئـابوری سـەردەمی ڕژێمـی دەرەبـەگیدا ئـەوەش بـەهۆی لاوازی وکـەمی قـازانج و تەسکی جوڵانەوەو ناوچەی کاروخراپی ڕێگەوبان وپچڕاندنیدا بڕینی ناوچەکان لە بەیەکتری زنجیرەی چیای سەخت وڕووبارو نـەبوونی ئـامرازی هـاتوچۆ کـردن سـەپاندنی باج وسـەرانەی دەرەبەگیو.... هتد بووە.

## بناغەی سیاسی ڕژێمی دەرەبەگی:

حوکمڕانی ناوخۆی سنوریی تەنیا لە ناوچەدەرەبەگیەکەدا بووە، ئەمەش پاش ئەوەی ڕژێمەکە گەیشتۆتە بەرز ترین پلەی گەشەکردن چونکە لەسەرەتاوە، ناوچەی دەرەبەگی بچوك بووە. دوای بەهێزبوونی خێزانێك یا هۆزێك دەسەلاَتی پەیداکردووە ئیتر بەشەڕوشـوڕ بوبێ یابەئاشتی کەوتۆتـە فـراوان کردنـی ناوچەکە.. یاخێڵ و هۆزەکانی تر لەترسا بـەناچاری پـەنایان ئـەبردە بـەر ئـەو هـۆزە دەسـەلاَتدارەی ناوبـانگی دەرئـەکردو

---

[3] باسیل نیکتین(الاکراد) طبعة بیروت 1967 لاپەرە125و 126

ئەچونە ژێر دەسەڵاتیەوە، بەمەرجێ پارێزگاری لەخۆیان و موڵك و ماڵیان بکرێ.. بەو جۆرە ناوچەیەکی دەرەبەگی بەرە بەرە فراوان ئەبوو دەسەڵاتی بەهێزتر ئەبوو تاوای لێ ئەهات ناوچەیەکی فراوان ئەکەوتەدەستی ئەو خێزانە یائەو هۆزەوە کەلە ئەنجامیشدا دامەزراندنی دام و دەستگای بەڕێوەبردن و پێك هێنانی لەشکری رێك و پێك ئەهێنرایە کایەوە، بۆ جێگیر کردنی ئەمەش زۆرکردنی باج و سەرانە و بێگار بۆ پارێزگاری کردنی دەسەڵات و وەستان بەرامبەر دوژمنان ئەبوە شتێکی پێویست، کەبەم جۆرە قەوارەو میرنشین دامەزرێنراوە. بەم شێوەیە سەرەتای هەرمیرنشین و قەوارەیەك دامەزراوەو گەشەی کردووە بۆ نموونە سەرەتای دامەزراندنی میرنشینی بابان ئەهێنینەوە کە:

خان بداغی کوڕی فەقێ ئەحمەدی دارشمانە دەسەڵاتی پەیدا کرد، پاش ئەوەی فەقێ ئەحمەد بناغەی میرنشینێکی بچکۆلەی دامەزراند، زەبرو زەنگی خان بداغ لەناوچەکەدا دەنگی دایەوە وتیرەو هۆزەکانی دەوروپشتی کەوتنە مەترسیەوە... ئیتر بەناچاری عەشیرەتەکانی ئاکۆ، بلباس، ئالان و ماوەت ئامادەیی خۆیان نیشاندا بۆچونە ژێر دەستەڵاتی خان بداغەوەو ناوچەکانیان خرایەسەر ناوچەی دەسەڵاتی ئەم فەرمانڕەوایە.. ئەم ناوچە و عەشیرەتانەش بونە ناوەندیەکی بەهێز بۆ میرنشینی بابان و پەلهاویشتن بۆ هەموو ئەو ناوچانەی تر کە لەشکرەکەی بێگەیشتایە، تاوای لێ هات دەوڵەتێکی سەربەخۆ پێك بهێنێ و میرو پاشاکانی بابان حوکمی هەموو ناوچەکانی سەربە میرنشینەکەیان بکەن و جاروبارێك بەرامبەر دەوڵەتە گەورەکانیش بوەستن.

## لەڕووی یاساوە

هەر رژێمێکی دەرەبەگی رژێم و یاسای تایبەتی میرنشین و ناوچەکە بووە... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فەرمان و قسەی میر یا پاشا لەسەرو هەموو یاسایەکەوە بووە چی ویستوەو چۆن بۆی لوابێت و چ رێگەیەکی بەباش زانی بێت بۆ پارێزگاری کردنی دەسەڵات و بەرژەوەندی خۆی هەر ئەوەی کردووە. چونکە یاساو رژێمە دانراوو ئاشکراکەش هەر بەڕاو ئامۆژگاری میر یا پاشا بووە، بەو جۆرە هەر میرنشین و ناوچەیەکی دەرەبەگی وەکو دەوڵەتێکی سەربەخۆ رەفتاری کردووە بێگوێدانە میرنشینێکی تر. جا هەر چەندە دەوڵەتە داگیرکەرەکان کوردستانیان خستبوە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوەوە بەڕەسمی و بەناو حوکمی راستەوخۆی ناوچەی میرنشینەکانیان کردووە..

بەڵام لەڕاستیدا ناوچە دەرەبەگی و میرنشینەکان سەربەخۆیی ناوخۆیان هەبووەو بەکردار یاسای ناوخۆو فەرمانی میرو پاشاکان جێبەجێ کراوەو جێگەی خۆی گرتوە.. بەتایبەتی میرنشینە کوردیەکان لە پلەی بەهێز بوون وگەشە کردنیاندا و لەو کاتانەدا کەسەربەخۆیی خۆیان بلاوکردوتەوە فەرمان و یاسای دەوڵەتی داگیرکەر فرێدراوەتە لاوەو یاسای تایبەتی میرنشین پەیرەوی کراوەکە بەگشتی خزمەتی دەسەڵاتدارو پایەو شوێن و جێگە و دەستکەوتیکردووە، بێ ئەوەی مافی خەڵکی بپارێزێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ناکۆکییە ئەوەندەش توندوتیژ نەئەبوو کە بێتە هۆی وەستاندنی خەڵکی دژی دەسەڵاتدار وفەرمان رەواکانیان چونکە دوژمنێکی گەورە بەرامبەریان وەستابوو کە چاوی بڕیبووە وڵاتەکەیان و لە هەلئەگەڕا بۆ داگیرکردنی کە لەم کاتانەدا باروگوزەرانی خەڵکی ناخۆش ودژوارتر ئەبوو.. بۆیە خەڵکی کورد لە سنوری هەر میرنشینێکدا رێزی میر ومیرنشینەکەی گرتوەو شەڕی لەپێناوداکردوە و پاراستنی مەبەست بووە. بەڵام لە وڵاتانی تردا کە مەترسی وداگیرکردنیان لەبەردەمدا نەبووە ئەودوژمنە لە ئارادانەبووە. بۆیە ناکۆکی نێوان دەسەڵاتدار وخەڵکی توندو تیژ بووەو هەر دەرفەتیان بووبێ لێی یاخی بوون.

## لەڕووی سەربازییەوە:

بۆ پاراستنی ناوچەی دەرەبەگی و بەرەنگاری کردنی دوژمنان، هەر قەوارەیەکی دەرەبەگی ومیرنشینێك لەشکری تایبەتی خۆی هەبووە کە کۆمەڵانی خەڵکی لە هەموو روویەکەوە سەرچاوەی پێکهینان و ژیان وپرچەککردن وشەڕبووە. و هەموو کەس سەربازبوون، لەکاتی فەرمان پێکردندا ئامادەی قسەی فەرمانڕەوا بوون و بەچەکی خۆیانەوە چونەتە مەیدانی شەڕەوە.

## لایەنی ئاینی

دەورێکی گرنگی بینیوە لەم سەردەمەدا، و لەبەر ئەوەی پیاوە ئاینی و زاناکان شوێنی باوەڕو متمانەی خەڵکی بوون، بۆیە هەموو قسەو فەرمان و ئامۆژگاریەکانیان جێبەجێ کراوە بێ چەندو چون، هەر کەسێك لێی دەرچوبێت بەیاخی بوو لەئاینی ئیسلام دانراوە... جاسەبارەت بەو پایە گرنگەی ئاین و پیاوە ئاینیەکان، میرو پاشاو ئاغاکان رێزیان لێگرتون و هەمیشە هەوڵیان داوە لە سنوری بەرژەوەندی خۆیاندا بیانجولێنن، خۆ ئەگەر کارێکی وایان کردبێت کە لەو سنورە

دەرچووبن ئەوا هەوڵی جێگە پێلێژ کردنیان دراوە.. دەوری ئەم لایەنە لەکاتی شەڕو شۆڕدا زۆر بایەخدار تر بووەو هەرلایەك ویستویەتی، بەتایبەتی داگیرکەران کەلایەنی ئاینی و زاناکانی ئاینی بکەن کوتەکی دەستیان لەجێبەجێ کردنی نیازو مەبەستیانداو زۆرجار ویستویانە رووی راستی ئاین بشێوێنن لەو پێناوەدا.

## ناکۆکی سەرەکی

لەم قۆناغەدا لە نێوان چینی دەسەڵاتدارو دەرەبەگ لەلایەك و جوتیاران لەلایەکی تردا بووە.. جوتیاران ئامرازی بەرهەم هێنان و دەرەبەگ سەرخانی رژێمی ئابوری و کۆمەڵایەتی پێك هێناوە، واتە چینی هەرە سەرەوەی کۆمەڵ، جا هەر چەندە لە کوردستاندا ئەم ناکۆکییە بەتوندو تیژی دەرنەکەوتووەو لە زۆر جاردا نەگەیشتۆتە رادەی پێکدادان.. ئەمەش بەهۆی داگیرکردنی کوردستان و هەرەشەی داگیر کردن و شەڕوشۆڕ و چەوساندنەوەی داگیرکەرەوە، بۆیە هەر چەندە رووی چەوساندنەوە و رووت و رەجاڵی و بەندەگێتی جوتیاران ئاشکراو لەڕوو بووە، هەندێجار بووتەهۆی یاخی بوون و راکردن لەدەست ئاغا یالەبەرەی شەڕدا چەك فڕێ بدەن.. بەڵام بەگشتی ناکۆکی گرنگ، دوژمنی سەرەکی هەر بەداگیرکەر دانراوە و خەڵکی زیاتر ئەوەی بەچاوی بینیوەو هەستی پێکردوەو بە مەبەستی گەورەی داناوە.

دەسەڵاتی سیاسی و سەربازی و ئابوری و ئاینی رژێمی دەرەبەگی دەستگاکانی، پارێزەری رژێمە کۆمەڵایەتیەکەی چینی دەرەبەگ بوە.

لەگەڵ ئەو هەموو سروشت و راستیانەی ناو رژێمی دەرەبەگی لایەنێکی گرنگ لە کوردستاندا هەبووە کە پێویست بە دووبارە کردنەوە و زیاتر روون کردنەوە هەیە، ئەوەش لایەنی داگیر کردن و دابەش کردنی کوردستانە.

چونکە لەگەڵ ئەوەدا کەئامانجی سەرەکی هەر پاشاو دەسەڵاتدارێك پارێزگاری کردنی دەسەڵات و پایەو سنوری ناوچەکەی بووە، کەئەمەش کۆسپێکی گەورەی رێگەی گەشەکردنی هەستی نەتەوایەتی و یەکگرتنی گەل و یەکخستنەوەی نیشتمان و زمانی یەکگرتوی نەتەوە بووە... جگەلەوەی قەوارەو پارێزگاری کردنی پێویستی بەدام و دەستگای بەڕێوەبردن و بەرگری کردن هەبووە کە ئەمەش باری سەرشانی دانیشتوانی گرانتر کردووە لە باج و پارەو پول سەندن و شەڕ و چەك هەڵگرتن و ژیاندنی چەکدارو شەرکەرەکان و ناچار بوونیان بەفرۆشتی بەرهەمی کشتوکاڵ بەهەرزان بۆ دانی باج و جێبەجێ کردنی داوای فەرمانڕەوا. کە ئەمەش جوتیاری دووچاری چەوساندنەوەیەکی تریش ئەکرد لەڕێگەی سووسەلەم خۆرەکانەوە.

بەڵام سەرەرای ئەم بارە... داگیر کردن و شەڕ و شۆڕی هێرشبردن بۆ لەناو بردنی میرنشینەکان یا سەرشۆڕکردن پێیان رووی ناکۆکی کۆمەڵایەتی گۆڕیبوو.. چونکە شەڕو شۆڕو داگیرکردن و ئەرکی داگیرکەران هەر بەسەر شانی خەڵکیەوە بووە، جگە لەلایەنی داگیرکردنی نیشتمان لەگەڵ ئەمەشدا جاری وابووە لەگەڵ باری ناوخۆدا میرنشینێك زۆر و ستەمی هەردوو دەوڵەتی داگیرکەری عوسمانی و فارسی سەفەوی لەسەربووە. مەحمود پاشای بابان نمونەیەکی ئەو راستییە بۆ ریج ئەگێڕێتەوە کە ریچیش لەکتێبەکەیدا باسی کردووەو ئەڵێ(مەحمود پاشا دەستی کرد بەقسەکردن دەربارەی وڵاتەکەی و کۆسپ و کێشەکان بەهۆی ئەوەوە کە ئەکەوێتە نێوان سنوری دوو دەوڵەتی بەربەرەکانیکەرەوە کە یەکەمیان بە داواکردن و سەندنی باجی ساڵانە چەوساندنەوەی هەیە وەئەوی تر کە دەسەڵاتدارێتی تورکە میرنشینەکەی سەربەوە، زۆری لێنەکات کە روو لەئێران وەربگێرێت و پارەینەداتێ کە لەگەڵ ئەوەی داواکەی جێبەجێکرد کەچی بەرگری لە میرنشینەکەی نەکردو یارمەتی نەداو باسی ئەنجام خراپی ئەو زۆرەملە دوولایەی کرد کە چۆن کار ئەکاتە سەر سامانی وڵات و گەشە کردنی)

ئەم بارەی کوردستان و زۆرەملێیەی داگیرکەران بۆ دەستەمۆکردنی میرنشینەکان و سەپاندنی فەرمان رەوای راستەوخۆی پایتەخت و زوڵم وزۆرداری چینی کاربەدەستی دەوڵەتی داگیرکەرو زۆرو هێزو هێرشەکانیان بووە هۆی ئەوەی کە سروشتی قەوارە دەرەبەگیەکان لە کوردستاندا شێوەیەکی تایبەتی بەخۆیانەوە بگرن وە ئەو روخسارە دوژمنانەیەی لە وڵاتەکانی تردا هەیبووە بەرامبەر بەخەڵکی لە کوردستاندا بەو جۆر و شێوەیە نەبێت، وەهەتا لە کاتی هێرشی داگیرکردندا ببێتە بەرگریکەرو پارێزەری خەڵکی کورد دژی داگیر کەران. هەر لەبەر ئەو راستیەشە کە گەلی کورد ئێستا بەچاوی رێزەوە بەگشتی سەرنجی میرنشینەکان ئەداتەوە بەبەشێك لەشانازی نەتەوەی کورد دائەنرێت. چونکە لەم قۆناغەدا کوردستان و دانیشتوانی دووچاری چەند جۆر ئازاردان و چەوساندنەوە بوون:

. داگیرکردن و دابەشکردن هەمیشە مەترسی داگیرکەرانی خستۆتە بەردەم خەڵکی کوردستان و زۆربەی میرنشینەکان.

. چەوساندنەوەی چینی دەرەبەگی دەسەڵاتداری دەوڵەتی داگیرکەر.

. بوونی رژێمی دەرەبەگی ناوخۆ.

. زۆری دەوڵەتە داگیرکەرەکان لەسەر میرنشینەکان بۆ ئەم مەبەستانە:

. لەکاتی بەهێز بوون و سەربەخۆییدا هەوڵدان بۆ ڕوخاندنیان.

یا بۆ بەکارهێنانیان دژی دەوڵەتەکەی بەرامبەری.

. دەستەمۆ کردن و حوکمی ڕاستەوخۆ زۆرکردنی باجی ساڵانە.

چین وبەشە کۆمەڵایەتییەکانی کوردستان

## لەقۆناغی دەرەبەگیدا بەم جۆرەبووە:

یەکەم: میرو پاشاو کەسوکاریان، ئاغاو خان و خاوەن زەوییە گەورەکان، کاربەدەستە گەورەکانی میرنشین کە لە خزم و کەسوکاری میروپاشا پێکهاتبون.. ئەمانە چینی سەرەوەی کۆمەڵیان پێکهێنابوو کە دەسەڵاتی سیاسی و ئابوری و زۆربەی زۆری زەوییان بەدەستەوە بووە.

دووەم: پیاوانی ئاینی و کاربەدەستەکانی تری میرنشین.. بەشێکی تری کومەڵ بوون کە شوێنی کۆمەڵایەتیان دیارو ئاشکرابووە. بەتایبەتی پیاوە ئاینیەکان لەم سەردەمەدا دەورێکی ئەوتۆیان هەبووە لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا کەبێ سنور ملکەچی خۆیان و هەموو فەرمان و ئامۆژگاریەکانیان بوون، بۆیە کاربەدەستان بایەخێکی تەواویان بەپیاوە ئاینیەکان داوە نزیکیان کردونەتەوە لەخۆیان. لەبەر ئەوە هەر چەندە پیاوە ئاینیەکان بەجیا وەکو چینێکی کۆمەڵایەتی خاوەن دەسەڵاتی ئابوری نەبوون بەڵام بەشێکی گرنگ و خاوەن دەسەڵاتبون کە لەراستیدا بوبونە بەشێکی تەواکەری چین و بەشی یەکەم.

سێیەم: چینی جوتیاران کەزۆربەی زۆری کۆمەڵبوون بەشی زۆریان کۆیلەی بەستراوەبوون بەزەوییەوەو ئازاردان و چەوساندنەوە و ئەرکی رژێم کەوتبوە سەرشانیان، هیچ جۆرە سەربەستیەکیان نەبووە.. هێزی بەرهەم هێنەری پێویستیەکانی ژیان بوون،ماڵومنداڵ و ژیانیان لەبەر دەست ئاغادابووە.

چوارەم: لەپلەی گەشەکردنی رژێمی دەرەبەگیدا سەرمایەداری بازرگانی و سوو سەلەم و کەلوپەل ناردنە دەرەوە پەیدابوو کە لەو کاتەشەوە رژێمی دەرەبەگی بەرەو لاوازی ئەچو، ئەم بەشەشی هەر بەوپێیە بەرەو گەشەکردن ئەرۆیشت تا وای لێهات لەکاتی گەندەڵبوونی رژێمەکەدا بونە بەشێکی کۆمەڵایەتی دووربینەر لەگۆڕانە ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسیەکاندا، جگەلەوانە پیشەگەرە دەستکردەکان وەکو بەشێکی بچوکی لاوازی جیالەوانی تر لەئارادابوو، ئەم بەشەش لە کۆتایی قۆناغەکەوە لەکاتی بێهێزی و گەندەڵی رژێمی دەرەبەگیدا بایەخی خۆی پەیداکردو شوێن خویگرت بە تایبەتی لە شارەکاندا.

یەکێك لە دەرکەوتوەکانی تری ئەم قۆناغەدا ئەوەبو کە سەرەتای دەست پێکردنی هاتنەکایەی مەرجەکانی نەتەوەدەستی پێکردووە، وەلەبەرئەوەی کوردستان ژێر دەستەو دووچاری چەوساندنەوە بوبو بۆیە هەتا خاوەن موڵك وسەردارەکان ڕێبازی سەربەخۆیی میرنشینەکانیان گرتبوەبەرو بەرەنگاری داگیرکردن ئەبوون.. لەبەر ئەوە هەستی نیشتمان پەروەری و گیانی بێزاری و نارەزایی بەرامبەر بەدوژمن باشتر گەشەی ئەکرد.

لێرەدا شتێکی گرنگ هەیە پێویستە لامان روون بێت پێش ئەوەی کۆتایی بەسروشتی ئەم قۆناغە بێنین.. ئەویش ئەوەیە کە بەهۆی کوردستان و هێرشی داگیرکەران، شێوەی رژێمی دەرەبەگی و جۆرو ڕێگەی موڵکدارێتی زەوی لەو قۆناغەدا بەیەك شێوە نەبووە بەڵکو هەر داگیرکەرێك شێوەیەکی تایبەتی خاوەندارێتی زەوی هێناوەتەکایەوە، بۆ نموونە رژێمی دەرەبەگی و شێوەی خاوەندارێتی زەوی، لەپێش هاتنی عەرەبە موسڵمانەکان لە زمانی عەباسیەکان، لەهێرشی هۆلاکۆ، لەکاتی سەفەویەکاندا، وەئینجا هاتنی عوسمانیەکان لە هەر یەکێك لەم سەردەمانەدا جۆرە گۆڕان و جیاوازیەکی هەبوە.

## سەرچاوە

دیپلۆماسێتی بزوتنەوەی کوردایەتی، مەحمود مەلا عززەت، چاپخانەی راپەرین، سلێمانی لەبلاوکراوەکانی یەکێتی ماموستایانی کوردستان لقی سلێمانی(1973).

# تاوانی عێراق لە کامپەینی ئەنفال و جینۆساید لە دژی کورد

محمود مەلا عزەت

بازنەکانی ململانێ و ستراتیجی ئاسایشی نەتەوەی کورد



سلێمانی ١٩٩٨

پوختەیەکی ئامادەکراوە لە چیرۆکی رووداوە پڕ لە تراجیدییەکانی هێرشی چەکی کیمیاوی و ئەنفال کە رژێمی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی عێراق لە دژی دانیشتوانی کوردستانی عێراق ئەنجامی دان، و رێکخراوی چاودێریی مافی مرۆڤ بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە کتێبێکی 400لاپەڕەییدا بە زمانی ئینگلیزی تۆماری کردوون و لە ساڵی 1993دا بڵاوکرایەوە.. ساڵی پاریش برای دڵسۆزم جەمالی میرزا عەزیز، ئاگاداری کردم کە ئەگەر بەڵێنی پێداچوونەوەی دەقە کوردییەکەی بدەمێ، ئەوا بەوەرگێڕانی هەڵدەستێ... منیش ئەو بەڵێنەم پێدا.. ئیتر لەناو ئەو سەرقاڵییەمدا بێ ئەوەی بزانم کە بەرهەمەکە بەو جۆرە قەبەیە، کارەکەم دەست پێکرد، لەگەڵ سەیرکردنی هەر بەشێکیدا، زیاتر بایەخی زۆری ئەو بەرهەمەم بۆ دەردەکەوت. ئیتر بەپێی ئاستی وەرگێڕانەکە بەڵێنەکەم بردەسەر.. لە تەواوبونیدا، لەو کاتانەدا کە بیری لە چاپدانەوەی هەردوو بەشی یەکەم و دووەمم لا گەڵاڵە بوو، بیری ئەم ئامادەکردن و پوختەیەم، بەم جۆرەی دەبینرێ لاپەیدا بوو، وەرگێڕیش زۆری لا پەسەند بوو.. ئاواتە خوازم هیچ خوێنەرێك لە خوێندنەوەی ئەم کتێبە خۆی بێبەش نەکات.. سەرەتا بۆ چوونە ناو باسەکانی ر.چ.م.م- بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست..

تاوانەکانی بەعس لە بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی ئەنفال و جینۆسایدی کورددا، تاوانەکانی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ دەسەلمێنن لە خراپترین و ئاشکراترین شێوەیدا... بە تایبەتی لەم کاروتاوان و کردەوانەی خوارەوەدا:

-گوللەبارانکردنی خەڵکی کورد و کۆمەڵکوژییان بێ جیاوازیکردن لە نێوان چەکدارو وسڤیل، لاوو پیرو ژن و منداڵ وساوای شیرە خۆرە.. بەهۆی تیمی تایبەتیی ئیعدام و تیرۆرکردنەوە. بە تایبەتی لە بیابانەکانی خوارووڕۆژئاوای عێراقدا، نموونەی ئەوە لە: (حەزەر) کە شەست میل لە باشوری موسڵەوەیە، نزیك چیای حەمرین لە باشوری توزخورماتو (کە لەیەك حاڵەتیدا ڕزگار بوویەك باسی(40) پاسی پڕ دەکات کە کۆمەڵکوژکراون و لە قەبری بە کۆمەڵیان ناون)، کەناری فوڕات لە نزیك ڕومادی نزیك فەللوجە نزیك تکریت کە لەیەك حاڵەتیدا و لەیەك وەجبەیدا(2000) دوو هەزار ژن و منداڵ بووە. ناوچە بیاناکانی دەوری شاری سەماوە(کە تەنها لە حاڵەتێکیدا ڕزگار بویەك باسی30 پاس دەکات کە بەیەك وەجبەبراون و لەوێ کۆمەڵ کوژ کراون و لەقەبری بە کۆمەڵ نراون.) تاد... لەو شوێنانە گروپە زۆرەکانیان تیا کۆمەڵ کوژکراون و لەقەبری بەکۆمەڵ نراون.).. لەدەیان جێگای تر لە کوردستان گروپی بچوك بچوکی چەند کەسی یان دەیان کەسیی وەك: (کورەمێ) 26 لاوو پیاو لەیەك

گۆڕی بە کۆمەڵدا دۆزرانەوە، لە(بیرجینی) قوربانییەکانی چەکی کیمیاوی لە گۆڕی بەکۆمەڵدا نێژران، لەگەڵ ئەو شوێنانەی تر کە لەباسەکاندا ناو نەبرێن.

-ونکردن و سڕینەوەی شوێنەواری ژیانی دەیان هەزار خەڵکی شەڕنەکەر بە ژن و منداڵیشەوە.

-بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی و غازی موستار، گ.ب. سارین، سیانید، خەردەل... لە دژی دێ و شار و ناوچە جۆربەجۆرەکان و کوشتنی هەزاران ژن ومنداڵ و پیرولاوی شەڕنەکەر.

-وێرانکردنی هەزاران گوندو شارۆچکەو شار، کەبەپێی ئامار لە چوارهەزار تێدەپەڕێت... کە هەموی مەڵبەندی ژیانی سڤیل و زوربەیان دوربون لە ناوچەی شەڕەوە.

-بەتالآن بردنی موڵك و ماڵ و مالآتی خەڵکی سڤیل بە شێوەیەکی فراوان لەلایەن سوپاو میلیشای جاشەوە، بەجۆرێك کە هەموو شتێك بە موڵکی ئەوان دانراوەو تالآنکردن بۆیان حەلآڵ کراوە، بە زەوتکردنی ژنیشەوە، تەواو وەك سەردەمی دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی..

-فڕاندنی برینداری چەکی کیمیاوی لەناو جێگا لەخەستەخانەکاندا و ونکردنیان، واتە ئیعدامکردنیان، هەروەك لەگەڵ بریندارەکانی شێخ وەسان وبالیسان کرا، کە گەیەنرابونە هەولێر بۆ چارەسەرکردنی برینەکانی چەکی کیمیاوی کە (حسن ندوری) ئەنجامی دابو، کەلە سێ شاحینەدا گوێزرانەوە و جارێکی تر نەبینرانەوە.

-گرتنی هەرەمەکی و بە کۆترەی دەیان هەزار لە گوندنشینەکان و دەربەدەرکردنیان بۆ ڕۆژئاواو خوارووی عیراق. -گرتن و حیجزکردنی ژن ومنداڵ و پیر. لێدان و ئەشکەنجەو و سوکایەتی پێکردن، تینوو برسیکردنیان لە ناوەندەکانی کۆکردنەوە، بەتایبەتی لە نوگرەسەلمان، سەلامیە، تۆپزاوا، قەلآگەورەکەی دهۆك، دوبز، قادرکەرەم، قۆرەتو، لەیلان و دەیان شوێنی تر لە بیابانەکان و لە کوردستاندا کە لە ناو باسەکاندا ناویان باس دەکرێت.

-هەڵتەکاندنی ژێرخانی ئابوریی کوردستان، بێکارکردنی سەدان هەزار خەڵك، قەدەغەکردنی ژیان لە پانتاییەکی زۆری کوردستاندا، چ لە ناوچە سنورییەکان و چ لە ناوچە هەستیارەکان کە بە سەدان بیری نەوتیان تێدایە..

-نیشتەجێکردنی عەرەب لە ناوچە ڕاگوێزراوە هەستیارەکاندا..

-دەرکردنی یاسای لێخۆشبونی ساختە و ئیعدامکزدنی ئەوانەی بڕوایان بە یاساکە کرد و خۆیان تەسلیم هێزەکانی ڕژێم کرد..

ڕێکخراوی چاودێریی مافی مرۆڤ-بەشی ڕۆژهەلآتی ناوەڕاست زۆر نمونەو بەڵگەو ڕوداو و شایەتیی لەسەر ئەوانە لەو کتێبەدا خستۆتە بەرچاو. زیاتر لەوانە:

ژێرپێخستنی هەموو یاساو ڕەوشت ویژدانێك لەمامەڵەکردن و جۆری جێبەجێکردنی کاری بە کۆمەڵگرتن و کۆمەڵکوژی و لە چاڵنانی بە کۆمەڵدا..

نیشتەجێکردنی خەڵك لە ئۆردوگای زۆرەملێدا...

فڕاندن و ونکردن و تیرۆرکردنی خەڵکی شارەکان. بۆ نمونە. بەردەستکەوتنی بەڵگەنامەی وەفاتی300 کورد کە بەدەستی ئەمنی هەولێر تیرۆرکراون و درابون بە مەیتخانەی نەخۆشخانەی هەولێر.

برسی وتینوو هیلاککردنی گیراوەکان.. هەڵکەندنی چاڵی گەورە و درێژ و وەستاندنی بەندەکان لەسەر لێوار و ڕووبەڕوی ئەو چاڵانە، تا لەکاتی گوللە بارنکردنیان لە پشتەوە، یەکسەر بکەونە ناویانەوە.. بەستنەوەی دوو دووی بەندەکان بەیەکەوە و پاڵخستنیان لە ناو ئیعدامکراوەکاندا و ئینجا دەستڕێژلێکردنیان.. لە دواییدا بە بلدۆزەر داپۆشینیان... بەجێهێشتنی تەرمی تیرۆر کراوەکان بۆ چەند ڕۆژێك تا بەو جۆرە خەڵك زیاتر بتۆقێنن... ڕێگەنەدان بە ناشتنی قوربانییەکان بە ڕێوڕەسمی ئاسایی و پەیڕەوکراو...

پێش کیمیاوی بارانکردنی هەڵەبجە بە11 مانگ دەستکراوە بە بەکارهێنانی.. بۆ نموونە:

لە نێوان ئەپریلی1987دا-ئۆگۆستی1988دا 40هێرشی جیا جیا بەچەکی کیمیاوی کراوەتە سەر مەڵبەندی ژیان لە دێهاتەکاندا..

بەمەزەنەی ئەو ڕێکخراوە لە نێوان50 تا 100 هەزار کەس لە نێوان مانگی فیبریوەری و سێپتێمبەری 1988دا کوژراوە...

15و16-4-1987 لە دۆڵی جافایەتی لەسەرگەڵو و بەرگەڵو، شێخ وەسسان، بالیسان و زیوەشکان.. بەکارهێنراوە..

هەر لەو ساڵەدا(1987) 703دێ وێران و تەختکران، 122دێ لە هەولێر، 320دێ لە سلێمانی.. هەر لەو ساڵەدا گەڵێ ناوەندی ناحیە لەگەڵ زەویدا تەختکران و دانیشتوانیان ڕاگوێزران. بۆ نموونە قەرەداغ، قەرەهەنجیر، نەوجول، کوکس، شوان، سەنگاو، کانی ماسی لە دهۆك، شارەکانیش: هەڵەبجە، پێنجوێن، چوارتا، قەلآدزێ. و چەندین شارۆچکەی بچوکتر.

ئەنفال کە بە هەشت هێرشی جیا جیا بۆ سەر شەش ناوچەی جوگرافی لە 23-2-1988وە دەستی پێکردوە تا6-9-1988ی خایاندووە.. ر.چ.م.م بەم جۆرە چیرۆك و باسی ئەنفالەکانمان بۆ دەگێڕێتەوە..

## ئەنفالەکان:

ئەنفالی یەکەم: هێرشەکان بۆ سەرگوڵو و بەرگەڵو لە سێ لاوە دەستی پێکرد و سێ هەفتەی خایاند لە23-2-1988 دەستی پێکرد مەزەنەی کوژراو(بەلایەنی زۆرەوە8250 کەس بوە کە زۆریان پێشمەرگەبون. لەم هێرشانەی ئەنفالی یەکەمدا 27فیرقە جگە لە جاشەکان بەکارهێنران دیارە بە هەموو جۆرە چەکەکانیانەوە بە کیمیاوی و غازی جۆراو جۆریشەوە).

ئەنفالی دووەم: هێرش بۆ سەر ناوچەکانی قەرەداخ لە(22-3 تا 1-4-1988) پێشەکی بە هێرش بە چەکی کیمیاوی لە چەند شوێنێك و ئینجا لە چوارلاوە هێرشەکە دەستی پێکرد، نەخشە هەرپێشمەرگە نەبوە، بەڵکو هەروەك ڕاوکەر گوند:شینەکانیان لە ماڵ و دیهاتەکاندا دەردەپەڕاندو و ڕاویان دەکردن، ئەوەش ڕەویەکی بە کۆمەڵی خولقاند.. بەو هیوایەی خۆیان بگەیەننە شوێنێکی ئەمین..

ئەنفالی سێیەم: هێرش بۆ سەر ناوچەکانی گەرمیان(7-4 تا20-4-1988) خوێناویترین هێرش و گرتن و ئیعدامکردن و لە چاڵنان بو بەگروپی زۆرگەورە..

ئەنفالی چوارەم: هێرش بۆ سەر دۆڵی رووباری زێی بچوك لە(3 تا8-5-1988).

ئەنفالی پێنجەم: هێرش بۆ سەر ناوچەشاخاوییەکانی هەولێر لە15-5 دا دەستی پێکرد بە هۆی بەرەنگاریی توندەوە ناچاربون هێرشەکە ڕابگرن، لە دوایيدا..

بەئەنفالی شەشەم و حەوتەم لە جولای و ئوگوستیدا دەستی پێکردەوە، لە 26-8دا ڕژێم بڵاوی کردەوە کە ناوچەکانی ی. ن. ك لە تێکدەران پاککرایەوە..

هەشتەم ئەنفال کە دوا هێرشە لە25-8دا دەستی پێکرد، لە6-9-1988دا ڕژێم بەیانی سەرکەوتن و لێبوردنی بڵاوکردەوە..

هەڵەبجە بەشێك نەبو لە ئەنفال لە15و16-3-1988دا هێرشی کیمیابارانی کرایە سەر بەمەزەنەی ئەم ڕێکخراوە:3200-5000کەس کوژراوە.

تاوانەکانی ڕژێمی بەعسی عیراق لە زمان خۆیان و لە نامەرەسمییەکانیان و لە قسەکانیاندا:

لە کۆتایی ساڵی1988دا سێ حاڵەتی ئیعدامی تەسلیم بوەکان دۆکۆمێنت کران، کە لە ڕاپەڕیندا دەستیان بەسەرداگیرا، لە یەکێکیاندا(180)کەس ئیعدام کراون.

ئەمنی سلێمانی لە ماوەی هەشت مانگی ساڵی1989دا 87کەس لیست کراون کە ئیعدام کراون.

ڕۆژنامەی (الثورة)ی حیزبی بەعس دانی بەوەدا نابو کە تەنها لە دوو مانگی هاوینی1987دا(2800هەزار خێزان کە کۆی هەموویان200000هەزار کەس) بووە لە زۆنەکانی سنور دورخراونەتەوە، واتە ڕاگوێزران.

تاریق عەزیز لە گفتوگۆکەی ساڵی1983-1984دا بە نوێنەرانی(ی. ن. ك)ی گوتبو ئەگەر ئێوە یارمەتیمان بدەن ئەوا هەرگیز لە بیرمان ناچێتەوە، خۆ ئەگەر بەرهەڵستیمان بکەن وا هەرگیز ئەوەشمان لەبیر ناچێتەوە، پاش کۆتایی جەنگ لەگەڵ ئێراندا خۆتان و هەموو گوندەکانتان لە ناو دەبەین...

لە کۆبونەوەیەکی پارێزگارانی کەرکوك و دهۆك و هەولێر و سلێمانی و فەرماندەی فەیلەق و فیرقەکانی جەیش لە کوردستاندا (عەلی حەسەن ئەلمەجید) لەسەر ناوچەی دەشتی هەولێر بە توڕەییەوە وتبوی کە نەدەبو هیچ خانوییەکی دەشتی هەولێر بە پێوە بمایە جگە لە هی عەرەب..

لە کۆبونەوەیەکی دواتردا بە هەڕەشەوە ئەوەی دوبارەکردبۆوە وتبوی خۆم سەرپەرشتی دەکەم هەر خانوییەك بەساغی ببینم وا فەرماندەی ئەوبەشە بەرپرسیار دەکەم.

کە هێزەکان دەچونە ناوچە دیهاتییەکانەوە، پێشەکی دێهاتەکانیان دەسوتاند و بەبلدۆزەرتەختیان دەکرد یان دەیانتەقاندنەوە، ئینجا گوندە وێرانکراوەکان بە کۆپتەر دەپشکنران بۆ کوشتنی هەرکەس و ئاژەڵێك کە تیایاندا ببینرێت.. هێزی پیادەش لەگەڵ وێرانکردنەکاندا، بیرو سەرچاوەکانیان کۆنکرێتڕێژدەکرد، تەلی کارەبایان دەکردەوە، ئینجا ئیستیخبارات بە کۆپتەر شوێنەواری وێرانکردنەکانیان دەپشکنی ئەگەر هەربینایەکیان ببینایە ئەوا فەرمان دەکرا بەو بەشە عەسکەرییە بۆ تەواوکردنی کارەکەی ئەگینا بەر موحاسەبەو سزا دەکەوت.

جەعفەر مستەفا هێزێکی جاشی پێکهێنابو لە دژی شۆڕش بەو مەرجەی لە دێهات و ناوچەکەی خۆیدا بمێنێتەوە.. کە فەرمانی ڕاگواستنی دێیەکەی دەرچوبو، ئەم ڕازی نەبوبو، پاش یەك هەفتە لە بەغدا ئیعدام کراو لاشەکەیان بردەوە بۆ شارۆچکەی مانگیش، لەوێش جارێکی تر هەڵواسرابووەوە. دوای ئەوە هەردوو گوندەکەی(بێ سفکی و دورگی جێك) سوتێنران و تەختکران.

15-4-1987 لە دۆڵی جافایەتی چەکی کیمیاوی بەکارهێنرا. ڕۆژی دوایی لە شێخ وەسسان و بالیسان ئەوەی بالیسان جاشێك بە ڤیدیۆ فیلمی کارەساتەکەی گرتبو. لە بالیسان 24 کوژراوی چەکی کیمیای لەیەك گۆڕی بە کۆمەڵدا دۆزرانەوە.

لە شێخ وەسسان 103 کەس کوژراو، 33 کەسیان منداڵی ژێر 4 ساڵ، 28 کەسی تر لە 5-14 ساڵ و 9 ی تر لە60 تا 80 ساڵ بوو.

8-9 مردوش لە نەخۆشخانەی ڕانییە بوون.

لە پاش نیوەڕۆی 8-6-1987 دا بۆ ماوەی یەك سەعات گوللە تۆپی کیمیاوی لە هاوێژەر(قازیفە) و ڕەکێتیی بارکراو لەسەر لۆری یان ڕاجیمە بەسەر بەرگەلۆ و هەڵەدن و سێکانیاندا بارێنرا.

لە ڕۆژێکی مانگی 2-1988 دا هەشت فڕۆکەی جەنگی هەردوو دێی(تەکیەو بەلەگجار)ی قەرەداخیان کیمیاباران کرد، لەبەر ئەوەی خەڵکەکە لە ترسانا چۆڵیان دەکرد، زۆربەی سڤیلەکان بەرنەکەوتن، بەڵام پێشمەرگەو پاسداران و خەڵکی تر کە لەوێ بوبون بریندداربون و بۆ ماوەی سێ ڕۆژ چاویان لە دەست دابو.

بەڵام کە ئەنفالی دووەم لە ناوچەی قەرەداخدا دەست پێکرا.. لەکاتی نانخواردنی نیوەڕۆی ڕۆژی 22-3دا لەگەڵ تۆپبارانەدا هێرشی کیمیاوی بە فڕۆکە بۆ سەر سێوسێنان دەستی پێکرد، مەزەنەی قوربانییەکانی ئەو دێیە بە78یا 87 کەس دادەنرێن لە ناویاندا، تۆپێك دەکەوێتە ماڵی

مەهدی حاجی زۆراب ناوێکەوە، لە چواردە کەسی خێزانەکە 13 کەسیان یەکسەر دەکوژرێن، ڕزگار بوەکە کوڕێکی ناوبراوبو کە پێشمەرگەبو و بۆ چیاکان هەڵهاتبو.

ڕۆژی دوابیتر بەراجیمە دێی دوکان بەر غازی کیمیاوی درا، ڕۆژی دوابیتر جافەران.

لە گوندی کورەمی لە بادینان26 لاوو پیاو لە ئۆگوستی1988دا ئیعدام کرابون(ئەو ڕێکخراوە جیهانییانەی دوای ڕاپەڕین هاتبونە کوردستان لە گۆڕی بە کۆمەڵدا دۆزیبویاننەوە).

لەگەڵ حاڵەتدا تەنها دورێگەیان لەبەردەم گوندنشینەکاندا دانابو، دەرگای بێلایەنییان قەپاتکردبوو، ئەوەش: بڕۆن بۆ لای تێکدەران یان بۆلای حکومەت، هەروەك بە عەشیرەتی جەبارییان وتبو.

بۆ کەمایەتییە نەتەوایەتی و ئایینییەکانیش هەردوو ئەلتەرنەتیڤیان خرابوە بەردەم: یان خۆیان بە عەرەب بنوسن وەیاخود بەکورد.. ئەم حاڵەتی بە کورد نوسینەش هەر بۆ ئەوەبو کە بکەونە ناو بازنەی ڕاگواستن و دێهات وێرانکردن و گرتنەوەی هەموو بڕیارو یاساکانی تر کە لەدژی تێکدەران، واتە کورد دراون..

فەرمانی دەرکرد، ئەوەی لە سەرژمێری17-10-1987دا ناونوس نەکرێت بێ بیانوییەکی بەجێ ئەوا هاووڵاتی عیراق لە دەست دەدات...

علی حسن المجید لە بۆنەیەکدا لەسەر وێرانکردنی کوردستان وتبوی: بە موستەشارەکانم گوتوە کە من ناتوانم گوندەکانتان بهێڵمەوە، چونکە من بە چەکی کیمیاوی پەلاماریان دەدەم، ئەوسا ئێوە و خێزانەکانیشتان دەمرن.

دیسان المجید بڕیار دەردەکات: بەپێی ئەو دەسەڵاتەی بە بڕیاری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە ئازاری1987دا پێمان دراوە، بڕیارماندا کە دەسەڵات بدەین بە لیژنە ئەمنییەکان لە پارێزگاکانی باکوردا بۆ دەست بەسەراگرتنی پارە و موڵك و ماڵی تێکدەران بە مەرجێك لە ماوەی یەك مانگدا جێبەجێ کرابێت..

لە1ی مایسدا بڕیاری دەرکرد بۆ ئیعدام کردنی کەس و کاری پلەیەکی تێکدەران...

تەقەکردن بۆ کوشتنی هەرکەسێ یا ئاژەڵێ کە لە ناوچە قەدەغەکراوەکاندا دەبینرێت، لە کاتی گرتنی هەرکەسێکیشدا دوای وەرگرتنی زانیاری لێی، ئیعدام دەکرێت.

لەوەدا چەند دۆکومێنتێك لە درەنگانێکی1987 دا لە ئەرشیڤەکانی دەوڵەتدا کە کەوتونەتە بەردەست، بە دەنگێکی ئاشکراو ڕووڕاوییەوە جەخت لەسەر ئەوە کراوە کە ئەوەی: لە پەرەگرافی(5)دا هاتووە(فەرماندان بۆ گوللە بارانکردنی بەپەلەی گیراوەکان، دوای لێکۆڵینەوەی حاڵەت بە حاڵەت، بەبێ گەڕانەوە بۆ دەسەڵاتی سەروتر وەکە پێویستە چیتر بیروی باکور بەو جۆرە داوایانە ئیزعاج نەکەن، چونکە ئەوە فەرمانی نەگۆڕ و ئاشکرایە.

لەگەڵ ئەوانەدا فەرمانی پاوان و کۆنترۆڵکردنی خواردەمەنی، قەدەغەکردنی کڕین و فرۆشتن، ئابلوقەی ئابوری زۆر ئاشکراو توند و تیژ پەیڕەو کراوە..

نامەیەکی ئەمنی سلێمانی ئاماژە بۆ ئامۆژگارییەك دەکات کە کردوییەتی بە بناغە بۆ ئیعدام کردنی19(متهم) کە ئەنجامیان داوە لە بەرئەوەی لە ناوچەی قەدەغەکراودا دەستگیرکراون.

نامەیەکی تری ئەمنی سلێمانی ژمارە س. ت:21308 لە 16-9-1987دا باسی بە نهێنی ئیعدامکردنی 5 تاوانبار دەکات بەهۆی پەیوەندییان بە ڕێکخراوە بەکرێگیراوەکانی ئێران کە تیمی ئیعدام کردن لە 24-10-1987دا بە ئامادەبوونی لێپرسراوانی ئیستیخبارات و حیزبی بەعس جێبەجێی کردووە.

پاش ماوەیەکی تر بڕیار درا کە3 خێزانی تاوانباران بە شێوەی نهێنی ئیعدام بکرێن، دەسەڵاتی ئیعدام کردنەکەش لە فەرماندەی بیروی باکورەوە بە نامەی ژمارە6806 لە12-12-1987 پێیان درابو.

نامەیەکی ئەمنی هەڵەبجە ژمارە3324 لە14دا بۆ ئەمنی سلێمانی بە درێژی باسی ئۆپەراسیۆنی تەختکردنی گەڕەکی کانی ئاشقان لە ناو هەڵەبجەدا دەکات.. کە چۆن بە بلدۆزەرو جەرافە وێرانیان کردووە..

بروسکەی ژمارە945ی فەیلەقی 5 کە ئاماژە بۆ ئامۆژگاریی هەڤاڵ علی حسن المجید دەکات بۆ ئیعدام کردنی سڤیلە بریندارەکان..

فەرمانی کوشتنی کوێرانە: (تەقە بکە بۆ ئەوەی بکوژێت).

فەرمانی تۆپباران و بۆمباران بە تۆپ و فڕۆکە بە شەو و ڕۆژ و بەگوێرە کە هەموو شوێنێکیش بگرێتەوە...

وێرانکردنی قوتابخانە، مزگەوت، خەستەخانە، کڵێسە.. کڵێسەی وا هەبوو کە هەزار ساڵ کۆن بوە. بەپێی یەکێ لە ئامارەکان کە ساڵی1989کۆی دێهاتە وێرانکراوەکان(3839) دێ بوە، بەوێرانکردنی(1757) قوتابخانە، (2457) مزگەوت، (271) مستەوصەفەوە.

بڕیاری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بۆ ناونانی ئەو کەسانەی کە لە شەڕی داهاتووی دژ بە تێکدەران و هێرشی گوند پاککردنەوە دەکوژرێن بە(شەهیدی جەنگی قادسییەی سەدامی مەجید).

بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی بە هۆی تۆپ، ڕاجیمە، کۆپتەر، یان فڕۆکەی(پیلاتۆس)ی سویسری، سۆخۆی سۆپەر سونیکی سۆڤیەتی.

## دیاردەکانی بەرکەوتووانی چەکی کیمیاوی

هەناسە توند بون و بەزەحمەت هەناسەدان، فرمێسك ڕشتن و چاو کەوتنە ئازار هەروەك دەرزیژن بکرێن، گون ئاوسان و تێکەڵ بونی میزو خوێن، سوتانی پێست و بلۆق کردن، دەموچاوڕەشبون، ئازاری زۆر، زمان تەتەڵەکردن و بەهیستریا وە پێکەنین،

لەرزین، کوێربون بە کاتی یان بەهەمیشەیی، مردن لە پاش ماوەیەکی زۆرکەم، یان سەعاتێك.. یا دوای چەند رۆژێ یا زیاتر. هەندێ دیمەنی ئەنفالی یەکەم..

حاڵەتی تراجیدیای ئەو ناوچەیە پیاوێك و ژنێك بەم جۆرەی باس دەکەن:-

هەموو ئەو کەلوپەلانەمان بەجێهێشت.. خەڵکەکە وەکو مێگەلێکی تۆقاو بەناو چیاکاندا رووەو ئێران رێیان دەکرد، باران دەباری فرۆکەی جەنگیش بەسەر سەرمانەوە بو.. شەش کەس لە خەڵکی سەرگەڵو رەقبونەوە، هەروەها 30 کەسی تر لە خەڵکی گوندەکانی هەمان دوڵ. خەڵکەکە رایان دەکرد و پێڵاوەکانیان لێ بەجێ دەما، ئێمە لەسەرمادا هەڵدەلەرزین، لەگەڵ منداڵاندا زۆر نارەحەت بووین بە تایبەتی بەهۆی سەرماوە، چونکە نەیان دەتوانی رێ بکەن.

کۆمەڵێکی گەورە لە گوندنشینە هەڵاتوەکان هەوڵیاندابو کە لوتکە بەرزە پڕ بەفرەکان ببڕن و بچنە ناوئێرانەوە، ئەو رۆژە درەنگ بەرێکەوتن، شەویان بەسەرداهات، بەلایەنی کەمەوە80 کەسیان بە هۆی کیمیاوی و سەرماوە مردن، لەوانەشە ژمارەکە زیاتر بێت وبگاتە 160...

پیاوێکی گەنج 9 کەسی لە دەستدابو لەوانە: دایکی، سێ خوشکی کە دوانیان سکیان پڕ بو، وەسێ خوشکەزای لە ژێر تەمەنی شەش ساڵەوە..

دیمەنێکی تر لەتراجیدیاکە، هەندێ کەس خۆیان گەیاندبووە ناو ئێرانەوە، بەڵام بەهۆی لێبوردنی رژێمەوە گەرابونەوە، لەوانە سێ برا کە خەڵکی سەرگوڵودەبن، پاش دوهەفتە دەگەرێنەوە و خۆیان دەدەن بە دەست موستەشارێکەوە، ئەمیش بەڵێنی شەرەفی بە یەکێك لە خێزانەکە دابو کە هیچ کەسێکیان ئازارنەدرێت، دەیانداتە دەست حکومەت ئیتر جارێکی تر نەبینرانەوە..

هەروەها لە ئەمن و حەپسخانەی سلێمانی ئەم حاڵەتە رویدابو.. لێبوردنی ساختەو بەڵێنی درۆ چەندین جار لە قوناغەکانی کامپاینییەکانی ئەنفال و دواتریشدا چەند بارە بونەوە...

رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ راستەوخۆ باسی تەعەدداکردنە سەر ناموسی ژنەکان ناکات، چونکە وەك دەڵێت: کوردەکان نایانەوێت لەسەرخراپەکاری سێکسو ئەو جۆرە رووداوانە قسە بۆ بێگانە بکەن، بۆیە نەتوانرا قسە لەگەڵ هیچ یەکێك لەو شایەتانە، یان قسە لەگەڵ ئەو قوربانییانە کەلە نوگرەسەلمان تەعەددای ناموسیان لێکرابوو بکات، لە هەندێ شوێندا باسی جیاکردنەوەی ژنان دەکات لە پەراوێزیشدا ئاماژە بۆ راپۆرتێکی هەست هەژێنەر دەکات کە: گروپێکی گەورەی ئافرەتان کە لەدیلەکانی تر جیاکرابونەوە، بەکرێگیراوەکانی ئەمن تەعەددای ناموسیان لێدەکردن، دەنگ هەیە کە یەکێك لەم ژنانە لە ئاکامی ئەوەدا خۆی کوشتبێت. تەعەدداکردن لە ناموسی مێینەکان لە عێراقدا لە شوێنی تریشدا بە تەواوی سەلمێنراوە، وەئەوەی ئاشکراشە لەسەر شریتی ڤیدیۆ تۆمار کراوە..

## هەڵەبجە

هەندێ دیمەنی رووداوەکە وەك رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ لەو کتێبەیدا تۆماری کردون:

پلانی هەڵەبجە بۆ ی. ن. ك بۆ کەمکردنەوەی هێرش و گوشاری هێرشە سەخت و پرۆکێنەرەکانی رژێم بو...

بۆ ئێران: کردنەوەی بەرەیەکی جەنگ و سەرکەوتنێك بو لە جەنگەکەی دژ بە عیراقدا..

بۆ هاوپەیمانی هەردوولا بەرپرسیارییەکی ئیفلیجی لێدەرچوو..

بۆ عێراقیش دولایەنە قازانج بو، یەکەم: ئەو بۆ چونەی رژێمی چەسپاند کە جەنگەکەی لە دژی ئێران و جەنگەکەی لە دژی کورد یەکشت و هەمان شت بو.

دووەم: لێپرسراوێکی شوێن باوەڕ و پایە بەرز لای (پاتریك تیلەر)ی رۆژنامەنوسی(واشنتۆن پۆست) درکاندبوی کە عیراق هەوڵی ئەوە ئەدات کە دوژمنەکەی بخاتە ناوداوەوە، لە رێگەی بڵاوکردنەوەی هێزەکانی بە ژمارەیەکی زۆر، لێپرسراوەکە وتبوی: بۆ یەکەم جارە لە مێژوومانداندا کە دەمانەوێت ئێرانییەکان هێرش بکەن..

## ئێرانییەکان لە هەڵەبجەدا ناچار کران کە هێرش بکەن..

رزگارکردنەکەی هەڵەبجە لە13ئازارەوە دەستی پێکرد، بە تۆپبارانی سەربازگەکانی رژێم و گرتنی رەبییەکان بە راکردنی عەسکەر بۆ ناوشار، جل فرێدان و خۆشاردنەوە لە مزگەوتەکاندا.. هاتنە ناوەوەی هەندێ لە هێزەکان بە نهێنی بۆ ناو هەڵەبجە تا لە شەوی14 لەسەر15دا پاسداران و پێشمەرگە بە ئاشکرا بەسەر شەقامەکاندا دەسورانەوە لە15-3دا ئاگاداری لێپرسراوو فەرمانبەری حکومەت کرا کە پۆست و شوێنەکانیان بەجێبهێڵن...

هێرشی عیراق لە چێشتەنگاوی رۆژی 16-3دا بو.. یەکەم شەپۆلی هێرشی ئاسمانی ناپاڵم و فسفۆری تیا بەکارهێنرا، ئینجا بەچەکی کیمیاوی..

شەش شەش فرۆکە دەهاتن و دەرۆیشتن.. کاتێ حاڵەتەکان و شوێنەواری غاز کاری خۆیان کرد، ئیتر ئەوەی لەناو شوێنی خۆشاردنەوەکاندا مابوون ناچار دەرپەرینە دەرێ.. خەریك بو دنیا تاریك دەبو، رۆژێ پێشتریش کارەباکە بە تۆپ لێدرابو، خەڵکەکە لەناو تۆقاوی و ئازاردا دیمەنی سامناکیان دەکەوتە بەرچاو.. لاشەی مرۆڤ لە شەقامەکاندا و هی ئاژەڵ لە کوچەو قەراغ شاردا ئەو ناوەیان پڕ کردبو. ئەوانەی مابون هەریەکە بە جۆرە ئازارێکەوە دەتلانەوە و دەکەوتن و هەڵدەسانەوە.. تەرمی ژن و منداڵ و لاو و پیر جادەو کوڵان و بەرماڵەکانی پرکردبو... ئەوانەی هێزیان تیا مابو لە ناو هەرەشەی مینی ژێر زەمیندا بەرە و سنوری ئێران تەکانیان دەدا.

هەر لەو کاتانەدا فڕۆکەکان بەسەر ئەو ڕێگایانەدا دەفڕین و بە دوای ڕزگار بوەکاندا دەگەڕان، خەڵکەکەش لە جادە سەرەکییەکان دور کەوتبونەوە..

ئێرانیەکان بە دوکتۆر و کۆپتەرەوە گەیشتنە ئەو دێهاتانەی ڕاکردوو بریندارەکانی تیا کۆبونەوە.. پێش ئەوەی بۆ ئەو دیو سنور بگوێزرێنەوە دەرزی(نەتروپینیان) لێدان. دەستیان کرد بە بریندار گوێزانەوە و گەیاندنیان بۆ خەستەخانەکان لە پاوە و کرماشان و تاران... سەرەڕای ئەوەی کە بە ڤیدیۆ فلیمی کارەساتەکەیان تۆمارکرد، چەندین ڕۆژنامەنوسیشیان لە تارانەوە گواستەوە بۆ هەڵەبجە... وێنەی ئاشکرای کوردی سڤیل کە قوربانیی ئەو کارەساتەبون زۆر بە فراوانی بڵاوبونەوە.. لەسەر ژمارەی قوربانی وبریندارەکان تا ئێستا ئامارێکی تەواو نییە بە پێی ئەم ڕێکخراوە(3200)ناو لە کوژراوەکان تۆمارکراوە.. بریندارکان بە دەهەزار مەزنە دەکرێن...

خەڵکە ساغەکانیش بران بۆ دوکامپی گەورە.. تا چوار مانگیش دوای کارەساتەکە زۆر لاشە لەگەڵ شوێن مابونەوە...

دوای ئەوەی هێزەکانی عێراق هەڵەبجەیان داگیر کردەوە بیناکانی شارەکەیان بە دینامیت و بلدۆزەر تەخت و وێرانکرد، هەر بەو جۆرەش زەمەقی و عەنەبیان وێران کرد کە دو ئۆردوگای زۆرە ملیشیان بۆ گوندنشینە ڕاگوێزراوەکان تیا دروست کرد بو، دیسان سەیدسادقیش کە شارۆچکەیەکی 20 هەزار کەسی بوو هەر بەو جۆرەیان لێکرد.

دوای هەڵەبجە لە18-3دا جەیش گەیشتە سەرگەڵو، ڕۆژی ئاییندەش بەرگەڵویان گرت، بەو جۆرە سەدام بەڵێنەکەی خۆی بۆ برینی(سەری مارەکە) بردە سەر..

لە کۆتایی ئەو ڕۆژەدا فەرماندەی هێزە چەکدارەکانی عێراق بەیانی سەرکەوتنەکەی (19-3)ی ڕاگەیاند.

## ئەنفالی دووەم:

نموونەی تراجیدیای ئەنفالی دوو لە قەرەداخ، وەک ڕێکخراوی چاودێریی مافی مرۆڤ بە درێژی وەسفی کردووە، لە ناو ڕەوە بە کۆمەڵەکەی گوندنشینە ڕاونراوەکانی ناوچەی قەرەداخدا دەردەکەوێ کە بە دوای شوێنێکی ئەمین لە سلێمانی یان ئۆردوگایەکی ئەو نزیکانە دەگەڕان، چونکە چەرمەسەریی ئینسانی کورد دەردەخەن.

لەم کاتەدا قەدپاڵی چیاکان و هەموو شوێنێک پڕبون لەو خەڵکە جل شڕانەی لە ئەنفال هەڵهاتبون، لەگەڵ عەرەبانەی پشتی تراکتۆر و ئاژەڵ. هێزەکانی ڕژێم دوای کیمیاوی بارانی چەند شوێنێک، وەک سێوسێنان، جافەران- لەئازاری1988دا کە لەمارتی1987یشدا کیمیا باران کرابو، کەوتبونە پەلاماردانی سەرجەمی دێهاتەکان و دانیشتوانیان.. لەلایەکی تر قەدپاڵی چیای گڵە زەردە پڕ بوو لە هێزەکانی سوپا و کۆماندۆو تەواری، کۆپتەریش بە ئاسمانەوە دەخولانەوە، تانک و تۆپ لە هەموو لایەکەوە گوللە تۆپیان دەهاویشت، پیاوێکی خەڵکی جافەران وتبوی ئەوێ لە مەنجەڵێکی کولاو دەچوو.

گروپێک لە گوندنشینەکانی خەڵکی(مەسۆی) پەنایان بردبوە بەر ئەشکەوتێک کە چەند دەقیقەیەک لە ماڵەکەیانەوە دوربو، بەڵام کاتێ خەویان لێدەکەوێت چراکەیان نەکوژانبووەوە، لە خەودا لە دەنگی کۆپتەر و بۆمباتەقینەوە هەڵسابوون، کەسەرنجیاندا ئەشکەوتەکە پڕبوە لە بۆنی کالەکی شیرین، خێزانەکە بەهەڵەداوان بە دوومنداڵەکەیانەوە کەلە پێکەوتبون ڕادەکەنە دەرەوە بەرەو چیای زەردە..

لە یەکەم ڕۆژانی دووەم ئەنفالدا بە هەندێ لە گوند گوندنشینەکانیان ڕاگەیاندبو بۆ شار و ئوردوگاکان بچن، کەچی دوابیتر ماڵ بەماڵی(نەسرو) (زەڕاین) و سلێمانی گەڕابوون بە دوایاندا بەشێکی تری خەڵک هەر کە عەسکەر دەبینن بەرەوچیاکان بەتولەڕێیەکاندا هەڵدەهاتن، ڕزگاربونی سێوسێنان لەپاڵ چیاکاندا بۆ چەند ڕۆژێک لەبەر باران بەبێ بێزاربون مابونەوە لە پێنجەم ڕۆژدا عەسکەرەکانی خاڵی پشکنین لەسەر ڕێگای قەرەداخ- سلێمانی کەوتبونە گرتنی خەڵک، 25-30کەس لە دانیشتوانی سێوسێنان گیران و جارێکی تر نەبینرانەوە.

گیراوەکان لە مۆڵگەیەک لە گەرەکی چوارباخی سلێمانی کۆدەکەنەوە... تەنانەت گەلێ لەوانەی کە لە سلێمانییەوە خۆیان گەیاندبوە ناوچەی قەراخ، لە دوای بیستنی ڕەوەکە، بۆ یارمەتیدانی خزم و کەس و کاریان گیرابوون... هەموو شتێکی بەنرخ و ناسنامەیان لە گیراوەکان دەسەند.. زۆرجار گیراوەکان لە بنکەی تەواریی سلێمانی ون دەکران و ئیتر هەرگیز نە دەبینرانەوە... دوو خێزان کە ڕوەو دەشتی گەرمیان هەڵدەهاتن، هەر وەک سەدانی تر بە مەبەستی خۆگەیاندنە کەلار و سەرفرازبون لە ئەنفال، بەڵام هەرگیز نەگەیشتنە مەبەستیان. دوو پیاو و سێ ژنی خەڵکی عەلیاوا سەرەنگون کران، 47 کەس لە گوندی مەسۆی کە زۆر منداڵ و ژنیان تێدا بو گیران و جارێکی تر نەبینرانەوە. لە گوندی بەلەکجار 4 کەس، سەرکۆ 9، تەکیە 4، بیرداری 2، کۆشک 3، گولانی خوارو 2، مچە کوێر 9 کەس، گیران و نەبینرانەوە.

دوای کیمیاوی بارانی سێوسێنان20ماڵ بە کۆمەڵ بەرەو ڕۆژئاوای گەرمیان هەڵهاتبون. چەند ڕۆژێک بەپێ ڕۆیشتبون لەناو ئەشکەوت یان ڕووتەنیدا دەنوستن، بەو هیوایەی لە گەڕانەوەی جەیشدا بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان، لە بەکربایف تێیگەیشتن کە ناوچەکە هەمووی داگیرکراوە، خەڵکی گوندی تاوەیل لە نێوان دەربەندیخان و کەلاردا79کەسیان لێگیراو سەرنگونکران 40 پیاوی خەڵکی گوندی بۆی سانا خۆیان تەسلیم بە عەسکەرکرد، پێیان وتبون خێزانەکانیشتان بێنن هیچتان

لێبەسەرنایەت. کە ئەوانیش هاتن هەمویان گیران و بەرەو کەلار بران و هەرگیز نەبینرانەوە.. هەر لەم ماوەیەدا 500 کەس خۆیان تەسلیم کردوو سەرنگون کران..

## ئەنفالی سێیەم

هەمان ڕێکخراو بەم جۆرە وەسفی ئەهامەتییەکانی ناو ئەنفالی سێیەم دەکات:

پێشمەرگە ئەوەندەی پێنەئەکرا کە بتوانێت بەرگری لەو هێرشە توند و بێ پەروایەی سوپای عیراق بکات، ئەمە لە جەنگێکی تەقلیدی زۆر زیاتربوو، بۆماوەی زیاتر لە یەك هەفتە ناوچەکە بە هێزەکانی پیادە، فرقەی زرێپۆش، تۆپ، هێزی ئاسمانی جاش ئابلۆقە درابوو، شەپۆل بەشەپۆل پەلاماریان دەدا.. سوپا ناوچەکەی بەجێ نەهێشت تا هەموو گیانلەبەرەکان دەستگیرکرابون، بەکۆیتەر و بەپێ لەناو چیاو شارۆچکە و شارەکاندا دوای هەموو گوندنشینە هەڵهاتوەکان کەوتبون، بێ بەزەییانە لاوازییەکانی ی. ن. ك یان لە گەرمیان بەهەل وەرگرت.. بنکەی قاییم و چەکی قورسیان نەبو. ئەو پێشمەرگانەی لە ئەنفالی یەك و دوو ڕزگاریان بوبو وەخۆیان گەیاندبوە، ئەو ناوچەیە، شەکەت بوون، دوای چەکی کیمیاوی بەشێوەیەکی گشتی خەڵکەکە ڕووخابوو وا پێدەچێت ڕژێم هەستی بەوە کردبێت کە ئیتر لە گەرمیاندا پێویستی بە بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی نییە، هەرچەندە لە دژی شوێنی قاییم هەر بەکارهێنرا.

بەهۆی 31 بروسکەی نهێنی و پەلەی ئیستیخباراتی عەسکەری کە سەعات بە سەعات حاڵەتەکانی شەڕەکە دەدات بەدەستەوە، دەتوانرێت بە هەندێ درێژییەوە شەڕی عیراق لە گەرمیان نەخشە بکێشرێت. بروسکەکان لە هێرشە چەند لایەنییەکاندا کە بەلایەنی کەمەوە لە هەشت حاڵی چوار چێوەی گەرمیاندا بەیەك گەیشتبونەوە، باسی120گوند دەکات کە

چۆن پەلامار دراون و سوتێنراون کە، نزیکەی هیچ کام لەو دێیانە بەمەبەستی عەسکەری باسنەکراون تەنها باسی بەرگریکردنی چەند حاڵەتێك دەکات کە ئەوەندەی پەنجەکانی دەستن.

ئامانجی ئۆپراسیۆنەکە زۆر ئاشکرابو:- سڕینەوەی هەموو شوێنەوارێکی نیشتەجێی ئادەمیزاد بو، ئەمە لە چەند ڕاپۆرتێکی مەیدانیی ئیستیخباراتدا ئاشکرا دەردەکەوێ. هەمو ئەو گوندانەی کە هێزەکە بەناویاندا تێدەپەڕین پێویست بو وێران بکرێن و بسوتێنرانایە. تەنانەت پاشماوە و نیشانەیەکی ژیان نەمێنێ. کامپاینەکانی گەرمیان لە سێ ناوچەی جوگرافیدا، لە توزخورماتو، قادرکەرەم و باکوری گەرمیان، وەسەنگاو و باشوری گەرمیان ئەنجامدران.

ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی 17 گوند کە زوربەیان هی وارانی ژورو خواروبون دوای ڕاکردنە چیاکان، ناچاری خۆتەسلیم کردن بون بە عەدنان جەباریی موستەشار، هەروەك ئەوانەی پێشوییان، هەموو شاحینە کران و ژمارەیەکی زۆریان کە102کەسیان خەڵکی وارانی بون هەرگیز نەبینرانەوە.

لە ناو سەرنگونکراوەکانی دێهاتەکانی جەباریدا ژمارەیەکی زۆر لە ژن و منداڵیان تێدابوو... لەو سەردەمانەشدا باسی بەکارهێنانی کیمیاوی لە هەندێ لە گوندەکاندا دەکرێت وەك: تازەشاتر، کانی قادری ژورو خوارو، وەشێخ حامید، لەم دێیەی دواییدا تەرمی 25پێشمەرگە بینرابو. زۆر لە مانگاو بزن و باڵندە مرداربونەوە...

لە بروسکەیەکی ئیستیخباراتی توزخورماتو لە 10-4دا باسی 15 تەرمی تێکدەران دەکات کە لە نزیك معسکری کەرتی توزخورماتووەوە شاردرابونەوەو کە گواستویاننەتەوە، فلیمی ئەو شاردنەوەیەش گیراوە..

عائیشە ناوێکی خەڵکی گوندی شێخ حامید لە ڕاکردنەکەیدا بە شێخ ئەحمەدی موستەشار دەگات، کە پرسیاری لێدەکات

چیی ڕویداوە، دەڵێ نازانم پێویستە خۆت بەدەستەوە بدەیت، ئەوە باشترین شتە. من ناتوانم هیچ شتێکی تر بکەم، تەنانەت خزم و کەسەکانیشم کوژراون.. ئیتر رووە و قەدپاڵی چیاکانی قادرکەرەم دەڕوات کە بە کۆمەڵی زۆر لە ئاوارەکان دا پۆشرابو، خەڵکەکە سێ ڕۆژ مانەوە، لە دووەم ڕۆژدا عائیشە منداڵێکی دەبێت بەڵام ئەم برسی بو زۆرلەوە لاوازتر بو کە بتوانی شیر بە منداڵەکەی بدات، هیچ پێخەفێکیشی نەبو، ئەمیش لە سێیەم ڕۆژدا ئەشکەوتەکە بەجێ دەهێڵێت تا بەدوای خواردندا بگەڕێت.. دەوروبەیەکی جاش کە بەدوای ڕزگاربوەکاندا دەگەڕێت، عائیشە دەبینن زۆر سەری سوڕما کە بەبەزەییانە خۆیان نیشانداو بەڵێنیان پێداکە بیبەن بۆلای موستەشارەکەیان بۆ ئەوەیکاری عەفوکردنی بۆ ڕێکبخات. شێخ ئەحمەد بەرزنجی موستەشار لە قوتابخانەیەك دایدەنێت کە زۆر گوندنشینی تری تەسلیم بوی تیا دەبێت.. خواردنی دەدەنێ کاتێ سوپا بەرپرسیاریی وەردەگرێت ئیتر پیاوەکان جیاکرانەوە، خرانە پاسی عەسکەرییەوە، هەروەها ژن و منداڵەکانیش بەڵام ئەفسەرێ ڕێگەی عائیشە دەدات کە بچێت بۆ سلێمانی.. دواییتر ئەم هەر لە ئەنفال ڕزگاری نەبو، بەڵکو لە ئەشکەوتەکەدا لەگەڵ منداڵەکەشیدا یەکیان گرتەوە بەڵام عائیشە هەرگیز مێردەکەی و3 براو 12 ئەندامی خێزانەکەی جارێکی تر نەبینییەوە.. چونکە ئەوان لەناو گروپێکی 80 کەسیدا خۆیان بەدەستەوەداو لەناویان بردن. دیسان 25کەسی گوندی بسام و92 کەسی دێی عزیز بەگ کە زۆریان ژن و منداڵبون هەرگیز نەبینرانەوە.. هەر لەم بەشەی ئەنفالی سێدا 51 کەسی خەڵکی دێی ئیبراهیم غولام خۆیاندا بەدەستەوە و جارێکیتر نەبینرانەوە.

ئەو هێزانە لایەنێکی تری پرۆسێسەکەیان لە سەنگاو و چەمچەماڵەوە ئەنجام دەدا، لە گوندەکانی ناوچەی

زەنگەنەو جەباری هەموو دێهاتەکانیان وێرانکرد. سەرەڕای تاڵانکردن و خاپورکردنی دێهاتەکان ئەوانەی بگیرانایە یان خۆیان تەسلیم بکردایە ئەوا هەموو شتەکانیان لێ زەوت دەکردن و دەیانناردن بۆ لەیلان، بەشێکی تر بۆ ئۆردوگای ئەلسەورە لە دەرەوەی چەمچەماڵ... 27 کەس لە گوندی گولامە، 41 کەس لە گوندی بەنگول و هەنارە، 17 کەس لەوانە کە خۆیاندا بەدەست موستەشارێکی زۆر شورەت خراپ بەناوی تەحسین شاوەیس کە بەڵێنە بۆشەکەی سەبارەت بە لێبوردن بۆ مەودایەکی زۆر لە ناوچەی قادرکەرەمدا دووبارەکرایەوە سەرنگونکران...

خەڵکی قەیتەرانی سەد ماڵیی سەر ڕووباری باسەرە، لە ترسی فڕۆکە بە ماڵومنداڵەوە هەڵهاتبون، پێش ئەوەی شەو دابێت کەوتبونە ناو تۆڕەکەی سوپاوە هەندێ کەس گەڕابونەوە بۆ عەلیاوە و لەوێ خۆیان دابوە دەست شێخ موعتەسەم بەرزنجی، ئەمیش تەسلیمی عەسکەریەی کردبون هەندێکیان هەر نەبینرانەوە.. خەڵکی قەیتول بەرەو چەمچەماڵ ڕۆیشتبون، لە ناو چیاکاندا جەیش گرتبونی بە دوو گروپ بە شاحینە یەکێکیان ڕەوانەی سلێمانی و ئەوی تر ڕوەو لای کەرکوك ڕەوانە کران، زۆر لەمانە هەرگیز نەبینرانەوە.. خەڵکی قیرتسە پیاوان لە ژن و منداڵ جیاکرانەوە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی هەردوو دێی نەروارو بانە مۆرت سەرنگون کران، سەرجەمی20دێی ئەو ناوچە بچوکە لەو ماوە کورتەدا وێرانکران..

ستراتیجی ئەنفال لە سەنگاو و باشوری گەرمیان هەمان ستراتیجە سەرەکییەکەی هێرشەکانی باکوری گەرمیان بو، ئەنجامدانی هێرشێکی عەسکەریی گەورە و داخراو لە چەند لایەکەوە و لەیەککاتیشدا، بۆ گرتنی بە کۆمەڵی ئەو سڤیلانەی پێیان دەگەیشتن و بۆ وێرانکردنی گوندەکانیان و بۆ ڕاونانی ئەو گوندنشینانەی کە بەردەست نەکەوتبون تا بەرەو ڕێگا سەرەکییەکە یا بۆ خاڵەکانی کۆکردنەوەی خەڵکی کە پێشتر دانرابون، هەروەها بۆ پاڵپێوەنانی ئەو پێشمەرگانەی کە مابون بۆ ناو ناوچە داخراوەکان کە ڕێگای دەرباز بونیان نەبو.. دیسان ئەو ڕێکخراوە لەسەر ئەنفال لە گەرمیان دەنوسێت: بێگومان ئەوانە هیچ هەڵەیەکیان نەکردبو تەنهائەوەبو کە کورد بونو لە شوێنێکی هەڵەو لە کاتێکی هەڵەدا دەژیان. بەڵام چارەنوسیان تیشکێکی گرنگ دەخاتە سەر یەکێك لە گەورەترین مەتەڵەکانی کامپەینی ئەنفال، هەرچەندە لە هەموو شوێنێکی کوردستانی عیراقدا ژنان و منداڵان لە چەندین ناوچەی داگیر کراودا سەرنگون کراون، بەڵام ئەو نێرینە پێگەیشتوانەی کە گیرابون لە چەندین ناوچەی دیاریکراودا بە کۆمەڵ لە ناو بران... جەیش گوندەکانی بیلاگەی گەورە و بچوك و دارەجی سوتاند، دوای تۆپباران و هەڵهاتنی دانیشتوانیان، لە ناو ئەوانەی کە کوژران، ئەکبەر ڕەشاد و 3 برازای و2 خوشکەزایی لەگەڵ6 منداڵە بچکۆلەکانیاندا کە هەمویان تەمەنیان لەیەك ساڵەوە بۆ حەوت ساڵان بون..

ئەوانەی لەو نەهامەتییە سەرفرازبوبون، لەلایەن هێزێکی جاشەوە کە هەردوو موستەشار شێخ کەریم و سەعید جاف کە خەڵکی کفری بون بەڕێوە دەبران، ڕەوانەی کامپە تایبەتییەکەی قورەتو کران، ئەمەش یەکسەم هەنگاو بو لەسەفەرێکدا کە بەکوشتنیان کۆتایی دەهات... شایەتێکی چاوێنی لە یەکێك لەوکاتانە ژمارەی گیراوەکان لە قورە توبە 10000 هەزارکەس باس دەکات...

ڕێژەیەکی ئاوا گەورە لەسەرنگون کردنی ژن و منداڵ، خسڵەتی تایبەتمەندیی ئەنفال بو لە ناوچەی هێزی داوودەدا.. هەر چەند کەم گروپ لە خێڵەکانی کوردستان ئەگەر نەوترێت هەر هیچیان، بەهۆی ئەنفالەوە ئەوەندە خراپ لێیدرابێت هەروەکو لە جافی ڕۆغزایی درا، سەرەڕای وێرانکردنی هەموو دێهاتەکان و گرتنی ئەوانەی بەردەستیان دەکەوتن و سەرنگون دەکران، لەوانە 32 کەس لە گوندی کۆتر شاشە، لەباراوەش خێڵەکە(محمد توفیق محمد) 37 کەس لە ئەندامانی خێزانەکەی کوژران، لەناویاندا هەردوژنەکەی و 10منداڵ بون، هەروەها کوڕەکەی لەگەڵ ژن و7 منداڵی ورد، دیسان 25 کەس لە خزمانی تری لە تەپەگامێش کە زیاتر لەنیوەیان منداڵ بون سەرنگونکران... بەگەیشتنی ڕەتڵی کەلار بۆ قولیجان نزیك بە ئاوە سپی و سوتاندنی لەلایەن ڕەتڵی کەلار، مانای وابو کە گەیشتونەتە ئەوپەڕی سنوری ڕۆژئاوای ئۆپەراسیونەکەی ئەولایە.. گوندنشینەکان هێندە زۆر بون لە ژمارە نەدەهاتن، لە کێڵگەکاندا دەنوستن، دوای ئەوەی دوو ڕۆژ بەپێ ڕێیانکردو گەیشتنە گوندی میلستورە، ئیتر نەیاندەتوانی لەوە زیاتر دوربکەونەوە، پیاوێکی خەڵکی کونەکۆتر وتبوی هەوەکو ڕۆژی قیامەت وابو ئیتر جەیش هەمویانی بۆ ناوچەیەکی وشکەڵانی بەردین کە لە ساڵی 1975دا تەعریب کرابو برد.. لە18و19-4دا ڕەتڵەکانی کفری و کەلار کارەکانی تەواوکرد، بەرگری لە ڕێگا سەرەکییەکەی کەلار- کفری ڕووباری ئاوەسپی تێکشکێنرا، بەجۆرێك کە بەردی هیچ گوندێکیش بەپێوە نەما.. کەمێك دوور بەلای ڕۆژهەلاتدا، هێزەکانی پێپازو پونگاڵیش ڕاپۆرتی هەمان سەرکەوتنیان دابو... هەرچەند لە دێی پونگاڵ لە شێخ تاویل، هەشت کیلۆمەتر لە باشوری دەربەندیخان بەرگرییەکی کەللە ڕەقانە کرا، فەرماندەی سوپاکە موقەدەم سلێمان عبدالحسن لەیەکەم تەقەدا بریندارکرا، دوای ناردنی هێزێکی زۆر و هەموو جۆرە یارمەتییەك و فڕۆکەو کۆپتەر، تانك و تۆپی قورس و ڕۆکێت... ئینجا شەڕەکە 5ڕۆژی خایاند سەرەنجام هەر 50پێشمەرگەکە کشانەوە.

ئەم خەڵکانە ڕووەو مردن ڕێدەکەن بۆیە ناتوانن پارە یان ئاڵتون لەگەڵ خۆیاندا

ببەن، ئەمە قسەی ئەفسەرێکی جەیشی عیراق بوو لە کاتی تالأنکردنی ناو ئەنفالدا لە گەرمیان..

بۆ کۆکردنەوەی گیراوەکان گەلێ سەنتەری وەك: میلستورە، فەقێ مستەفا، مەیدان، عەلیاوە، قادر کەرەم و چەمچەماڵ هەبوون....

قادرکەرەم سەنتەرێکی سەرەکی پۆلێنکردن بو کە بارەگای سەرەکی موستەشاری بەدناو شێخ موعتەسەم بەرزنجیبوو، برای شێخ جەعفەری پارێزگای سلێمانی لەو سەردەمەدا. ئەم موستەشارە و بەکرێگیراوەکانی تر: عەدنان جەباری، سەید جەباری، ڕەفعەت گلی، قاسم ئاغا وەتەحسین شاوەیس... لە بە کۆمەڵ بەدەستەوەدانی تەسلیم بووەکان ڕۆڵێکی گەورەیان بینی کە بە بەڵێن پێدان بە لێبوردن، و تەنانەت ڕێگەدان کە بچنەوە شوێنی حەشارگەکانیان بۆ هێنانی شتەکانیان و بەڵێندان کە نێرینەکان ماوەیەك لە فەوجی جاشەکاندابن.. ئەم هەواڵانە بە خێرایی بلأودەبووەوە، یەکەکانی موعتەسەم بۆ ماوەی دوو ڕۆژگروپی گەورەی لە دیلەکانی ڕەوانەی عەلیاوە دەکرد.. جگەلەوەی کە وێنەی تەلەفزیۆنیان دەگرتن و واپیشاندەدرا کە ئەوانە نۆکەری ئێرانن لە جەماعەتی تاڵەبانی و دەستگیرکراون... ئەو خەڵکانە هەموو بزر کران، تەنها ئەوانە سەرفرازبون کە لە چیاکاندا دەمانەوە یان دەچوون بۆ شارەکان.. هەر ئەوەندەی کاریان بە(قادرکەرەم) نەما ئەویش لە ئەنفال قورتاری نەبوو، ماڵ بە ماڵ تاونوسکران و مۆڵەتی(15) ڕۆژیان دانی بۆ چۆڵکردن، بەڵام ئەمان هەر یەکە (1500) دینار (4500 دۆلار بە نرخی ئەو کات) یان بەقەرەبو وەردەگرت...

چەمچەماڵ کە شارۆچکەیەکی گەورە و سەنتەری کۆکردنەوەی خەڵکە گیراوەکان بون کە لە سەنتەرەکانی ترەوە دەهێنران...

ئەگەر لەناو نەبرانایە ئەوا بەرەو باشوور بە کۆمەڵ و گروپی گەورە گەورە ئەنێردران بۆ کوشتن و لە چاڵنانی بە کۆمەڵ.

## ڕاپەڕین و کارە ئازایانە لە ناو قیامەتی مەرگدا

لە ناو ئەو نەهامەتی و زوڵم و زۆرداری و جینۆسایدەی سەردەمی ئەنفالدا، گەلێ کاری ئازایانەش کراوە، هەم لەلایەن خەڵکییەوە، وەهەم لەلایەن هەندێ جاشەوە.. کە بونە هۆی ڕزگارکردنی ژیانی زۆر خەڵك، بەڵام هیچ کارێك لەگەڵ ئەو دژەکردارەی خەڵکی چەمچەماڵ بەراورد ناکرێت:

کاتێك کە چەمچەماڵییەکان دەیانبینی هاوولأتییەکان ئاوا بە شاحینە بەناو شەقامەکاندا دەگوێزنەوە، موجازەفەیەکی گەورەیان بەژیانی خۆیان کرد کە لە هەندێ لە جاشەکان لەو ناڕەزاییەدا دەستیان هەبو. ئەوان بەنهێنی هەندێك شوفێری شاحینە کە بەسوخرە گرتبویانن یان ڕازی کردبو کە ژنە دیلەکان ئازاد بکەن.. کاتێك کە خەڵکی شارەکە دەکەونە بەردە بارانی شاحینەکان و وردکردنی جامەکانیان شوفێرەکان ئەو هەراوهوریایەیان بەهەل وەرگرت بۆ ئازادکردنی ژنەکان.... لەو سەر هەڵدانەدا تەنانەت منداڵە بچوکەکانیش بەردیان ناباوە گیرفانیانەوە و هەڕەشەیان دەکرد کە جامی ئۆتۆمۆبێلەکان دەشکێنن... سەربازەکان کەوتنە گوللە بارانکردنی خۆپیشاندەران. تەنانەت داوای فرۆکەی جەنگی و کۆپتەریان کردبو بۆ گوللە بارانکردنی خۆپیشاندەران.. بەپێی ڕاپورتێك 5کوژراو و12بریندار بون بەڵام ئەوە کۆتایی ڕوداوەکەنەبوو..

بەڵکو ئەو خەڵکە هەڵهاتوە کە لەلایەن ئەمنەوە دەگیران بە ئاشکراو لە بەرچاوی خەڵك گوللە باران دەکران.. درێژەی باسکردنی ئەو کارەساتانە لە بەڵگەنامە بەردەست کەوتووەکاندا دووبارە دەبنەوە لە خوێندنەوەیاندا گیان دەهێننە لەرزین..

لە سیپتێمبەری1991دا دوای کشانەوەی سوپای عیراق لە قورەتو.. لەوێ زیاتر لە40- 50 لەو عەرەبانانە کە دێهاتییەکان بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانیان دەیانبەستن بەپشتی تراکتۆرەوە، بینرابون کە پڕبون لەکراس و شەرواڵی شڕوپکاوە، لەهەمو لایەك سۆل و نەعلی لاستیك کەوتبو، ئەوەش پاشماوەی ژمارەیەکی زۆر بو.. گوندنشینێکی ڕزگار بو باسی ئەو هەزار کەسەی دەکرد کە لەهۆڵە گەورە دروستکراوەکاندابون، هەموویان ماندو برسی بون و دەترسان، هیچ کەسێك نەیدەزانی چی ڕوودەدات، بەڵام من دەمزانی کە شتێکی سامناك بەڕێوەیە، کەس نەیدەوێرا لەگەڵ یەکتری قسە بکەن ئێمە هەموو بێدەنگ بوین و چاوەڕوانیمان دەکرد بزانین چی ڕودەدات..ڕۆژی یەك نان لەگەڵ ئاودا پێمان دەدرا... زۆر لەوە دەترساین کە بمانکوژن.

لە سیمینارێکدا کە ئەفسەرانی ئیستیخباراتی بەڕێوەیان دەبرد بەکۆنە موستەشارێك وترابو پێشمەرگە کافرن و بەوپێیە ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرێت، ئێوە شەڕیان لەگەڵ دەکەن هەرچی ماڵ و ماڵأتێکتان دەستگیربو بۆ خۆتانی ببەن، لەڕوی یاساوە ژنەکانیان بە ئێوە حەلأڵە هەروەها مەڕو مێگەلەکانیشیان.

بەپێی فەرمانەکانی ڕژێم لە ئەنفالدا بە موستەشارەکان گەیەنرابو کە جگە لەچەکی قورس هەرچییەکی تربگرن بۆ خۆیانە هەڤاڵێکی بەعسیش وای بۆ سەرەك جاشێك ڕوونکردبۆوە: پیاوەکان بدەن بە ئێمە شتومەکیش بۆخۆتان.

ئەو نێرینانەی کە تەمەنیان لە15- 50ساڵ بو بەشێوەیەکی ڕۆتینی لە هەموو بەشەکانی گەرمیاندا لەناو چون ژمارەیەکی لەبەرچاویش لە منداڵ و ژن لە باشوردا لەناو سەرنگونکراوەکاندا بوون، زۆربەی ئەوانە لە هۆزەکانی داوودە و جافی ڕوغزایی بوون. لە هەندێ حاڵەتدا گوندی واهەبوە هەموو خەڵکەکەی لەناوبران.

هەر لەم ناوچە بچوکەدا ئەم رێکخراوە دەڵێت بەلایەنی کەمەوە 100 هەزار کورد لەناوبران.. نمونەیەکی تری شێوەی ئەنفال لە کۆمەڵە گوندێکی سەر رووباری زێی بچوک لە ماوەی ئەنفالی چوارەمدا روویدا..

## ئەنفالی چوارەم:

ئەوکاتەی کە چوارەم ئەنفال دەستی پێکرد هێزەکانی عێراق هەرگیز وورەی بەرزی وایان بەخۆوە نەدیبو، بەهۆی گرتنەوەی فاوەوە.. لە 3 مایسدا فرۆکەی مێك گوندی عەسکەری دایە بەر چەکی کیمیاوی نۆ کەسی لە خەڵکی دێیەکە کوشت.. دوای ئەوە لە گۆپتەپەیدا، رزگاربوەکانی ئەم دێیە دەڵێن 300 کەسێکیان ناشتوە لەو لیستەی کە ئامادەکراوە 154 کەس تۆمارکراوە.

رزگاربووەکانی عەسکەر و گۆپتەپە و حەیدەر بەگ بە هەموو لایەکدا بلاوبونەوە لە4-5دا زیاتر لە 50 خێزانی خەڵکی عەسکەر لەلایەن ئەو هێزانەی بە درێژایی رێگا سەرەکییەکە نزیك دەبونەوە. دەستگیرکران و بۆ سوسێ بران.

میلیتاری عێراق بەدرێژی کەناری دەریاچەی دوکان بەرەو باکور دەرۆیشت، هەردێیەك بهاتایەتە رێگەی دوای تالانکردن دەیسوتاند، لە گوندەکانی کلێسە، بنگرد، کانەبی، قیزلو، کانی هەنجیر وگۆمەشین (1680) کەس لیستکراوە کە لەناویان بردن، سەدان کەسی تر لە گوندەکانی: گالنەغاج، جیلامورتە، گردخەبەر، قەسرۆك و قامیش بزرکران. راپۆرتێکی فەیلەقی یەك مەزەنەی ئەوە ئەدات بەدەستەوە کە چەندین کەس لەو خەڵکانە ژن و منداڵبون، هەروەها راپۆرتەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە (6020) پیاو(129) ژن (369) منداڵ جگە لە 37 تێکدەر خۆیاندا بەدەستەوە...

خەڵکانی باکوری رووبارەکە هیچیان دەربارەی لێدانی گۆپتەپە بە کیمیاوی نەدەزانی، چونکە ئەو قەیاغەی کە خەڵکەکە بەکاریان دەهێنا جەیش پەکیخستبو، بەهەلاتنی رزگاربوە ترسلێنشتوەکان کە زوربەیان کوێر بوبون و دەمردن، گوندنشینەکانی باشوری رووبارەکە لەوە بەئاگا هاتن کە ئەنفال گەیشتۆتە ئەوانیش، بەشێ لە خەڵکەکە رایانکرد، بەشێکیش مانەوە، رۆژی ئاینده هێرش بۆ ئەوبەشەش دەستی پێکرد.. فرۆکە بۆمبای بەردەدایەوە، کۆپتەر ئاگاداری دەگەیاند بە دانیشتوان کە بێنەدەرەوە لێبوردنی گشتی هەیە بۆیان.. خەڵکەکە خردەکرانەوە دوای زەوتکردنی پارەوئاڵتون و کەل و پەل کە پێیانبو بە ئیڤا دوردەخرانەوە، هەر لەو کاتانەشدا ئەفسەر و عەسکەرو جاش دێیەکانیان تالان دەکرد ئینجا دەیانسوتاندن... کەدەستیان دەگەیشتە ئەوانەی بۆ چیا هەلاتبون دەوریان دەدان، بۆیە ناچار دەبون بەدەست بەرزکردنەوە خۆیان بەدەستەوە بدەن.

لە دێی جیلەمورت جاشێك دیمەنی ئەوتالانکردنەی زۆر لاگرانبو. بۆیە بە دەنگی بەرز نارەزایی دەربڕیبو، ئەفسەرێك بە تورەییەوە بەرەنگاری بووە وتویەتی: ئەو خەڵکانە رووە و مردن رێدەکەن، ناتوانن ئاڵتون لەگەڵ خۆیان ببەن، یاسای دەوڵەت دەڵێت ئەمانە دەکوژرێن.

دێی وا هەبو نێرینەکان دەگوێزرانەوە بەلام مێینەکانیان بۆ چەند رۆژێك لەبەر چەند هۆیەکی شاراوە دەهێشتەوە... خەڵکی گوندی کلێسەکە لە ئەشکەوتەکاندا خۆیان شاردبوەوە هەموو گیران و سەرنگون کران، کە پەلاماری گوندی گۆمەشین درا هەر کەسێکیان دەستبکەوتایە سەرنگون دەکرا. شایەتێك گێرایەوە کە150کەس ئەنفال کرا، لە6مایسدا فەیلەقی یەك راپۆرتیدا کە ریزە گوندی گومەشین- گردخەبەر و گوندەکانی تری شێخ بزەینی لەگەڵ خاك تەخت کران.

**ناوچەی شوان:** لە کاتێکدا ناوچەی رۆژهەلاتی تەق تەق بەو شێوەیە وێرانکرا، یەکەکانی جەیش بایاندایەوە بۆ شارۆچکە بچوکەکەی شوان و حەفتا گوندەکەی کە چەندینیان لە سێپتێمبەری1987دا وێران کرابو. دانیشتوانەکانیشیان بۆ ئۆردوگاکانی دارەتو بنەسلاوە، لای باشوری دەرەوەی شاری هەولێر راگوێزرابون. ئەمنی کەرکوك ماڵ بەماڵی شارەکەو چەمچەماڵ و بنەسلاوە بەدوی دەربازبوەکانی ئەنفال لە شێخ بزەینی دەگەرا، گوندنشینەکانی تر دەیانبینی چۆن ماڵەکانیان تالان دەکرێ، وئینجا دەسوتێنرێن و لەگەل زەویدا بە بلدۆزەر تەخت دەکرێن، 50 گوندنشین ماوەی 12 رۆژ لە گیای کێوی زیاتر هیچ نەبو بیخۆن، بۆیە بەناچاری رووەو تەق تەق شۆربونەوە، دێهاتەکانی: سەربیری، قەشقەوخور خورە سوتێنراو بەشێك لە خەڵکەکانیان کە لە ناو چیاکاندا خۆیان حەشاردابو، دەوریان گیراو لەناو بران، هەرموتەو تەکیەو تەق تەق سەنتەری کۆکردنەوەی گیراوەکان بوون، هێندە زۆر بوبون بۆ سەنتەری تری وەك ئەمیریە دەنێران کە قەلایەکی عەسکەریی وەك ئەو قەلا لە ژمارە نەهاتوانەبو کە لەهەمو کوردستانی عێراقدا دروستکرابو.. لەناویاندا پاش یەك شەو گیراوەکانی 12 گوندی ئەمبەرو ئەو بەری رووبارەکە بەرەو شوێنێکی نادیار گوێزرانەوە... لەم ناوچەیەش وەك گەرمیان هەندێ جاش یارمەتیی هەندێ لە گیراوەکانیان دابو بۆ راکردن.

## ئەنفالی پێنج و شەش و حەوت

هەموو ناوچە سنورییەکانی پارێزگای هەولێریش لەدوو رامالینی گەورەدا (1977-1978و 1983-1984)دا وێران و چوڵ کرابون و سڤیلەکان راگوێزرابون. لە ناوە راستی مانگی ئاياردا ئەنفال گەیشتە بالیسان... لە ئێوارەدا کاتێ خەڵکی وارا خۆیان بۆ جەژنی رەمەزان ئامادە دەکرد بە چەکی کیمیاوی لێیدرا..

کاتێك رزگاربوەکان گەیشتنە لای هەڵهاتووەکان لە خەڵکی دێیەکە تا لە رووداوەکە ئاگاداریان بکەن، ئیتر بە خێرایی خۆیان گەیاندە گوندەکە. پیاوێك گێرایەوە

که بینیبویان لەناو باخی قەدپاڵی چیاکە 4 یا 5 کەسیان کە بەئاشکرا دەمردن، دوای ئەوەی کەمێکی تر ڕۆیشتن 3 کەسی تریان لە ناو گۆڕستانەکەدا بینیبو کەمردبون، کاتێك گەیشتنە سەنتەری گوندەکە بینیبویان چۆن دێیەکە وێرانکراوە، سۆپەکانیان هێشتا خواردنیان لەسەرمابو، ئاژەڵ لە هەمو ئەو ناوەدا کەوتبون یان مردبون یان لە گیانەڵەدابون. 37 کەس لەو شەوەدا گیانیان لەدەستدا کە منداڵی تەمەن دووساڵانیشیان تێدابوو، ڕزگاربوەکان 33 تەرمیان لە گۆڕێکی بەکۆمەڵ لە دەرەوەی گوندەکە ناشت 30 کەس کە بەعەرەبانەی تراکتۆر دەبران بۆ خەستەخانە مەیدانییەکەی (ی.ن.ك) لە ناو گوندی خەتێدا نێژران. یەکێکیش لە ئۆردوگای سەرچاوە کە تیایدا 50 کەس لە قوربانییەکانی چەکی کیمیاویی شێخ وەسان لە ساڵی پاردا نێژرابون تێدابو، لە کاتێکدا هەموو دۆڵەکە کیمیاوی بارانکرابو، ئەوەش دووەم جار بو کە بالیسان و شێخ وەسان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەو چەکە لێدەدرێن، فڕۆکەی لە سۆڤییەت دروستکراو بۆ ماوەی20دەقیقە شێخ وەسانی بە کیمیاوی و بۆمبای هێشوییدا، بە کیمیاوییەکە لە گوندی بلە 3 منداڵ و دەگوترا لە نازەنین 2 کەس کوژران، بۆمبای کیمیاوی و هێشویی بەسەر گوندی سێراندا داباڕێنرا.. دواییتر لە درەنگانێکی ڕۆژی 23ی ئاياردا یان سەرلەبەیانی ڕۆژی ئایندە هێزی زەمینی لە سێ لاوەو لە هەمان کاتدا هێرشیان دەست پێکرد... ئیتر زۆربەی ئەو سڤیلانەی کە مابون بۆ بەرزایی و چیاکان هەڵاتن... لاکی ئەسپ و مەڕ لە ناو کێڵگەکاندا بڵاوبونەوە، خەڵکی ئاکۆیانیش وەك خەڵکەکەی تر بەسێ لادا بڵاوبونەوە، هەندێ بەپێیان و هەندێکیتر بە ولاخ بەرەو سنوری ئێران، هەندێکی تر پەنای بردە بەر ئۆردوگای حاجیئاوا کە لە 1987دا لەسەر کەناری باکوری دەریاچەی دووکان دروستکرابو. بەشێکی تر هەوڵیان دابو کە لە ناو چیاکاندا خۆیان بشارنەوە... سەدان ئاوارە لە دەشت و دەر بە درێژایی یەك مانگ مانەوە، ئەمانە لە ناوچەی سواراغادابون... کە نەیدەهێشت عەسکەر دەستیان بۆ بەرێت بەناوی ئەوەوە کە جاشی ئەون، زیاتر لەوە سواراغا ڕێگەی تێپەڕبونی خەڵکەکەی بەرەو سنوری ئێران تەئمین کردبو. ئەو خەڵکانەی تر کە گەیشتبونە دێی گولان، بڕیاریاندا کە خۆیان بە دەستەوە بدەن، بەو هیوایەی کە ببرێن بۆ ئۆردوگای حاجیئاوا لەدەرەوەی شارۆچکەی ڕانیە، یەك گروپ لە خۆحەشاردراوەکانی دێی بلە و گەروان کە 50 خێزانێك دەبون پاش خۆشاردنەوەی چەند ڕۆژێك جەیش دەوریان دەدات بەناچاریی بەناوچیاکاندا دەکەونە هاتوچۆ تا گەیشتنە شوێنێك کە دەیڕوانی بەسەرگوندی فەقێیاندا، چوار ڕۆژ لەوێ مانەوە. تا گوللە تۆپەکان لێیان نزیك دەبوەوە و هەراسانی کردن، جارێکی تر کەوتنەوە ڕێ بێ ئەوەی ئاگاداری کات بن، چونکە نەیاندەوێرا بەڕۆژبێنە دەرەوە، تەنها بەشەو بەسەر لوتکە بەرزەکاندا ڕێیان دەکرد، تا بەهیلاکەتیی گەیشتنە دێی جولەمێرگ کە لەژێر کۆنترۆڵی حکومەتدابو، لە خاڵی پشکنینەکانی جولە مێرگ کە جاشیان لێبو و خۆیان لەوە لادابو کە بیانگرن پێشیان وتبون کە: ئێستا کاتی گونجاو نییە بێنە بەردەستی قەسابەکە، هێزەکانی سوپا جیاجیایان کردنەوە و لیستیان کردن و بردیانن بۆ مۆڵگای عەسکەری!سپیلك لەو نزیکانە لە دەرەوەی خەلیفان هەر هەشت یا نۆ خێزانێك لە چادرێکدا لەناوچەیەکی تەلبەندکراودا دانران، ژن و منداڵەکانی دێی بلێی خوارو کە خۆیان بەدەستەوە دابو دیسان لەوێ بون، پیاوەکانیش کە لەدواییدا خۆیان تەسلیم کردبو هێنران بۆ سپیلك.. بلێی خوارو لە ماوەی ئەنفالدا دووجار ژمارەیەکی زۆر لە سڤیلەکانی سەرنگون کران.. لە بروسکەو دۆکۆمێنتە ڕەسمییەکانی عیراقدا ئاماژە بۆ ئەوانە کراوە، ئەوەش ئاشکرایە کە ئەو سڤیلە گیراوانە پێش لەناوبردنیان لە گرتوخانەی حکومەتدابون.. هەندێك لە ئەنفالکراوەکانی پێنجەم هەر لە سپیلك ونکران، هەندێکی تر لە حەپسخانەی ڕەواندوز بینرابون، خەڵکانی تر لە گرتوخانەی ئەمنی هەولێردا ونکران.. هەر وەکو قۆناغەکانی چوار ئەنفالەکەی تر، هەمان درێژەی ڕوداو دوای روداو دووبارە دەبێتەوە، لەم شوێنە کاتییانەی گرتنەکاندا، دیلەکان دەخزێنرانە ناو شاحینەی ئیڤاوەو هەمیشە ڕوەو باشور بۆ لای کەرکوك گوزەریان دەکرد...

دێی گارەوان نمونەیەکی وێرانکردنی دێهاتەکانی کوردستانە.. سەرەڕای ئەوەی دێیەکە تالانکرا، بیناکان بە دینامێت تەقێنرانەوە و لەگەڵ زەویدا تەختکران، بۆری ئاو کە لەکانییەکانەوە ڕاکێشرابوون تالانکران، هەرچی درەخت هەبوو لەبندا بڕییانەوە، کورە هەنگەکانیش نەمان.. بە کورتی هەرچی شوێنەواری ژیان هەبوو لەناویانبرد تەنانەت گۆڕستانەکەشیان بە دینامێت تەقاندەوە..

لەگەڵ ئەو هەموو دڕندەییانەشدا بەربەرەکانی ئەنفال بەردەوام بوو، بۆیە نەیتوانی سەرکەوتنی گەورە بەدەست بهێنێ و پەکخرا.. تەواوکردنەکەشی بەهێرشی پاکسازیی لە دۆڵەکانی ئالان و حەوزی بالیسان و ناوچەی سماقولی، مەلەکان، وەرتێ و هیران ئەنجامدا.. تەنانەت دوای کشانەوەی پێشمەرگەش، جارێکی تریش چەکی کیمیاوی لە دژی ناوچەکە بەکارهێنرا..

ئەو خەڵکانەش کە لە دۆڵی سماقوڵی مابوونەوە زۆریان بە هاندانی موستەشارێك خۆیان بەدەستەوەدابوو، داوای چەکیان لێکردبوون بەڵام لەبەر ئەوەی زۆریان سڤیل بوون چەکیان نەبوو، بەبیانووی ئەوەی کە لێبوردن بیانگرێتەوە زۆریان لێکردن کە بچن حەشارگەی چەکی شارراوەی

پێشمەرگە هەڵبدەنەوە تەنانەت ڕێگەیان ئەدان کە چەك لە جاشەکان بکڕن، دوای ئەوەش ناچاریانکردن کە ئیعتیرافێك مۆربکەن کە دان بەوەدا بنێن کە لەڕاستیدا پێشمەرگەبوون.. موستەشارێك گێڕایەوە کە: هەرئەوەندەی ئەم گەمە سامناکە تەواوبوو، هەموو ئەم خەڵکە لەڕێگەی تۆپزاواوە سەرنگونکران، لەماوەی ئەو چەند هەفتەیەدا کەم ڕۆژ هەبوو هێرشی چەکی کیمیاوی نەکرێت، تەنانەت دوای 1988/8/8 کە ئێرانییەکان مەرجەکانی سەدام حسەینیان بۆ ئاگر بەست قەبووڵکرد.. هەرچەندە پێشمەرگە لەهەلاّتنی تەواودا بوون دیسان جەیش نەیتوانی ڕێگە سەرەکییەکەی دەربازبوونیان لێدابخات، فەرماندە هەوادارەکانی جاشیش وەك سواراغا یارمەتی خێزانەکانی دابوو بۆ ئەوەی بگەنە سنوور وە لە 8/28 دا ناوچەکە لەلایەن جەیشەوە کۆنترۆڵکراو هیچ بەرگرییەك لەئارادا نەما ئەوکات دوا ئەنفال دەستی پێکرد..

## نموونەی کاری تیرۆر..

بەڕێوەبەری ئەمنی هەرێمەکە لە هەولێر بە تەلەفۆن داوای لە پارێزگاری سلێمانی کردبوو کە بەڕاپۆرتێك چالاکییەکانی خۆیانیان بۆ بنووسێت، ئەویش بە نامەیەکی نهێنی و شەخسی ڕاپۆرتەکەی بۆ دەنووسێت کە ئەم ژمارانەی تیا باسکرابوو:

19 تاوانبار لەگەڵ 18 کەس لە خێزانەکانیان گوللە بارانکران بەپێی ئەو فەرمانەی کە لە ئۆفیسی علی حسن المجید-ەوە هاتبوو 19 کەس نێررا بۆ گوللە بارانکردن لەبەر ئەوەی لەناوچە قەدەغەکراوەکاندا دەستگیرکرابوون.

47 کەسی تێکدەریتر لە مەحکەمەی سەورە حوکمی ئیعدام دران...

2532 کەس، 1869 خێزان کە سەرجەمیان 9030 کەس بوون لەناو ئەوانەدا بوون کە لە ئۆپەراسیۆنە قارەمانەکەی (ئەنفال) دا گیرابوون وە ڕەوانەی کامپی سوپای میللی پارێزگای تەئمیم کران، واتە بۆ تۆپزاوا.. یەکێك لە گیراوەکانی ئەم سەنتەری کۆکردنەوەیە دەڵێت:

ئێمە هەموو برسی و بێ هێزبووین، هەر تەقریبەن مردبووین، چەند ڕۆژێك بوو هیچمان نەخواردبوو، تەنانەت هەستمان بە کاتیش نەدەکرد، نەماندەزانی ئەوانە چییمان لێدەکەن، کاتێ گەیشتینە بنکەکەیان، بەبڵندگۆ ئاگادارکراین کە کەس دانەبەزێت... ئینجا یەکەمجار پیاوەکانیان دابەزاند، قۆڵ بەستیان کردین، پیر بە جیاو لە 15 ساڵ بۆ 50 ساڵیش پێکەوە، ژن و منداڵیش بەجیا، یەکێکی تر دەڵێت: لە ناوەڕاستی ئەپریلدا ئێمە لە قەلاّکەی قۆرەتووەوە بۆ تۆپزاوە گوێزراینەوە، هەزاران گیراوی تری لێبوو، بە هیچ جۆرێك نەماندەزانی چی ڕوودەدات، نەماندەتوانی قسە بکەین، ترس ڕێی نەئەداین قسە بکەین، تەنها دەنگێ کە دەمانبیست دەنگی ئەو ئەفسەرە بوو کە دەستی دەکرد بەناو خوێندنەوە: تاوانبار عەلی ڕەحمان، تاوانبار مستەفا تاهیر... تاوانبار... تاد.

ئینجا لاوەکان پۆلێن دەکران بەسەر گروپی بچووکتردا.. دوایی دەپشکێنران، هەرچی شتێکیان پێبوایە لێیان زەوتدەکرا، لێکۆڵینەوەیەکی کورت و بێ بایەخ دەکرا ناوت...؟ ناوی بوك و دایکت، تەمەن، ژمارەی براو خوشك و منداڵەکانت، ماوەی بەشداربوونت لەشەڕدا. لە دواییتر دیلەکان دەخزێنرانە هۆڵی گەورە گەورە، هەر هۆڵەو بۆ دانیشتوانی یەك ناوچەبوو. ڕۆژانەو سەرجەم لە 4-5 هەزار کەسیان تێدادەبوو، هۆڵەکان بە چیمەنتۆ قایم دروستکرابوون، 6 بە 30 مەترێك دەبوو، زۆر قەڵەباڵغ بوو، نەماندەتوانی بچینە دەرەوە... دەرگا و پەنجەرەکان بە شیشی ئاسن چنرابوو، بێ شووشە بوون، جێگای ڕاکشان نەبوو، بە درێژایی شەو بە چیچکانەوە دادەنیشتین، بە هیچ جۆرێك تەوالێت، نەبوو، لە ڕۆژەکاندا تەنەکە بۆ میزکردن دادەنرا، هەر لەناو هۆڵەکانیشدا میز دەکرا... زۆر کەس تووشی سکچوون دەبوون...

## نموونەی کۆمەڵکوژی خەڵکی کورد لە بیابانەکانی ڕۆژئاواو خوارووی عێراقدا...

ئەهامەتیی ئەو گروپە زۆرانەی کە بە کاروانی پاس ڕەوانەی گۆڕەپانی کۆمەڵکوژی دەکران.. بە عەقڵی مرۆڤ نامۆن، تا ئەو ڕادەیەی کە گیراوەکان تەنانەت لە ناو کاروانی بەرەو مەرگیشدا لە ئاو خواردنەوە بێبەش بکرێن، ناچار لە پێڵاوەکانیاندا میزی خۆیان بخۆنەوە، ناو ئۆتۆمبیلەکان بکەن بە ئاودەست. عزیز و عومەر و ئیبراهیم و مستەفا لەو دەگمەنانەن کە بە موعجیزە لە ناو جەرگەی قەسابخانەکاندا ڕزگاریان بوبوو... یەکێکیان کە ناوی عەزیز بوو بۆ ئەو ڕێکخراوەی گێڕاوەتەوە کە لە نێوان 15-18 ئەپریلدا، یەکەم ڕۆژی مانگی ڕەمەزان کاروانی مردن بە پاس سازکرا، کە بە 18 پاس مەزەنەیان کردووە، هەر پاسە 44 یان 45 کەسیان تێدابوو، ئەوەی کە مستەفای تێدا بوو لە 50-60 کەس بوون، میزو پیسایی کۆنیان تێدا مابوو، ناوەوەی پاسەکان وەك دۆزەخیان لێهاتبوو. دیلەکانی کاروانەکانی پێشتر لەسەر پشتی کورسێکان پەیامی کورت کورتیان نووسیبوو: بۆ (سنووری سعودیە) (بۆ سنووری کوێت) (بۆ عەرعەر). بە مەزەنەی عەزیز پاسەکەیان 35 پاسی ناو ئەو کاروانە بوو، کە گەیشتنە شوێنێك یەکێکیان شاری فەللوجەی ناسیبوەوە، عەزیز لەدەری ئەم شارە بینیبوی کە کاروانی پاسەکان بوون بە دوو بەشەوە، ئەو بەشەی ئەمان بەرەو ڕەمادی بووەوە. لەوێش تێپەڕیکرد، دوا ماوەیەکی زیاتر لەسەعاتێ، بەلای ڕاستدا بەسەر پردێکدا تێپەڕین کە پێ دەچێت فورات بووبێت. لە کۆتایی سەری پردەکە وەستان، دوایی 9 ئۆتۆمبیل کە بلدۆزەریان لە پێشەوەبوو هاتن ئینجا بە جادەیەکی

قیرتاوی هاوتەریب لەگەڵ فوراتدا ڕووەو ڕۆژئاوابونەوە. پاش نیو سەعاتێك کاروانەکە لای کردەوە بۆ سەر ڕێگایەکی گڵ. دیلەکان دەستیان کرد بە پاڕانەوە لە خواو لەژێر لێوەوە بە لاڵییەکەوە شایەتمانیان دەهێنا، دەگریان و دەیان پرسی ئاخۆ چییان کردبێت وا ڕووبەڕووی ئەم چارەنووسە دەبنەوە، هەروەك نەریتی موسڵمانەتی ئەم لاو ئەو لای یەکتریان ماچ دەکرد و داوای لێبوردنیان لە یەکتری دەکرد... دەورووبەر نزیك لە تاریکبوون دەبووەوە... پاسەکەی عەزیزو هاوڕێکانی بە لمەکەدا ڕۆچووە خوارەوەو چەقی. یەکێکیتر کە دوایەمین بوو، تیژ بەلای ڕاستدا پێچی کردەوە تا لەو چەقینە خۆی لابدات.. ئەویش لە لمەکەدا چەقی. ئیتر بەندەکان بە تەواوی دەیانزانی چییان بۆ ئامادەکراوە، بۆیە هیچ مەودایەك بۆ خۆنەویستی نەمابوو. ئیتر بەسەرگەرمییەکەوە کەوتنە قسەکردن و پلان دانان بۆ خۆڕزگارکردن، دەیانزانی کە نەگاردەکە وە نە شۆفێرەکە کوردی تێناگەن.. ئەمانە 35 کەسێك دەبوون گاردەکان گەیشتنە لایان بۆ کوشتنیان.. ئیبراهیم لە گێڕانەوەکەیدا وتی: ئەگەر لەو سی‌و پێنج کەسە یەکێکیشمان ڕزگاری ببوایە ئەوا ئەو هەوڵەی دەهێنا.. لەناو بێدەنگی کوتوپڕدا دەنگی دەستڕێژو گرمەو چەقە چەقی بلدۆزەر گوێیانی پڕدەکرد. پاش 20 دەقیقەیەك چەکەکان بێدەنگ بوون. لەناو تاریکاییەکەوە بلۆدزەرێك بە زەحمەت بەرەو لای پاسەکەمان تەکانی دەدا، لەپشتەوە وەستا، کەوتە پاڵنانی پاسەکەوە تا دەریبهێنێت، بەڵام تایەکانی زیاتر ڕۆدەچوو، ئینجا کەوتە هەوڵی بەرزکردنەوەی پاسەکە، عەزیز وای مەزەندەدەکرد کە بۆ ئەوە بوە تا پاسەکە بۆناو چاڵەکە قلێپکاتەوە.. سەرەنجام بلدۆزەرەکە پاسەکەی بۆ پێشەوە دەرهێنا. دیلێکیان توانیبوی سەعاتەکەی لە تاڵانی و زەوتکردن قوتاربکات، بۆیە دەیانزانی کات 7.30 ی ئێوارەیە، دنیا تاریك بوبو... دوجاری تر ڕیزە دەستڕێژو گوللە باران و زریکە زریك بیستترا، دوای نزیکەی سەعاتونیوێك، لە کاتێکدا کە عەزیز و هاوڕێکانی لە ترسا دەیانناڵاند، سێ دەستە لە دیلەکانی پاسی دووەم ڕاکێشرانە ناو ئەو حەوزە ڕووناکییەوە کە لایتی ئوتمۆبیلەکان دروستیان کردبوو، تیمێکی تیر بارانکردن بەبەرگی ڕەسمی و کلاشینکۆف و دەمانچەوە، کەوتنە دەستڕێژ لە بەندەکان، کاتێك تەقە وەستێنرا، تەرمەکان ڕاکێشرانە ناو چاڵی تازە هەڵکەنراوەوە، ئەم سەرنجی ئەوەیدا کە هەندێك لە لاشەکان هێشتا دەجوڵانەوە..

لەوە دەچوو نۆرە هاتبێتە سەر بارەکەی ئەم پاسەی ئەمان کە ئەم ڕووداوە سەرنجڕاکێشەرەی تێدا قەوما..

پلانی دیلەکان بەم جۆرەبوو: کاتێك یەکەم گارد دەرگاکە دەکاتەوە بۆ بردنی دیلەکان بۆ کوشتن، بەهێزترینیان هەڵمەتی بۆ بەرێت تا چەکەکەی لێبسەنێت و ئینجا دەرگاکە بەکراوەیی بهێڵێتەوە. هەرچەندە زۆربەی دیلەکان لەوە لاوازو بێهێزتربوون کە بتوانن هاوکاریی بکەن، بەڵام عەزیزو عومەر و چەند کەسێکی تریش حەزیان دەکرد ئەو کارەبکەن. بۆیە کەوتنە چاودێریکردنی ئەو دەرگایەی کە هەردوو بەشی پاسەکەی لەیەك جوێ دەکردەوە، برایم لە دواوە و بەترسەوە چاوەڕوان بوو، ئامادەیش بوو کە ئەگەر بتوانێت پەلامار بدات. لەکونی پەنجەرەکەوە عەزیز دوگاردی بینی کە بەدەمانچەوە لەمبەرو ئەوبەری دەرگاکەوە خۆیان گرتووە، یەکێکی تریش کە تفەنگی کلاشینکۆفی بەدەستەوەیە لای کورسی شۆفێرەکەوە وەستابوو، لە هەمانکاتدا گاردی چوارەم بە کلاشینکۆفێکەوە پێیەکی لەسەر پێپلیکەی پاسەکەو ئەویتری لەسەر زەوییەکە، پاسەوانی دەرگاکەی دەرەوەی دەکرد، دوای چەند ساتێکیتر حەرەسە بەرگ ڕەسمیی پۆشەکان کە کابرایەکی چەتەوڵی ئەستووربوو، قفڵی دەرگاکەی بەلای قەمەرەکەی شوفێرەکەدا کردەوە، هەر ئەوەندەی ئەو کارەیکرد، دیلێك کە ناوی سەلام بوو، هەڵمەتی بۆ پێشەوە برد بۆ ئەوەی تێیبسرەوێنێ، بەڵام پاسەوانی دووەم دەمانچەکەی لێخستەکارو دەستبەجێ سەلامی کوشت و دەرگاکەی داخستەوە. عەزیز گوێی لە یەکەم حەرەس بوو، بڕیاریدا یەکەیەکە دیلەکان ئیعدام بکات...

بۆ کۆنترۆڵکردنی دۆخەکە، عەزیز ئامۆژگارییەکانی خۆی دەرکرد، ئەوکاتەی گاردەکان یەکەم دیلیان بردەدەرەوە، عومەر قورسایی خۆی بخاتە سەر دەرگاکە بۆ ئەوەی ڕێگە لە داخستنەوەی بگرێت، پیاوەکانی تریش خۆیان هەڵبدەنە ناو ئەو کەلێنەوە، حەرەسە چەتەوولەکە گەڕایەوە، دیلێکی ڕاکێشایە ناو دەرگا کراوەکەوە، بە پارچە قوماشێکی سپی هەردووچاوی بەست، کاتێك لای کردەوە بۆ ئەوەی پیاوەکە ڕابکێشێتە ئەولاوە، شەش دیل هورووژمیان برد بۆ پێشەوە، چەند کەسێکیان قایشی تفەنگی گاردەکەیان گرت، بەڵام ئەو بە توندی قۆناغ و لوولەی تفەنگەکەی گرتبوو، عەزیز هاواری لە دیلێکیتر کرد کە مشتە کوڵەیەك بدات بە دەم و چاوی ئەفسەرەکەدا، هەرچەندە پیاوەکە وەك هەموو کەسێکیان بێ هێزبوبو، چونکە چەندین ڕۆژ بوو نانیان نەخواردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا توانی لەچاوێکی ئەفسەرەکە بسرەوێنێت، عەزیزیش تفەنگەکەی لەدەست سەند، بەڵام ئەفسەرەکە توانی کە مەخزەنەکەی لێبکاتەوەو لە پشتی خۆیەوە فڕێی بداتە دەرەوەی پاسەکە، وە وا لەچەکەکە بکات کە سودی نەمێنێت.. دیلەکان هورووژمیان بۆ دەرگا کراوەکە برد، بەڵام ئەو گاردەی لەلای کورسی شوفێرەکەوە وەستابوو ڕێگەکەی بڕی، تەقەش دەستی پێکرد، دوو پیاو لەسەرو عەزیزەوە کوژران، دیلێکی تر هەوڵیدا لەپاسەکەوە بازبدات بەڵام ئەویشیان کوشت، لەکاتێکدا عەزیز هەوڵی دەربازبوونی ئەدا، چاوی لێبوو کە، دووەم

کەس لە چوار گاردەکە، ئەوەی کە سەلامی کوشت، بەملاوئەولادا دەکەوت و رووەو ئەم دەهات، خوێنێکی زۆریش لە شانی دەهات، کابراکە هاواری دەکرد "ئەبو سالح وەرە یارمەتیم بدە" وادیاربوو لەلایەن گاردێکی ترەوە بریندار کرابوو، عەزیز هەوڵی دا تا بگاتە دەمانچەکەی کابرا، بەڵام بۆی نەدۆزرایەوە، لەجیاتی ئەوە لەگەڵ کابرادا کەوتە زۆران، باڵە بریندارەکەی باداو پاسەوان بێدەنگ کەوت، دیاربوو لەسەر خۆی چووبوو، لە هەمان کاتدا هەموو ئەو سەربازو پۆلیسانەی لە دەرەوە بوون کەوتنە داگرتنەوەی پاسەکە بە فیشەک، ئەو پیاوانەش کە لەبەشی نەفەرەکاندا بوون هەموو لەژێر کورسی پاسەکەدا پاڵکەوتبوون، لەناو پاسەکەدا لاشە لەسەریەک هەڵدرابووەوە، ئیبراهیمیش نەرمەی سمتی راستی پێکرابوو ئێشێکی زۆری هەبوو، ئەوەشی دەزانیی کە چیتر ناتوانێ بەچاوی راستی ببینێت، لەو هەڵاو بگرەدا عومەر خۆی گەیاندە ژێر ئوتمۆبیلێك، لەکاتێکدا فیشەك لە هەموو لایەکی ئوتمۆبیلەکەوە دەگەڕایەوە، عەزیز هەستی کرد کە قاچی بەپارچەی ئاسنی پەڕیو برینداربووە، کاتێك لەو شوێنەدا کەوتبوو، لەناو تەقینەوەی فیشەکدا گوێی لە دەنگێکی نامۆ بوو، لەیەکەم جاردا نەیتوانی شوێنەکەی دەستنیشان بکات، بەڵام دواتر زانیی کە ئەوە دەنگی خوێن بوو دڵۆپ دڵۆپ لە پاسەکەوە دەچۆڕایە خوارێ، نزیکەی هەموو دیلەکانی هاوڕێی کوژرابوون..

چیرۆکی مستەفا، دیمەنێکی تری ئەو تراجیدیایەبوو کە کۆتایی بۆ نەبوو.. سێ ئوتۆمبێلی تر کە لە کەرکوکەوە لەگەڵ ئەم کاروانەدا، هاتبوون لەناو ئەو چاڵە بچکۆلەیەی عەزیز لە پەنجەرەی شۆفێرەکەوە دیبووی، وەستان.. کات دەمەو مەغریب بوو کاتێك حەرەسەکە دەرگای پشتەوەی ئەو پاسەیان کردەوە کە مستەفای تەمەن 38 ساڵەو باوکی نۆ منداڵ و خەڵکی گوندی تۆپخانە کە لە تۆپزاواوە پێی هاتبوون، خستە سەر پشت.. دوو دوو پیاوەکان ڕاکێشرانە دەرەوە. مستەفا ئاگاداری دەستپێژە بەردەوامەکان بوو کە دیاربوو لە یەك کاتدا لە هەموو لایەکەوە دەهات.. حەرەسەکان پشکنینێکی خێرای مستەفایان کرد، هەرچی پێ هەبوو لێیان سەند جگە لەو دوو سەد دینارەی کە لە تۆپزاواوە لەناو جلەکانیدا شاردبوویەوە بێئەوەی بدۆزرێتەوە.. هەستیکرد زۆر بە توندیی بە پشتێنەکەی خۆی قۆڵی لەپشتەوە بەستراوەتەوە، بەجامانەکەی چاوی بەستراوە، هەروەها چاوی هاوڕێکەشی، فەرمان بە دوو دیلەکە درا کە بکەونە ڕێ. لەبەر ئەوەی مستەفا دەیزانی بەرەو مردن دەڕوات بۆیە کەوتە خوێندنەوەی (ئایەتەلکورسی) نزیکەی بیست یاردەیەك بەرەو پێشەوە ڕۆیشت، ئینجا هەستی بە هەڵتوتاندنێککردو کەمێك لاربووەوە، کەمێك بەولاوە دەنگی گاردێکی بیست، فەرمانی بە دوو دیلەکەدا کە لەسەر پشتیان پاڵ بکەون، کاتێك مستەفا فەرمانەکەی جێبەجێ دەکرد، هەستیکرد کە وەك لاشەیەکی بێ جووڵە کەوتۆتە نێوان هاوەڵەکەی و یەکێکی ترەوە.. دەنگی ماشێنی بلدۆزەرەکەش کە هاڕەی دەهات گوێی لە تەنیشتییەوە هەستی بە لەرینەوەو ناڵینێك دەکرد.. دەنگی تەقە نەما.. مستەفا گوێی لە دەنگی حەرەسەکان بوو دوور ئەکەوتنەوە، ئەوسا کە دەرکیکرد گوللەی بەرنەکەوتووە مستەفا کەوتە ڕێ، چەندی توانی ڕێیکرد، تا گەیی بە شوانێك، شوانەکە بۆی باسکرد کە ئەو کوردێکی ئێرانەو لە ئۆردووگەیەك لەو نزیکانە نیشتەجێکراوە.. شوانەکە ئەدرەسێکی ناو ئۆردوگەکەی دایەو فێریکرد کە چۆن دزە بکات بۆ ناو ئۆردوگەکە بەبێ ئەوەی حەرەسەکان ببینن. کە گەیشتە ماڵەکە، بۆنی نانی تازە گەیشتە لوتی. ژنێکی خانەقینی بوو، وتی دانیشە ئێستا باوکم دەگەڕێتەوە، کە پیاوەکە گەیشتەوە ماڵی، مستەفا داوای ئامۆژگاری گەیشتنە بەغدای لێکرد، ئەویش وتی بەم زوانە پاسێك دەچێت بۆ ڕومادی، هەندێك ئامۆژگاریکرد کە چۆن خۆی لە خاڵی پشکنینەکان بپارێزێت، هەندێ خواردن و جووتێك نەعلی پێدا. کاتێك مستەفا گەیشتە دەروازەی ئۆردوگاکە پاسەکە لە دەرچووندا بوو، ئیشارەتی بۆ شۆفێرەکە کرد وەستا، کاتێك سەرکەوتە ناو پاسەکەوە، یەکێکیانی ناسیەوە ئەویش عەزیز بوو.

پاش قەسابخانەی ناو پاسەکە، عەزیز توانیبووی خۆی دەرباز بکات بۆ ناو تاریکاییەکە، بەسەر لێشێواوی و شڵەژاویەوە، پێش ئەوەی پێبنێتە ناو خەندەقێکەوە، بەسەر لاشەیەکدا کەوتبوو کە خوێن لە لوتیەوە دەهاتە دەرێ، بەڵام هێشتا هەناسەی ئەدا. ئەم چاڵە زۆر لەوەی کە مستەفای تێدا بوو بۆ ئیعدامکردن، جیاواز بوو، عەزیز بە بیریدا دەهاتەوە کە 10—12 پێ قووڵ و تەنها شەش پێش پان بوو وای بۆ دەچوو کە 400 تەرمێکی تێدا بێت. بەخۆکشان سەرکەوتبووە سەرەوەو بۆ ناو بیابانەکە هەڵهاتبوو.

لە ترسی ئەوەی بناسرێتەوە، جلەکانی داکەندبوو وە کردبووی بە بوخچەیەك. ئەمیش پێڵاوەکانی لێ بەجێدەمێنێت. ئەیگێڕایەوە کە من تەنها بەو خەندەقانەدا تێدەپەڕیم کە پڕبوون لە لاشە، سەرتاپای ئاوچەکە خەندەقی پڕ لە لاشەبوو.. لەشوێنێکدا لە جادەی قیرتاو پەڕیبووەوەو گەیشتبووە ئاوێکی گەورە، کە دانەویبووەوە تا ئاو بخواتەوە، بینی کە نزیك دەبووەوە، ترسا لەوەی کە یەکێك بێ لەلاندرۆزەرەکانی تیمی ئیعدام کردنەکان، ئیتر خۆی فڕێدەداتە ناو ئاوەکەوە، دەستی کردبوو بە مەلە ڕووەو کەنارە دوورەکە، لە کاتێکدا تا ناو قەدی ئاو بوو بە خۆشییەوە تێبینیکرد کە ئۆتۆمۆبیلەکە بای دابووەوە بۆ لایەکیتر، ئیتر بەرەو ئەو ڕووناکاییە ڕۆیشت. ئەمە هەمان کامپ بو کە مستەفا گەیشتبویە. دواتر عەزیز زانیبوی کە ئەم کامپە هەزاران

خەڵکی قەسری شیرین-ی ناوچەی سنووری لێبوو، کە وەکو بارمتە لە سەرەتای ڕۆژانی جەنگی ئێران و عێراق گیرابوون و هێڵرابوونەوە. کامپەکە بە تەلی درکەزی چواردەوری گیرابوو، قەدەغە بوو کامپەکە بەجێ بهێڵرێ... عەزیز کەوتە لێدانی ئەم دەرگاو ئەو دەرگا بۆ یارمەتی، بێئەوەی دەرگای لێبکەنەوە، تا پیاوێکی پیرو دوو کوڕەکەی بەوە ڕازیبوون کە هەندێ شۆربای فاسۆلیاو نانی بدەنێ، بەڵام بە هیچ جۆرێک نەیاندەوێرا داڵدەی کوردێکی شڕەی ڕاکردو لە ماڵەکەیان بدەن. لەسەرەتای بەرەبەیان عەزیز ماڵ بە ماڵ گەڕاو دەپاڕایەوە، تا پیاوێك بەوە ڕازیبوو کە بیگەیەنێتە گەراج دوای ئەوەی خۆی گەیاندبووە ڕومادی و لەوێوە بە پاس ڕوەو بەغدا، کە لەگەڵ مستەفادا یەکتریان بینییەوە، لە گەڕاجی بەغدا مستەفا وای دەزانی کە ئەفسەرێکی ئیستخبارات کە لە تۆپزاوە بینیبووی دەناسێتەوە بۆیە ڕایکردە ناو قەڵەباڵغییەکە.. سەرەنجام گەیشتە کەرکوك....

بە دەیان شوێنی تر گۆڕەپانی کارەساتی لەو بابەتە بوون، لەو بیابانەی ڕۆژئاوای عێراق هەر وەك ئەم ڕێکخراوە دەڵێت:

لاشەی ژمارەیەکی زۆر لە قوربانییەکانی ئەنفال لە گۆڕی بە کۆمەڵدا لە دەرەوەی شاری ڕومادی عێراق کەوتوون. ئەم گۆڕەبەکۆمەڵانە لە ناوچەیەکی بیاباندا کە مەحاڵە ئەمڕۆ چاودێرو پشکنێنەرانی بیانیی بیانگەنێ...

دیسان لە خواروی عێراق لە سەماوەو دەوروبەری نوگرەسەلمان و جێیتر چەندین تراجیدیای لەم بابەتانەی تیا کراوە...

زیاتر لەوانە چەند شوێنێکی دیار لەسەر سنووری کوردستان گەلێ کارەساتی تری لەو جۆرانەی تیا ڕویداوە لەوانە هەر وەك ڕێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ تۆماریکردون:

ڕاپۆرتی دوورو درێژ دەربارەی سێ جێگەی بە کۆمەڵ گوللە بارانکردن کە باندیان لەسەر گیراوەو چنگ کەوتون. یەکێکیان لە نزیك شوێنەواری ئارکیۆلۆجی (Hatra) یە (حەزەر) کە دەکەوێتە 60 کیلۆمەتری باشووری شاری موسڵ.

جێگەیەکی تری کۆمەڵکوژکردنی کورد لە نزیك چیای حەمرین بوو، لە باشووری توزخورماتوو، ڕووداوێك کە لە زمانی شایەتێکەوە، باسی (40) پاسی پڕکراو لە کورد دەکات کە حەرەس جمهوری حەپسیکردبوون، لەسەر ڕێگایەکی گڵ کە بۆ ڕووباری عوزێم دەچێ گوللەبارانکران.

ڕاپۆرتێکیتر باسی تیربارانکردنی بەکۆمەڵ لە بەشێکیتری چیای حەمرین دەکات کە لە نێوان تکریت - کەرکوك دایە، ژمارەی (2000) ژن و منداڵ بوون، ئەم ڕێکخراوە دەڵێت: لەو لیستی ناوانەی ئەنفالکراوەکان کە دراون بەم ڕێکخراوە، دەردەکەوێت کە زیاتر لەنیوەی ئەوانەی لە باشووری گەرمیان و دۆڵی زێی خواروو سەرنگونکران ژن و منداڵ بوون، بەمنداڵی شیرەخۆرەشەوە، ژمارەیەکی زۆریتر لە برسا یان بەهۆی نەخۆشییەوە لەسەر چیاو ناو دۆڵەکان یان لە حەپسخانەکاندا مردن.

ئەوانەی لە گرتووخانەی نوگرەسەلمان سەرفرازبوون گێڕاویانەتەوە کە ژمارەی یەك کاروان بۆ ئەو ناوچەیە (150 تا 200) ئۆتۆمۆبیل بووە، یەکێك لە بەندەکان، لەماوەی ژیانی ناو نوگرەسەلماندا (517) مردوی ژماردووە، ڕۆژانە 4-5 پێنج کەس مردوون، بێئەوەی شەرەفی ناشتنی ئاسایی ڕێگە پێبدەن.

دیلێکی ڕزگاربوویتر (تەیموور) باسی کاروانێکیتر لە کاروانی مەرگ لە خواری عێراق دەکات. ڕێکخراوەکە پێشەکی باسی گرتنی تەیموورو کەس و کاری و گواستنەوەیان بۆ قۆرەتوو ئینجا بۆ تۆپزاوە دەکات، ژیانی ئەو ماوانەو دوا ڕۆژو بانگکردن و خستنە ڕێی کاروانەکە کە بە (30) ئۆتۆمۆبیلی دەداتە قەڵەم، باسی ژیانی ڕێگەو مردنی چەندین منداڵ دەکات...

دەڵێ: کاتێك کاروانەکە وەستا شەو داهاتبوو، یەکە یەکە چاوی دیلەکانیان دەبەستەوە... سەر لە نوێ کاروان کەوتەوە ڕێ، کاتێ پاسەکە کەوتە هەڵبەزو دابەز ئەوە وای نیشان ئەدا کە بەسەر جادەی گڵدا بۆ ناو بیابان گوزەر دەکەن. دوای نیو سەعاتی تر پاسەکە بۆ جارێکیتر وەستا... تەیموور سەیری کرد هەر ئۆتۆمۆبیلە بەرێکی لەپاڵ چاڵە قەبرێکی خۆیدا وەستاوە.. لەپشتی هەر چاڵێکەوە گردۆڵکەیەك گڵی تازە بەرزبۆتەوە... حەرەسەکان کەوتنە پاڵنان بەدیلەکانەوە بەرەو چاڵەکان... ئەم لەناو ترس و تۆقاویدا لەدایك و خوشکەکانی جیابووەوە... دەستبەجێ بە کلاشینکۆف کەوتنە گوللەبارانکردن، شانی لای چەپی پێکرا، سەرەڕای ئازارەکەی بەلارەلارە بەرەو ئەو سەربازەی گوللەی پێوەنابوو خۆی کێشکرد، کە سەرنج دەدات کابرا فرمێسك بە چاویدا دێتە خوارێ، کاتێك ویستی دەست بە کابراوە بگرێت تا لە چاڵەکە بێتە دەرەوە، ئەفسەرەکە بە سەریدا قیڕانی و بە عەرەبی فەرمانێکی پێدا، ئیتر عەسکەرەکە سەر لەنوێ کەوتەوە تەقەکردن. گوللەیەکی تر بەر سەرەو کەمەری لای ڕاستی کەوت. ئەمجارە بێدەنگ لێیکەوت... دیاربوو عەسکەرەکان بەوە ڕازی بون، بۆیە کەوتنە دورکەوتنەوە، بە جۆرێك کە تەیموور هیچی نەدەبینی، بەڵام لە تاریکاییەکەدا هەر کەمێك بەو لاوە دەنگێ دێتە گوێی، لە تەنیشتییەوە هەستی بە جوڵانەوەیەك کرد، سەرنجی لێدا، کچێکی گەنج بوو، لەوە دەچوو کە بەرنەکەوتبێت. ئەم بە چرپە پێیگوت: باڕابکەین، کچەکە وەڵامی دایەوە: ناتوانم زۆر لە عەسکەرەکان دەترسم، بێ ئەوەی زیاتر لەسەری بڕوات کەوتە هەڵگەڕان بەسەر گڵەکەدا... هەرچەند ئەمیش وەك کچەکە زۆر دەترسا نەیدەتوانی بۆی دەربچێت، چونکە لاندکرۆزەرەکان هێشتا لە شوێنی تیربارانکردنەکان

دەسووڕانەوە، لاییتە بەرزەکانیشان تاریکاییەکەیان بە شێوەیەکی بازنەیی ڕووناک دەکردەوە. تەیموور چاڵێکی بۆ خۆی سازکردو پاڵکەوت. جار جار دەچووەوە ناو خەندەقە پڕ لاشەکە.. ئینجا چاڵ بەچاڵ شوێنەکەی دەگواستەوەو ئەگەیشتە هەر یەکێکیان ڕێک خۆی تیا تەختدەکرد، بەو هیوایەی کە عەسکەرەکان نەیبینن، لەوەدا سەرنجی دەدا هەندێ چاڵ تا ئەوکاتە بەتاڵ بوون، پاش ماوەیەک دنیا بێدەنگ بوو، ماشێنەکان ڕۆیشتبوون. کەوردتر سەرنجی دەدا، پێیزانی کە لاشەکان لەناو چاڵەکاندا گلیان بەسەردا کراوە لەڕاکردنەکەیدا (20) چاڵێکی بەتاڵی بینی.. مانگ بەدەرەوە نەبوو.. ئەم لەسەر ڕۆیشتن بەردەوام بوو تا گەیشتە دوریانێک کە هەردووکیان هەر گلبوون، کوێرانە بەسەر یەکێکیاندا کەوتە ڕاکردن. پاش دوو سەعاتێک تارماییەکی شێوەدەوارێکی بەدەوی بەدیکرد. سەگ کەوتنە وەڕین، خەوتویەکی نزیکترین چادر بەخەبەر هات و بەلایتێکی دەستییەوە هاتە دەری چادرەکە، کاتێک تەیمووری بە جلی کوردیو جەستەی خوێناوییەوە بینی، ڕایکێشایە ناو چادرەکە، نەیاندەتوانی لەیەک بگەن، ئەو کوردیی نەدەزانی، تەیموریش یەک وشەی عەرەبیی نەدەزانی، کابرا هیچ شتێکی پێ نەدەکرا بۆ چارەسەری برینەکانی تەیموور، هەرچەندە شوێنی مەترسی نەبوون، کابرا تەیموری بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لە چادرەکەدا پاراست، ئینجا بەشاحینەکەی بۆ نزیکترین شارۆچکەی برد (سەماوە) بوو لە باشووری بەغدا. ئەم بۆ ماوەی زیاتر لە دووساڵ لەوێ لای خێزانێکی عەرەبی بە بەزەیی مایەوە، سەرەنجام بە نهێنی نامەیەکی بۆ مامی تەیموور لە کەلار کە لە ئەنفال ڕزگاری بوبو، نارد، تا بە زیندوویی مانەوەی تەیموری پێبگەیەنێت. لە ئۆکتۆبەری 1990 دا، تەیمورو مامەکەی یەکیان گرتەوە. ساڵی دواتریش پاش ڕاپەڕینە سەرکەوتوەکەی کوردستان، سەرگوزشتەی تەیمور کەوتە سەر زارو بڵاوبوونەوە، بەوەش تیشکی ڕاستەقینەی ئەو تۆقینە پڕ لە سامەی کە ناوی ئەنفالە نیشان بە دنیای دەرەوە درا.

لەو ماوانەدا تەیمور هەواڵێکی بیستەوە کە کچێکی گەنجی کورد لە بیابانەکەدا دۆزراوەتەوە، تەیمور وای بۆ دەچوو کە ئەوە هاوڕێکەی چاڵی مەرگ بوبێت، بەڵام دایکی و سێ خوشکەکەی تەیمور ئەو شەوە لە دەست تیمەکانی ئیعدامکردن ڕزگار نەبوون، بۆیە جارێکیتر نەیبینینەوە....

## دوا ئەنفال لە بادینان

لەبەهاری 1987 دا، عەلی حەسەن ئەلمەجید هێڵێکی سووری بەسەر تێکڕای پارێزگای دهۆکدا هێنابوو، لە بەشە جۆراوجۆرەکانی بادینان 49 دێ سوتێنران، حکومەت بە ڕەسمی بڵاوی کردەوە کە ئەوەی خۆی تەسلیم دەکات میللەتی خۆمانە، ئەوەی وانەکات بە ئێرانی دادەنرێت.

دوا قۆناغی ئەنفال هەندێك خەسڵەتی تایبەتی لە ئەنفالەکانی تری جیا دەکردەوە، بە تایبەتی هەندێك لە خێڵەکان ئاشتییەکی سەربەخۆیان لەگەڵ بەغدادا پێکهێنابوو، توانیبوویان خۆیان لە کارەساتەکانی ئەنفال بپارێزن، ژمارەیەکی زۆر لە گوندەکانی بادینان و دەوروبەرەکانیشی، بەلایەنی کەمەوە بۆ ماوەیەک، ڕزگاریان بوبو، بەتایبەتی سورچی، دۆڵەمەڕی، زێباری...

دەرەنگانێکی ئێوارەی 24 ئوگوست هێرش بۆ سەر بنکەکانی پ. د. ك لە زێوە شکان، نزیک بە تورکیا دەستی پێکرد، ڕۆژی ئاینده بۆمبارانی فڕۆکە بۆ سەر هەندێ گوندو بنکەی پێشمەرگە بەردەوام بوو، 20 سڤیل و هێندەش پێشمەرگە و لە هەفتەکانی ئاییندەشدا سەدان ژن و منداڵ کوژران. لە هەندێ شوێن چەکی کیمیاوی بەکارهێنرا. ڕاکردووەکانی گوندی بیرجینی و گوندەکانی تر هەمان ئەو وەسفانەیان کردبوو کە لە هێرشە کیمیاوییەکاندا باسکرا، 4 کەس لەیەك خێزان کوژرابوون بەڵام زۆربەیان پێشتر ڕایانکردبوو، هەروەها گوندی تیلەکۆ لە نزیک خابوور، سپیندارۆك، بارکە قڕە، وارمیلە، مامیلە، بیلەجان، سارکە، گزە.. تاد کیمیاباران کران.. یەکێك لە نەخشەی میلیتاری عێراق داخستنی سنووربو، بەڵام ئەوانەی لە سنوورەوە نزیك بوون توانیبوویان بچنە ئەو دیو سنوور، ڕێکخراوەکە لە زمان شایەتەکانەوە دەڵێت: پاش بۆمبا بەردانەوە هەواڵ گەیشتە گوندەکان کە بەرگریکردن بێسوودە، بەپێی قسەی پێشمەرگەیەکی گەنج لە سپیندار: تەنانەت پێش ئەوەی جەیش بێتە ناو گوندەکەمانەوە پەیامێك لە مەسعود بارزانی-یەوە هات کە بەرگری نەکەین فەرمانەکەی سەرکردایەتیی پێی ڕاگەیاندین کە هەموو شتێك تەواوبوو، شۆڕش کۆتایی هات، ئێمە ناتوانین بەدەستی ڕووتی شەڕی چەکی کیمیاوی بکەین، لقی یەکی پ. د. ك-یش پێی ڕاگەیاندین: ئێوە یەك ڕێگەتان لە بەردەمدایە: ئەگەر دەتانەوێت تەسلیم ببنەوە، بۆ ئەوەی سڤیلەکان ڕزگاریان ببێت..

بۆیە شەڕە پچڕپچڕەکانی دوای یەکەم شەپۆلی هێرشی کیمیاوی ناتوانرێت ناوبنرێن بەرگریکردن.. باشترین شتێك کە کرابێت بۆ هێواشکردنەوەی پێشکەوتنی جەیش ئەوەبوو کە گروپی کشاوەی پ. د. ك لە پشتەوە بەزنجیرەیەك لێدانی جەیش هەستابوون. لەبەردەم هێرشی هەمە جۆرو هەمە لایەنەی ڕژێمدا (65 تا 80) هەزار کورد لە سنوور پەڕینەوە بۆ تورکیا. بەهەزارەهاش ناچاربوون خۆیان تەسلیم بکەن، خەڵکانێکی تریش تالێبوردنە گشتییەکەی 6 ی سیپتەمبەر لەچیاکاندا خۆیان حەشاردا.

هەروەك ناوچەکانی تری کوردستان و کامپەینەکانی ئەنفال، موستەشارەکان

کەوتبوونە فریودانی خەڵك بۆ خۆتەسلیم کردنەوە بەو ناوەوە کە لێبوردنی گشتی هەیە، هەندێکیتر بەو بیانوەی کە گوایە پێشمەرگە نەبوون و هیچیان لێناکرێ. کەچی هەموویان گیران و بەشاحینە ڕەوانەی سە[illegible]ەری کۆکردنەوەکانیان کران، لەوانە کامپی دیرەلوك، سورەجێری، کوانە، ئۆردووگای بیرزیڤی، هێزاوا، قوتابخانەیەك و قەڵاکەی جەیش لە مانگیش دیسان لە قوتابخانەیەکی سەرسەنگدا. هەروەك هەمان نەخشەی حەوت ئەنفالەکەیتر، گیراوەکان بەپێی توخم و تەمەن جیادەکرانەوە، بۆ چەند سەعاتێك یان چەند ڕۆژێك دەهێڵرانەوە، و ڕوەو دهۆك دەخرانە ناو لۆری ئیڤاوە. ئیتر ڕوەو قەسابخانەی بەکۆمەڵ کوشتن و لەچاڵنان کەتیایاندا بەسەدان ژن و منداڵی تێدابوو.. خەسڵەتێکی ئەم کۆمەڵکوژییەی بادینان ئەوە بوو کە لەماوەی یەك ساڵی لێکۆڵینەوەی ئەم ڕێکخراوە لە بادینان نەتوانرابوو تەنها یەك کەسی ڕزگاربوو بدۆزنەوە... بەپێی ئەم ڕێکخراوە لە حەوت ئەنفالی یەکەمدا، زۆرجار هۆی لەناوبردنی بەکۆمەڵی ژن و منداڵان ڕەنگدانەوەی شێوەیەك لە بەرگریکردنی پێشمەرگە بووە بەڵام لە دوا ئەنفالدا هیچ بەرگریکردنێك نەبوو (پ. د. ك) زۆر بە ئاسانی تێکشکا، لەوانەشە ئەمە تەفسیری هۆی پارێزراویی ژن و منداڵی بادینان بکات... بەڵام بۆ پیاوگەلەکان، موقەدەمێکی پێشووی جەیشی ڕژێم بە ڕێکخراوەکەی ڕاگەیاندبوو: کە فەرمانمان بۆهاتبوو کە هەموو پێشمەرگەکان بکوژین، تەنانەت ئەوانەش کە خۆیان تەسلیم دەکەنەوە، هەروەها جوتیارە سڤیلەکانیش ئەگەر کاریان لەناوچە قەدەغەکراوەکاندا بکردایە. عەلی حەسەن ئەلمەجید نەیدەویست پیاوەکان کە لە تەمەنی 15 تا 60 ساڵیدا بوون ببینێتەوە، بەپێی قسەی ئەفسەرێکی کۆن لە ئیستخباراتدا دەبوو هەموویان بکوژرێن. بەپێی قسەی هەندێك لە شایەتەکان هەندێ کات ئەفسەری بەبەزەیی ڕێگەی بە گیراوەدا لەکوشتن سەرفرازبن.. هەندێك لە پیاو و لاوەکانی بادینان هەر لەشوێنی گرتنەکەیاندا تیرۆر کرابوون، هەروەك ئەو گروپەی پیاو و لاوی دێی کۆرەمی کە لە ژن و منداڵەکان جیاکرابوونەوە و وبە چیچکانەوە دایاننابوون وە دەستڕێژیان لێکردن 27 کوژراو بوون، دیسان لە گوندی میرگەتی حاڵەتێکی بچوکتر ڕوویدابوو. بەڵام لە میاندا ئەفسەرێکی بەبەزەیی چوار لە پیاوەکانی لەناو ژن و منداڵەکاندا شاردەوەو لە کوشتن ڕزگاریان بوو، بەڵام کەئەفسەری فەرماندە ئەوانە دەبینێت بەتووڕەییەوە بەسەریاندا دەقیژێنێت کەبۆچی ئەمرەکەتان جێبەجێ نەکردوەو نەتان کوشتون ئیتر دەست بەجێ قۆڵبەستیان دەکەن و گوللە باران دەکرێن.

عەمید زۆراب لەناو ڕاپۆرتەکانیدا ئاماژە دەکا بۆ نەبوونی نزیکەی هیچ بەرەنگاربوونێك ڕووبەڕووی هێزەکانی، ئەمەش لە ژمارەی کوژراوەکانی جەیشدا ڕەنگی دابوەوە. لەدوا ئەنفالدا تەنها (31) چەکداری ڕژێم کوژرابوون کە (18) کەسیان جاش بوون.. ئەو کوردانەش کە لەم ئەنفالەدا گیرابوون لە بەندیخانەکانی جەیشدا بوون بەم جۆرە لیست کرابوون: تێکدەری تەسلیم بووەوە: (803)، تێکدەری گیراو: (771)، پیاوان: (1489)، ژنان: (3368) منداڵان: (6964)، کۆی هەمووی (13395) کورد جگە لەو کەسانەی لە شەڕگەو پەلامارو هێرشەکاندا کوژرابون هەروەها جگەلەو پێشمەرگانەی کە لە پێکدادان لەگەڵ فیرقەی 29 دا کوژرابوون کۆی هەموویان 48 کەس بون...

## قەڵای دهۆك و زیندانی ژنان لە سەلامییە

ئەو (13395) گیراوە یەکسەر بەلۆری ئیڤا بۆ قەڵای دهۆك گوێزرابوونەوە، هەندێ لە نێرینەکان نەبێت کە دەڵێن بۆ موسڵ بران، بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ کەسێك بە زیندوویی نەگەڕاوەتەوە تا باسی ئەوە بکات کە چیی ڕوویدا بۆیە بەپێچەوانەی ناوچەی ئەنفالەکانیترەوە کە بەلایەنی کەمەوە (6) کەسی گەورە لە نێوان 12-30 ساڵ وە (9) منداڵ بەساغی سەرفرازبوون. زیندانییەکان لەنهۆمی دووەمی قەڵاکە دانران، هێندە قەڵەباڵغ بوو کە لە ناو ڕاڕەوەکاندا بەسەریەکدا کەوتبوون، هەندێك لە ژنەکان لەشەوی یەکەمدا هەر لە حەوشەی قەڵاکە هێڵرابوونەوە هەروەك لە تۆپزاوا ڕوویدابوو.

ژن و منداڵ و پیر لەلایەك، پیاو و کوڕی تەمەن لە خزمەتی سەربازیدا بەجیا، دوای هەندێ پرسیاری کورت و زەوتکردنی ناسنامەکانیان.. ئەمن سەرجەمی ئەم کۆبوونەوەو لێکۆڵینەوانەیان بە شریتی ڤیدیۆ تۆمارکردبوو.. لەکاتێکدا کە پیاوەکان بەکوتەك و بۆری لاستیك و بەشەق و بەمستەکۆڵەو شەقازللە لە پیاوەکانیان دەدا، ژن و منداڵەکانیان لە نزیکیانەوە وەستاندبوو، حەرەسەکان بەوە ڕایان دەبوارد کە بەدەنکە شقارتە ڕیش و سمێڵی حەپسەکانیان دەسوتاند، منداڵەکان کەوتنە زریك و هوڕو گریان و هەوڵیان دەدا بۆلای باوکیان ڕابکەن، بەڵام بە زلە و شەق دەیانگێڕانەوە دواوە. دوای تەواوبوون لە جیاکردنەوەکان، ئەوسا بەسەر زیندانەکاندا دابەشکران، کە هەمووی پیس و پڕبوو لە پیسایی مرۆڤ، ژنێکی بە تەمەن وتبووی: هەروەك ئەوە وابوو کە لە تەوالێتدا بژی. پیاوان لە نهۆمی خوارەوەو ژن و منداڵ و پیریش لە دووەم نهۆمدا دانرابوون.. گیراوەکان لە خێڵە سەرەکییەکانی بادینان بوون بە تایبەتیی. دۆسکی، سەندی، ڕێکانی، بەرواری، سیڤانی، وەهیتریش چەند سەد دیلێکیان خەڵکی گوندەکانی ئێزیدی و ئاسوورییەکان بوون. نان و ئاویان نەدەدانێ. گاردەکان هەمیشە بە حەپسەکانیان دەگوت: ئێوەی کورد نێردراون بۆ ئێرە بۆ ئەوەی بمرن. بە پێی سەرچاوەیەك لەماوەی یەك دوو ڕۆژێکدا 20

کەسێك مردبوون، پیس و پۆخڵی و برسێتی و نەخۆشی و نەبوونی خواردن و لێدان... هۆیەکانیان بوون...

لەحاڵەتێکدا دیبوویان کە 12 کەس کە جلی پێشمەرگەیان لەبەردابووە، ڕۆژانە لێیان داون، بێ ئەوەی گوێ بدەنە خوێن.. تا سەرئەنجام لاشە خوێناوییەکانیان بینیبوو کە عەسکەرەکان بەڕاکێشان لایان بردبوون، یاجاری وا هەبووە یەکە یەکە لێیان دەدان و دەیان بردنە دەرەوەو جارێکی تر نەدەبینرانەوە. لە حاڵەتێکی تردا 18 بەند لە دەری قەڵاکە ئیعدام کرابوون. پاش چەند ڕۆژێك ژن و منداڵەکانیان گواستەوە ڕووەو موسڵ و دواییتر بەرەو ڕێی بەغدا... دوا دیمەنی بینینیان چاوبەستنەوەی پیاوەکانیان و لێدانیان بوو بە بلۆکی چیمەنتۆو دار.. ئیتر جارێکی تر نەیانبینینەوە.. دوای پێنج سەعاتێك کاروانی دیل لە ژن و منداڵی کورد گەیشتە سەلامیە لەسەر کەناری ڕۆژهەڵاتی دیجلە، بەچەند میلێکی کەم لە باشووری موسڵەوە.. ئەمانە هیچیان نەکردبوو، هیچ تاوانێکی یاساییان ڕووبەڕوو نەکرایەوە.. دوای ماوەیەك دیلە نێرینەکانیش لەسەلامیە بینرابوون. ماوەیەك پاش گواستنەوەی ئەو دیلە نێرینە چاوبەستراوانە دەستدرێژی چەك دەستی پێکرد.. حەرەسەکان بە ژنەکانیان وتبوو بۆ ئەوەیە سەرۆك سەدام لێبوردنی گشتیی دەرکردووەو مێردەکانیان سەلامەت دەبن.. دەبو گۆرانی بڵێن و ئاهەنگی گەورە بکەن، تەنانەت چاوەڕوانی ئەوەبوون کە ژنە کوردەکان سەمایان لەگەڵدا بکەن، بەڵام ژنێك بینیبووی کە چۆن لە سەلامیە دوو ئۆتۆمۆبیل پڕدەکرا لە دیلە نێرینە چاوو دەست لەپشتەوە بەستراوەکان و دەڕۆیشتن..

## ئەنفال دوا ئەنفالەکان بەردەوام بوو کارەساتەکانی دوا ئەنفال

کارەساتەکانی دوا ئەنفال تەواوکەری چیرۆکی ئەنفالەکان بوون.. نەخشەی بەعس بۆ تەواوکردنی ئامانجەکانی ئەنفال لە جینۆسایدکردنی کوردو گۆڕینی باری دیموگرافی کوردستان بە ڕاگواستن و تەعریب و تەبعیس کەوتە قۆناغێکی نوێ لە کاری پڕ لە تاوانکاری.. بەردەوامی وێرانکردنی ئەو شارۆچکەو دێیانەی مابوون بەهی موستەشارو جاشیشەوە، ئەوانە بەردەوام بوون لەسەر یاسای قەدەغەکردنی ژیان لەناوچە کۆن و هی نوێشدا بە نیشتەجێکردنی ڕزگاربوانی ئەنفال لە ئۆردوگای زۆرە ملێی کۆن و هی نوێدا، بەردەوام بوون لەسەر ڕووخاندنی ئەوەی مابوو لە ئابووریی کوردستان.. بەردەوام بوون لەسەر کاری تیرۆرو ئیعدامکردن و لەڕیشە هەڵکەندنی ئەوەی ناوی بەربەرەکانی سیاسی و دەنگی داواکردنی ماف و ڕەخنەگرتنە.. دوای ئەنفالەکانیش فایلەکانی حکومەتی عێراق ژمارەیەکی زۆر بەڵگەیان سەبارەت بە کەسەکان و ئەو گروپانەی لەوناوچانەدا بینرابون ئیعدام کرابوون تیابوو.. زۆربەی خێزانەکانی ئۆردوگاکان، ئەگەر هەموویشی نەبووبێت نێرینەی نان پەیداکردنیان لەکیس چوبوو، کارو خزمەتە کۆمەڵایەتییەکان بۆ خێزانەکانی ئەنفالکراو قەدەغەکرابوو، بەخوێندن بۆ منداڵ و سەرپەرشتی تەندروستی و ناسنامە دەرهێنانیشەوە.. ڕامالینەکان شارەکانیشی گرتبۆوە، بەتایبەتی شاری سلێمانی. هەردوای ئەنفالیش کاری بە کۆمەڵکوشتن ڕووبەڕووی ئاسووری و کلدانی و ئیزیدی بوونەوە، هەروەك هەمان ڕووداوە وەحشیگەرانەکان کە لە جینۆسایدی کوردا کرا. هەرچەندە لەکاتی ئەنفالدا گەلێ گوندی ئەمانیش لەگەڵ هی موسڵمانەکاندا وێرانکران و گەلێکیان لەگەڵ کوردەکاندا ڕایانکرد تا لەدوای لێبوردنەکەی 6 ی سێپتێمبەردا ئەوانیش خۆیان تەسلیم کردەوە. بۆ ئیزدییەکان هەر لەناو کامپاینەکاندا بە کۆمەڵ دەبران و هەرگیز نەدەبینرانەوە..

کاروکردەوەکانی بەعس لە هەموو ئۆردوگاکان بۆ کۆیلەکردنی خەڵکەکە بوو، بەهەموو شێوەیەك و مانایەکی کۆیلە، بەتایبەتی بە ناچارکردنی جاسوسی و ڕاپۆرتدان و خزمەتی بەعس و ڕژێمەکەی.. بەگەڕان بەدوای خێزان و خزم و کەس و کاری پێشمەرگە و خەڵکە نەگەڕاوەکاندا.. هەرچەندە هەندێ توندوتیژی دژ بەناوچە قەدەغەکراوەکان کەم کرایەوەو ڕێگە دەدرا کە بۆ هەندێ لەناوچەکان کە کاریگەرییەکی وایان بەسەر لایەنی عەسکەرییەوە نەبوو یان لەو شوێنانەدا کە مەبەستیان بوو. بەڵام ئەوە مەرجی بوونە جاسوسیی بەسەر چالاکییەکانی "تێکدەرانەوە" لەگەڵ بوو.. کەچی لە هەمان کاتدا گوند ڕامالین بەردەوامبوو.. هەرچەندە لە کۆی گوندەکانی هەرسێ پارێزگای سلێمانی و هەولێرو دهۆك تەنها (673) گوند مابوو، وە (4049) گوندو شارۆچکەو شاریش وێرانکرابوون ئەوە بەپێی ئاماری نوێی حکومەتی کوردستان بوو.. دیسان ڕژێم لەسەر کاولکردن هەربەردەوام بووە.. لە 15 ی ئەپریلی 1989 دا فەرمانی ژمارە 3448 ی بیرۆی باکوور، ڕێگەدرا بە چۆڵکردنی ژمارەیەکی دیاری نەکراو لە گوندەکانی خێڵەکانی: برادۆست و دۆڵەمەڕی کە دڵسۆزی ڕژێمیش بوون، بەناوی دروستکردنی بەنداوی بەخمە. هەرچەندە لە دیسەمبەری 1988 دا چوار لە گوندەکانیان وێرانکرابوون بەبیانووی بەردەوام بوونی کاری دژە شۆڕش...

ئیتر کاری گرتن و ڕاوتان و ئیعدامکردن، هاندانی بەکرێ گیراوان بۆ ئەنجامدانی کاری تیرۆر لە ڕێکخراوە نیشتمانپەروەرەکاندا.. نەخشەدانان بۆ نانەوەی ئاژاوەو بەردەوام بوونی شەڕی ناوخۆو فراوانکردنی.. بە عەرەب و

بەعسیکردن، لە هەموو شوێنێکدا کە بەعس بیگەیشتایە و جێگە پێی تێدا ببوایەتەوە، بەردەوام بوو، ئەوەی زۆر ستەم بوو بەردەوام بوونی کۆمەڵکوژی ئەو خەڵکانە بوو کە لەماوەی ئەنفالدا گیرابوون و لەکاتی لێبوردنەکەی 6-9 دا بەزیندوویی مابوونەوە، تەنانەت ئەو کۆمەڵکوژییە ئەوانەشی گرتبۆوە کە دوای لێبوردنە گشتییەکە خۆیان تەسلیم کردبۆوە، کە لە دۆکۆمێنتە ڕەسمیەکاندا بە ئەندامانی یەکێك لە ڕێکخراوەکان دانرابوون.

نموونەی ئەوە، بەسەرهاتی ئەو 180 حەپسە بوو کە بۆ دوبز گوێزرابوونەوە، جگە لە سێ کەسی تر کە هەر لەوێدا لەژێر ئەشکەنجەیەکی زۆر بە هەڵواسین و بوتڵ بەگونەوە بەستن کوشتیانن.. یونس ناوێ کە پێشمەرگەیەکی یەکێتیی دەبێت و دوای لێبوردنەکە لە خەلیفان خۆی تەسلیم دەکات و دەگیرێت، لەدواییدا لەم حەپسخانەیەدا خۆی دەبینێتەوە.. بەقسەی ئەم لە ئێوارەی 14-9 دوای لێسەندنی هەموو کەلوپەل و ناسنامەکان، بەچاو و دەست بەستراوی سواری ئۆتۆمۆبیلێکیان کردن بەرەو شوێنێکی نادیار. هەر لەناو پاسەکەدا یونس توانیبووی دەستی بکاتەوە.. دوای لادان لەجادەی قیرتاوو بەردەوام بوون لەسەر جادەی گڵ.. لەشوێنێکدا وەستان.. حەرەسەکان کەوتنە ڕاپێچکردنی بەندەکان بۆ خوارەوە، کاتێ سەرە هاتە سەر یونس، بەدییان کرد کە دەستی کراوەیە، کەوتنە لێدان، تا یەکێکیان ئاسنێك دەکێشێت بە سەریدا و دەبورێتەوە، دواتێ کە هەستی پێکردبوو، ئەوە بوو کە پەنجەکانی بەردەموچاوی زەلامێکی تر دەکەوێت.. وەختێك بەئاگا دێت، سەرنج دەدات لەناو خەندەقێکدایەو نیوەی لەشی بەڵم داپۆشراوە، گوێی لە دەنگی بلدۆزەریشە، دوای ساتێك گڵی کردە ناو خەندەقێکی تەنیشتییەوە، دیارە بۆ داپۆشینی لاشەی کوژراوەکان بووە، پەڵە هەورێکی گەورەی تۆزیش بەرزبووەوە.. لەناو تۆزو تاریکاییەکەدا یونس خۆی کێشکرد بۆ جێگەیەکی دوور لە پاسەکان.. دوور کەوتەوەو کەوتە ڕێ تالای ڕۆژهەڵاتەوە ئاگرێکی بەدیکرد، مەزنەی کرد کە کێڵگە نەوتەکانی کەرکوکە.. بەرەو ئەوێ کەوتە ڕاکردن.. لەڕێگا دوای ئەوەی کەتوانیبووی لەئیڤای عەسکەری خۆی لابدات، بەئۆتۆمۆبیلێکی سڤیل دەگات، کەشوفێرەکەی کورد دەبێت.. هەرچەندە بەرگی ڕەسمی جەیشی شەعبی لەبەردادەبێت، بێ ئەوەی پرسیاری لێبکات بۆ دوبز سواری کردبوو.. لەدوایدا لەوێوە خۆی گەیاندبووە ناو پێشمەرگەو ئینجا بۆ ئێران.

یەکێك لە تاوانە گەورە دیارو چاوێنییەکانی دوا ئەنفال لە مای 1989 دابوو کە بە دینامێت و بلدۆزەرو شۆفڵ شاری قەڵادزەشیان وێران و تەختکردو ناوچەکەش یان کرد بەناوچەی قەدەغەکراو.

دوای ئەنفال لە جەنیوەری 1989 دا لەقسەکردن لەسەر ئەنفال عەلی حەسەن ئەلمەجید، بۆ بیرۆی باکووری عێراق وتی: ئایا دەبوو بەچی شێوەیەك قەناعەتیان پێبکەن بۆ چارەکردنی کێشەی کورد و سەربڕینی تێکدەران؟ ئینجا ئاماژە بۆ گومانی ئەفسەرێکی گەورە دەکات و دەربارەی ئەنفال و لەوەش زیاتر لەسەری دەڕوات دەبوو چی لەو ژمارە زۆرەی سڤیلەکان بکرایە؟ ئەلمەجید دەپرسێت: ئایا فەرز بوو کە لە شێوەیەکی باشدا بیانهێڵمەوە؟ من چی لەمانە بکەم، لەم بزنانە، ئاگام لێیان بێت؟ نەخێر بەبلدۆزەر دەیانخەمە ژێر خاکەوە.. لە ڕاستیشدا هەر ئەوەشی جێبەجێکردو جێبەجێی دەکرد...

بۆ ئەوەی دڕندەیی و قینی ڕەگەز پەرستیی و دوژمنایەتی بەرامبەر بەکورد و نەخشەی لەناوبردن و وێرانکردنی نیشتمانەکەی ڕوونتر بکەوێتە بەرچاو تا بزانین چۆن جاهیلییەتی سەرەتا، ئەنفالی چوارده سەدە لەمەوبەر، زیندوو دەکرێتەوەو بە نوێترین چەك و بەهەمان عەقڵ و مەبەستەوە ئەنجامی دەدەن با سەرنج لە هەندێ قسەی عەلی حەسەن ئەلمەجید بدەین کە لە سەرباند تۆمارکراون و لەڕاپەڕینەکە، لەڕزگارکردنی شاری کەرکوك دا لەماڵەکەی عەلی حەسەن ئەلمەجید و لەناو ئۆفیسەکەی کەوتنە دەست کورد، ڕێکخراوی مافی مرۆڤیش لەو کتێبەیدا هەندێ بەشی نووسیوە:

من بە موستەشارەکانم ڕاگەیاند کە لەوانەیە گوندەکانیان خۆش بوێت جێیان نەهێڵن، وتم من ناتوانم گوندەکەت وەك خۆی بهێڵمەوە، چونکە بەچەکی کیمیاوی پەلامار دەدەم، ئەوسا خۆت و خێزانەکەشت دەمرن، ئەبێت هەر ئێستا جێی بهێڵیت، چونکە من ناتوانم لە هەمان ڕۆژدا پێت بڵێم کە ئەمەوێت بەچەکی کیمیاوی هێرش بکەم، هەموویان بە چەکی کیمیاوی دەکوژم! کێ هەیە هیچ شتێك بڵێت؟ کۆمەڵگای نێو نەتەوەیی؟ دەیانگێم! کۆمەڵگای نێو نەتەوەییش و ئەوانەیش کە گوێیان لێدەگرن... من بە هەڤاڵانی پسپۆڕم ڕاگەیاند کە پێویستم بە گروپێکی گەریلا لە ئەوروپا هەیە بۆ کوشتنی هەریەکێك لەوانە کە دەیانبینن، بەپشتیوانی خوا ئەوەش دەکەم دەیانشکێنم و دواشیان دەکەون بۆ ئێران ئینجا داوا لە موجاهیدین دەکەم کە لەوێش پەلاماریان بدات.. تاد.

لەکۆبوونەوەی 1988/4/15 یدا لەگەڵ بیرۆی باکوورو پارێزگارەکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا درێژە بەو بیروباوەڕو هەڵوێست و نەخشانە دەدات و دەڵێت: لە هاوینی داهاتوودا ئیتر هیچ گوندێك کە لێرەو لەوێ لە هەرێمەکەدا بڵاوبوونەتەوە نامێنێت... بۆچی ڕێگە بدەم وەك کەر کە هیچ شتێك نازانن لەوێ بژین؟ بۆ گەنم؟ گەنمەکەیانم ناوێت، ئێمە لە بیست ساڵی ڕابوردوودا لە دەرەوە گەنممان هێناوە، با پێنج ساڵی تریش بخەینە سەر.. ناوچەی زۆر گەورە قەدەغەدەکەم، هەموو بونێك تیایاندا قەدەغەدەکەم.. تاد.

لە کۆبوونەوەیەکی تریدا لەگەڵ هەمان لێپرسراواندا لە 1988/8/1 دا دەڵێت: هەر



عەرەبێك كە نەژادی خۆی دەگۆڕێت بە كورد بۆ ئەوەیە كە خۆی لە خزمەتی عەسكەری بدزێتەوە، ئەمە كێشەیەكی گەورەیە. ئایا دەبێت دەربارەی ئەوە چی بكەین..؟

بۆچی موسڵ (پارێزگا) بە كورد تۆماریان دەكات؟ ئێمە داوامان لێكردن كە هەر كوردێك لەوێ دەژی رایبگوێزن و رەوانەی چیاكانیان بكەن بۆ ئەوەی وەك بزن بژین، دەیانگێم! بۆچی ئێوە بەهۆی ئەوانەوە هەست بەسەر لێشێواوی دەكەن؟ ئێمە لە موسڵ رامانگواستن بەبێ هیچ قەرەبوویەك، خانووەكانیانمان تەختكردو پێمان گوتن وەرن، بڕۆن بڕۆن! بەلام ئەوكەسانەی كە ئێستا جەنگاوەرن (مەبەستی لەوانە جاش و موستەشارە) لەسەرەتاوە پێیان دەڵێن كە پێویستە بچن لە ئۆردوگادا نیشتەجێ ببن، دوای ئەوە پێیان رادەگەیەنین كە بڕۆن بۆ ناوچەی ئۆتۆنۆمی، هیچ جۆرە مشت و مڕێكیان لەگەڵدا ناكەین، من بەڵێنێكیان بۆ دەخوێنمەوە.. تاد، ئەوانیش پێویستە ئیمزای بكەن...

ئینجا لە هەر شوێنێك (لێرەدا عیبارەتێك نابیسترێت لەبەر دەنگ نزمی) بیان بینمەوە، سەریان پان دەكەمەوە، ئەم جۆرە سەگانە سەریان دەهاڕین.. دەتانەوێت ژمارەی دانیشتوانی عەرەب بەم خەڵكە خوێن مژانە زیاد بكەن؟ پێویستە ئێمە ناوچەكەتان (موسڵ) تەعریب بكەین وە تەنها عەرەبی راستەقینە، نەك یەزیدی، كەرۆژێك دەڵێن كوردین و رۆژێكی تر دەڵێن عەرەبین. ئێمە چاومان پۆشی لەو خەڵكە یەزیدیانە كە لەسەرەتاوە بوون بە جەنگاوەر (جاش) بۆ ئەوەی نەهێڵن تێكدەرەكان زیاد بكەن. بەلام بێ لەوە، ئەبێت یەزیدییەكان چی كەڵكێكیان هەبێت.. تاد. ئینجا دوای ئەنفال دەڵێت: كاتێك لێبووردنە گشتییەكەی (سێپتێمبەر 1988 بلاوكرایەوە من خەریك بوو شێت ببم. بەلام وەك ئەندامێكی لێپرسراوی پارتییەكەم گوتم باشە. من وتم لەوانەیە چەند كەسێكی چاك لە كوردەكان) لە نێوانیاندا بەدیبكەین، چونكە ئەوانیش هەر میللەتی ئێمەن. بەلام هەرگیزاو هەرگیز هیچمان بەدی نەكرد. خۆ ئەگەر دەربارەی كوردە لێپرسراوە پایە بەرزەكان پرسیارم لێبكەن كە كامانەیان باش و بەوەفان، ئەوا دەڵێم بەتەنها پارێزگارەكانی هەولێر و سلێمانی، جگە لەودوانە هیچ كەسێكی بەوەفا یان باشیان تێدا نییە...

حەزدەكەم دەربارەی دوخاڵ قسە بكەم: یەكەم، بەعەرەب كردن، دووەمیش زۆنە هاوبەشەكانی نێوان خاكی عەرەب و ناوچەی ئۆتۆنۆمییە. ئەو خاڵەی ئێمە لەبارەیەوە دەدوێین كەركوكە. من هاتم لەسەرجەمی دانیشتوانەكەی كەركوكدا عەرەب، و توركمانەكان لەسەدا 51 زیاتر نەبوون...

وێڕای هەموو شتێك من 60 ملیۆن دینارم سەرفكرد تاكو گەیشتینە ئەم هەلومەرجەی ئێستا. ئێستاكە ئاشكرایە، بۆ زانیاریتان، ئەو عەرەبانەی كە هێنران بۆ كەركوك رێژەی سەدییەكەیان بۆتە 60 لەسەدا، ئینجا فەرمانمان دەركرد كە كوردەكان لە كەركوك و لە گوندەكانی دەوروپشتی و لەو نزیكانە قەدەغەیە كاربكەن...

كەركوك تێكەڵێكە لە فرە نەتەوەو ئایین و مەزەب، ئەو خەڵكانە كە ئێمە لە 21ی مای تا 21 جون رامانگواستن، یەك دانەیان خەڵكی ناوچە قەدەغەكراوەكان نەبوون، بەلام لەژێر كۆنترۆڵی تێكدەراندا بوون، جا ئەگەر لەگەڵیاندا بووبن یان دژیشیان بووبێتن...

### سەرچاوە

بازنەكانی ململانێ و ستراتیجی ئاسایشی نەتەوەی كورد، مەحمود مەلا عززەت سلێمانی 1998، لەبلاوكراوەكانی بنكەی ئەدەبی و رووناكبیری گەلاوێژ.

# ئێروانینێکی سەردەم بۆ کۆمارەکەی مەهاباد

لە یادی ٥٢ ساڵەی دامەزراندنیدا




مەحموود مەلا عزەت

دامەزراندنی کۆماری کوردستان لە بەشێکی کوردستانی ئێراندا یەك هەلو ئەزموونی مێژوویی ئەوتۆیە کە تا لێکۆڵینەوەی لەسەربکرێ زیاتر بایەخی دەردەکەوێ و پتر سوودبەخش دەبێ، بەتایبەتی و تا ئێستا زۆر لایەن و رووداوی شاردراوەن، سەرچاوەی سەردەمەکە نەخراوەتە خزمەت ئەو نووسین و باس و لێکۆڵینەوانەی تا ئێستا کراون.. یان لە سنوورێکی تەسکدا سوودیان لێ وەرگیراوە. سەنگی مێژوویی ئەم رووداوە چەند لایەنیە، ئەوەی پێویستە لێرەدا ئاماژەی بۆ بکەم:

یەکەم: ئەزموونێکی سەردەمی ئازادی و نیمچە سەربەخۆیی بەشێکی نەتەوەیی کوردە، هەرچەندە تەمەن کورت بوو، بەڵام پڕ لە دەرس و پەندە.

دووەم: بە ماوەیەکی کورت دوای ئەزموونێکی مەزن تر خوڵقا، مەبەستم حوکمداری و مەلیکایەتیەکەی شێخ مەحمودی حەفیدە، پێش ئەوەی کوردستانی باشوور بلکێنرێ بە میسۆپۆتامیاوە و بە دەستی بەریتانیاو، دژ بە خواستی میللەت، ئەم دەوڵەتی عیراقی لێ دروست بکرێ.

سێیەم: بوونی گەلێ دیاردەی یەکانگیرو لە یەکچووی گەلێ لایەنی ئەو هەلە مێژووییەیە لەگەڵ ئەم ئەزموونەی ئێستای کوردستانی عێراقدا.. بۆیە ئەو تاقیکردنەوەیە گرنگییەکی تری سەردەمی هەیەو دەبێ زیاتر رووناکی بخرێتە سەر.

## ئاورێك لە رۆژگاری پێش دامەزراندن

لە ناو بارودۆخێکی نائاسایی و پڕ لە ئاژاوە و گرفتی زلو قەبەی ئابووری و سیاسی و کۆمەلأیەتی دوای دووەم جەنگی جیهان، لە ناو هەل و مەرجی دروست بوونی زەمینەی چەکی ئەتۆم و ململانێی ئاشکراو نهێنیدا بوو کە هەلە مێژووییەکە بۆ کورد خوڵقاو کۆماری خودموختاری کوردستان لە بەشێکی کوردستانی ئێراندا دامەزرێنرا، چونکە ئەو ئاژاوە و نائارامیە رۆژهەلأتیشی گرتبۆوە، لە ناویاندا دەوڵەتی فرەنەتەوەیی بە زۆر دامەزراوی ئێران زیاتر ئاڵۆزبوو، سەبارەت بە هاوکارییەکەی رژێمی تاران لەگەڵ ئەڵمانەکاندا بەبێ ئەوەی ئامۆژگاری و هەڕەشەی ئینگلیز و رووسەکان کاربکاتە سەری. بۆیە لە25ی ئابی1941دا هێزەکانیان، یەکەم: لە رۆژئاواو خوارووی رۆژئاواوە، دووەم: لە سەرەوە، زۆر لە ناوچەکانی ئێرانیان داگیرکرد کە پانتاییەکی زۆری کوردستانی رۆژهەلأتیشی گرتبۆوە، بە هەمان دیاردەی دوو داگیرکەریەوە، بەشی لای خوارووی لە ژێر دەستی بەریتانیا و بەشی سەرووی لەژێر دەسەلأتی یەکێتی سۆڤیەتدا بوو کە ناوچەکانی: مەهاباد، بۆکان، شنۆ، نەغەدە سێبەری بوون.

دیواندەرە، سەقز، بانە و مەریوان ناوچەی بۆشایی نێوان هەردوو هێزەکە بوون، جۆرێ لەGentelmen)

(Agreement ی بێ لایەنی لەسەر سەقزو دیواندەرە بڕیار لەسەردرابوو.

لە دواییشدا هێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا جێگەی خۆیان لە خوارووی ئێراندا گرت.

هەرچەندە مەبەستی ناوکۆی زلهێزەکان دوورخستنەوەی نفووزی ئەڵمانیا، مسۆگەرکردنی گەیاندنی چەك و پێویستییەکانی جەنگ بۆ هێزەکانی سۆڤێت، و پاراستنی کێڵگەو بیرەنەوت و بەرژەوەندییە چاوەڕوان کراوەکانیان بوو، هەر دەوڵەتەش خواست و نەخشەی تایبەتی خۆی هەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو داگیرکردنە کەم و زۆر بۆ بەرژەوەندی گەلانی ناوچەکە نەبوو، کەچی راستەوخۆ بووە هۆی وریاکردنەوە و جوڵانەوەی نەتەوە جیاجیاکان، کاتێکیش دام و دەزگای دەوڵەتی وئەرتەش لە هەندێ ناوچەو شاردا داڕوخان، ئاوو هەوایەکی نیمچە ئازاد و دیموکراسی خوڵقا.. گەلێ رووداوی گرنگ ئەو بەشەی

کوردستانی ئێرانی گرتەوە، وەك سەرەنجامێکی ئەو بارودۆخە نوێیە، لەوانە:

. لە ساڵەکانی 1942-1946 بەڕێوەبەرایەتییەکی خۆماڵی لە ناوچەی موکریان و دەوروبەری دامەزرا بە سازکردنی دەستەی چەکدار، دامو دەزگاکانی بەڕێوەبردن، ڕادیۆی کوردستان، چاپخانە وە دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان... هتد.

. لە ساڵانی 1941-1944 حەمە ڕەشید خان ناوچەکانی بانەو سەردەشت و سەقزی گرتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، سەرەنجام ئەرتەشی تاران بە هاندانی ئینگلیزەکان و یارمەتی هەندێ عەشایەری کورد هێزەکەی ناوبراویان لە کەلی خان شکاندو بە ناچاری پەنای بۆ عێراق برد.

لە بەهاری(1322)(1943) تیرەو ئیلەکانی ناوچەی ورمێ بە سەرکردایەتی عومەرخانی شەریفی، زیرو بەگی بەهادوری ڕەشید بەگی جیهانگیری و تەها بەگی هەرکی بە هەندێ داخوازی عەشایەری و نەتەوایەتییەوە دێهاتی ناوچەکەیان گرتە ژێر دەست و ئابلووقەی شاری ورمێیاندا، تا ڕووسەکان کەوتنە ناوبژی و لەگەڵ تاراندا ڕێکیان خستنەوە.

. لە16ی ئەیلولی1942دا کۆمەڵەی ژێ- کاف دامەزرێنرا، بە دروشمە نەتەوایەتییە مێژووییەکەیەوە (ڕزگارکردنی کوردستانی گەورە) هاتە سەر شانۆی سیاسی کوردستان، لە دواییدا هەر لە شوێنەواری ئەم ڕێکخراوە حیزبی دیموکراتی کوردستان دامەزرێنرا، لەوەدا، هەندێك هەر پێیان وایە تەنها ناوو بەرنامە گۆڕین بووە، حیزبەکە خۆشی دوای ساڵێك لە ئالوگۆڕەکە یادی پێنجەمین ساڵەی دامەزراندنی کردەوە نەك یەکەمین.. بە مانای ئەوەی خۆی بە درێژەپێدەری ژێ- کاف دادەنا.

دوای لێدانی نفووزی ئەڵمانیاو دڵنیابوون لە ساغ بوونەوەی ئێران بۆ زلهێزە هاوپەیمانەکان، بەریتانیاو ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە هۆشیاری و گومانەوە چاودێری جموجوڵی لەشکری سوورو ڕووداوەکانی ئازەربێجان و کوردستانیان دەکرد، مەبەستیان بوو لەناو نەخشەیەکی هاوبەشدا ئێران بە سنووره جوگرافی و سیاسییەکەیەوە بپارێزرێ، بە یارمەتی دانی ڕژێمەکەی حەمە ڕەزاشا کە لە جێگای باوکی دانرا بە جێگیرکردنی هێزەکانی خۆیان و نفووزی سیاسیان، و بەلەتکردنی جێگەی لەشکری سوور و کۆتایی هێنان بەو ئالۆزییەی تیندینسی یاخیبوون و دیاردەی پارچە پارچە کردنی ئێرانی هێنا بووە ئاراوە، بۆیە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا کە ناوەندەکەی کرماشان بوو بە کشوماتی و بە ئارامی مانەوە.

سەبارەت بەوانە لەگەڵ جەنگ وەستان و خۆبەدەستەوەدانی ئەڵمانیا ئەو دوو دەوڵەتە کەوتنە سەر ڕێبازی گوشار خستنە سەر ڕووسەکان بۆ جێبەجێ کردنی خاڵەکانی ئەو پەیمان و پرۆتۆکۆڵ و ڕێکەوتنانەی لەسەر ئێران مۆرکرابوون، داواکانیش سادە و ئاسایی بوون، هەر لەو سنوورەدا بوون کە ڕووسەکان بەڵێنەکانی خۆیان لە کاتی خۆیدا جێبەجێ بکەن، بۆ ئاسان کردنی کارەکەو نەهێشتنی هیچ بڕو بیانوویەك، هێزەکانی ئەمریکا لە 31ی کانوونی دووەمی 1945دا، هێزەکانی بەریتانیا لە 2ی ئازاری1946دا لە ئێران کشانەوە.

بۆیە یەکێتی سۆڤیەت بیانویەکی ئەوتۆی بەدەستەوە نەمابوو بۆ مانەوەو نەکشانەوە، لێکدانەوەیەکی زۆریشیان لەسەر بەرەنگار نەبوونێکی نوێ دەکرد، ئێرانیش لە ڕووی نەوت و ستراتیجی سەربازییەوە بایەخێکی بێ وێنەی بۆی هەبوو، هەروەك چۆن بایەخی ستراتیجی و نەوتی بۆ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەبوو.

ئا لەو بارودۆخە نێودەوڵەتییەدا لێپرسراوانی سۆڤیەت کەوتنەسەر دەستپێکردنی یارییەکی سیاسیی گوشار سروشت، ناوەڕۆك و خواست و بەدیهێنەری بەرژەوەندییەکان.. بە دیمەنیش دەستگرتن و یارمەتی دانی دوو گەلی ئازەرو کوردبوو.

ئەوەبوو ئاگاداری لێپرسراوانی ئازەرو کورد کرا کە کاتی ئەوە هاتووە سەردانی(باکۆ) بکەن بە داخوازییەکانیانەوە تا وتوویژ لەسەر جێبەجێ کردنی بکرێ.

پێشەکی زۆر هەوڵ درا کە کورد بە ئازەربێجانەوە ببەستێتەوە بێئەوەی بتوانن ڕابەرانی کورد ڕازی بکەن. بۆیە پرۆسەی دامەزراندنی ئازەربایجان دەستپێکراو لە 11ی کانوونی یەکەمی1945دا بانگەوازێ بلاوکرایەوە.

دوابەدوای ئەوە لە2ی ڕێبەندانی 1324(22ی کانوونی دووەمی1946) دامەزراندنی کۆماری خودموختاری بە ڕەسمی بلاوکرایەوە.

## کێشەکان لە ناو سێ بازنەدا:

ئەوەی زۆر گرنگ و جێگەی سەرنجە ئەو دامەزراندن و بلاوکردنەوەیە یەك لایەنی بوو، هیچ مامەڵەیەکی سیاسی و دیبلۆماسی نێودەوڵەتی لەگەڵدا نەبوو جگە لە ئازەربێجان تەنانەت یەکێتی سۆڤیەتیش هیچ جۆرە هەنگاوێکی لەو بابەتەی نەنا، هەر چەندە سەرەك کۆمار هەڵبژێرا ئەنجومەنی وەزیران(هەیئەتی ڕەئیسەی میللی کوردستان) بە سەرۆکایەتی حاجی بابەشێخ هاتە سەر شانۆی کار و دامودەزگاکانی حکومەت دامەزرێنران، لەگەڵ ئەوانەشدا ئەم قەوارەیە، هەرچەندە لەناو شەرعیەتی یاسایی و مافی بڕیاردانی چارەنووسی خۆدا هاتە ئاراوە و لە ژێر سێبەری زلهێزێکدابوو، بەدەربوو لە بازنەی شەرعیەتی سنووری سیاسی و جوگرافی ئێران، وەك داگیرکەرێك هەر بیریشی لەوە نەدەکردەوە ددانی پێدا بنێ، سەرکردەو ڕابەرانی کۆمار بە نووسین و بە گوتەو بە جوڵە کۆمارەکەیان بە بەشێکی جیانەبووەوە لە ئێران دادەنا خۆیان بە یاسای ناوەندەوە بەستبۆوە... زەمینەکەیان بە بەشێکی زەوی ئێران دادەنا، تەواو بڕوایان بە گفتوگۆ بوو... لەگەڵ ئەوانەشدا، هیچ جۆرە نەرمییەك، ئامادەبوونێك بۆ سەلماندنی

جۆرێ لە مافی نەتەوایەتی پیشان نەدەدرا بگرە بە ئاشکرا لەسەر نەخشەی لە ناوبردن کاریان دەکرد.

دیسان بۆ بازنەی نێودەوڵەتی و مامەڵەی دیبلۆماسی بە دابڕاوی مایەوە، هەرچەندە سەرەك کۆمار لە دەرگای سیاسی و دیبلۆماسی هەر سێ دەوڵەتانی خۆرئاواییدا، بەڵام بێ وەرام بوو، رووسەکانیش لە ناو کێشە زلو قەبەکانی خۆیاندا دەژیان و کاریان بۆ نەخشەکەی خۆیان دەکرد.

سەبارەت بەوانە کۆمارەکەی کورد هەر لە بە وەلەدبوونیەوە لەناو سێ بازنە لە کێشەدا دەژیا: کێشەی نەبوونی شەرعیەتی نێودەوڵەتان، کێشەی نەبوونی شەرعیەتی هەرێمی و ڕێکخستنی پەیوەندی لەگەڵ پایتەخت، وە کێشەی ئابووری و سەربازی و کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆجی ناوخۆو نادیاریی ئایندەو چارەنووسی کۆمار.

زیاتر لەوانەش، دوژمن و زلهێزە هاوکارەکانی، بارەکەیان زۆر بە پڕ مەترسیتر لە واقیع وەردەگرت، لەسەر حیسابی لەتوپەت کردنی ئێران، تەشەنەکردنی کێشەی کوردیان دەکرد، گریمانی پاشەڕۆژێکی نادیاریان کردبوو بە مەترسییەکی کاتی بڕوانە ئەم هەواڵەی میدیای ئەو ڕۆژگارە بڵاوی کردبوەوە، لە ڕۆژنامەی کوردستان- زمانحاڵی کۆمارو حیزبیشدا بڵاوکرایەوە:

## دەنگوباسی دەرەوە

ڕادیۆی بەیروت لە خەبەرێکی کە پێمان گەییوە و لە قاهیرەوە وەرگیراوە دەوڵەتی جمهوری کوردستان لە ئازەربایجان دامەزراوە، سەرۆك جمهوری کوردستان جەنابی قازی محمدو پایتەختی کوردستانی ئازاد شاری مهاباد، ئەو جمهوری کوردستانە داخوازی وەسەرگیرانی کوردستانی عێراق و تورکیا دەکات مەرام و ئارەزووی وان سەربەستیو سەربەخۆیی کوردستانی گەورەیە مەلا مستەفا بارزانی قائیدی شەڕی بارزان کە ئێستا لە دەوڵەتی جمهوری کوردستان دادەنیشێ لەو جمهوریەتە زۆر بە قەدرو حورمەتە.

ڕادیۆی بەیروت: بە خەبەرێك کە لە مەکتەبی سیاسی واشنتۆن وەرگیراوە دەڵێت مەسەلەی ئێران کەوتۆتە مەوقعێکی زەحمەتەوە هەتا کوردەکان ئێستا داوای ئیستیقلالی خۆیان دەکەن و زۆر-ممکنە کە ئەم حرکاتانە ببنە سەبەبی یەکێتی هەموو کورد بۆ داواکردنی ئیستقلالی کوردستانی گەورە.

ئەوە لە کاتێکدا ئەو جۆرە بیرو تێندینسە لە ناو نەخشەو بڕیاری داڕێژرانی سیاسی کوردا نەبووە، خۆ رووسەکانیش هەر تەواو دژی کاری وابوون، بگرە نکوڵیشیان لە بوونی پەیوەندی و یارمەتیدانی کۆماری مهاباد دەکرد.

لە ناو ئەو ئاوو هەوایەدا وە بۆ بەرەنگاربوونی ئەو دیاردانە"ئەحمەد قوام السلطنة" لەناو دیبلۆماسیەتی پڕ لە فرو فێڵی فارسەکان و مانۆڤری سیاسی سەرکەوتووانە کەوتە بەر کارخستنی ئەڵقەکانی نەخشەی یارییەکی سیاسی و دیبلۆماسی، سیما دڵسۆز بە گەل و داخوازییەکانی دۆستانە بە یەکێتی سۆڤیەت و باش دراوسێتی، لە ناوەڕۆك و مەبەستیشدا بۆ پووچ کردنەوەی یاریەکی رووسەکان، بۆ کشانەوەی لەشکری سوور و دەستبەرداربوون لە ئازەرو کورد بوو.

بۆیە کەوتە هەنگاونان بۆ ئەنجام دانی ریفۆرمی سیاسی و کۆمەڵایەتی کارکردن بۆ پرۆسەی دیموکراسی لەلایەك، و گەرم کردنی هاتوچۆو پەیوەندی و گفتوگۆ لەگەڵ لێپرسراوانی مۆسکۆ لەلایەکی تر، تا پەیمانی دامەزراندنی کۆمپانیای هاوبەشی نەوت مۆرکرا بەوەش رووسەکان ئاواتەکەیان بەدیهات.

لە سەرەنجامدا دوا بەشی لەشکری سوور لە 27ی نیسانی1946دا ئێرانی بەجێ هێشت، و هەموو چەك و تەقەمەنی قورس لەوانە ئەو تۆپانەی کە دابوویان بە ئەرتەشی ئازەربێجان ئەستاندیانەوەو دەگەڵ خۆیان بردیان بەوەش سەرەك وەزیرانی ئێران خواستە سەرەکییەکەی بەدیهات، لەسەر بەشی دوایی نەخشەکەش بەردەوام بوو بەتایبەتی مەترسی یەکێتی سۆڤیەت و یارمەتی هەردوو کۆمارەکە لەئارادا نەما.

چەکی قورس هەر بە ئازەربیجان درابوو ئەوەشیان سەندرا، دوو فرۆکەی بێ بۆمباو چوار تۆپی کۆن، هەبوو کە دوودانەیان بۆ مەهاباد نێررا وەك کۆمەکی سەربازی.

بەو جۆرە دەردەکەوێ کە هۆو یارمەتیدەری بنچینەیی دامەزراندنی کۆماری خودموختاری کوردستان:

بارودۆخی نێودەوڵەتان و ململانێیان، داڕووخانی دامو دەزگاو ئەرتەشی تاران، دروست بوونی بۆشایی بەڕێوەبردن، یاری و مانۆڤری سیاسی هەمەلایەنە بەپیرەوەچوونی ڕووداوەکەو دامەزراندنی کۆماربوو. بەتایبەتی هیواو خواستی ڕزگاری لای جەماوەر، بوونی حیزبی دیموکراتی کوردستان و پێشەوا قازی محمد... هتد.

بەڵام ئەوانە هەموو شتێك نەبوون، زەمینەی رەسیوی دامەزراندنی قەوارەیەکی خاوەن هەلو مەرجی ژیان و داکۆکی لە خۆ نەبوو: تەنها بۆ کاری سەرەتایی و سوودوەرگرتن لەو هەلە مێژووییە رەخساوە لەبار بوون،دەنا دەبوو، لەبەر تیشکی ڕەوتی ڕووداوەکان زۆر کاری تر بکرایە، زۆر هەنگاوی تر بنرایە، زۆر بەوردی و هۆشمەندی و قوڵی لە خۆو لە بارو دۆخەکەو لە سەرجەم ڕووداوەکان و هەڵوێستی زلهێزەکان و ناکۆکی و ململانێ و پەیمانەکان بگەیشتنایە، لەبەر ڕۆشنایيان نەخشەی کارو خۆ قایم کردن دابنرایە، سەرنجی پاشەڕۆژو دیاردەو یاری چارەنووسی کۆمار بدرایە.

## بۆشاییە ئاشکراکان

هەر لە سەرەتاوە بۆشاییەکان، کەم وکورتی و دیاردەی ئاقولاو کۆسپەکان، هەڵوێستی سەرچاوەی بڕیار... یارمەتی و کۆمەك... جوڵەو ڕاسپاردەکان... هتدو دیارو ئاشکرابوون.

بۆ نموونە:

ساڵ دەهات و ساڵ دەڕۆیی داواو داخوازییەکانی کورد بێوەرام بوون، لە نێوان ساڵەکانی1941–1946دا بەڕێوەبەرایەتییەك دامەزرێنرا، بەهێز نەدەکرا، بزووتنەوە چەکدارییەکەی ناوچەی ورمێ لە بەرژەوەندی تاران دوایی پێهێنرا، کاتێ یەکێتی سۆڤێت هاتە وەرام ئیتر یاری و مەبەستەکە زۆر شاراوە نەبوون.

هەر لە سەرەتای دامەزراندنی کۆمارەوە دەزانرا لاسەنگی هێزو چەك و ئازووقەو داهات لە چ ئاستێکدایە، کەچی هیچ هەنگاوێکی کاریگەر نەدەنرا، بەتایبەتی گوشاری سەربازی لەسەر مەهاباد ئاشکرابوو، زۆر لە بەڵگەنامەکانی ئەو سەردەمە... باری خراپی سەربازی... لە رووی چەك و ئازووقەو کەرەسەی جەنگ و ئابووری سەربازی دەردەخەن جاربووە چەکدار لەبەربێ فیشەکی بەرەی شەڕی بەجێهێشتووە، چەکی قورس نەبووە، بۆ جلو پێخەف و پێڵاوو گۆرەوی یارمەتی لە جوتیاران وەرگیراوە... ئەوانە گرتنی رۆژانەی پێشمەرگەو هێزەکانی بەرەی جەنگ و لێپرسراوانی کوماربوون بە سەرۆك کۆماریشەوە.

هەر لە سەرەتاوە دەوڵەتانی خۆرئاوا، نەك هەر ئاوڕیان لە کۆمارەکە نەدەدایەوە، بەڵکو بۆ رووخاندنیشی نەخشەیان بۆ تاران سازدەکردو یارمەتیان دەدا، بەو جۆرە لە رووی سیاسی و دیبلۆماسییەوە بە دابڕاوی، بە سوودوەرگرتن لە باری جیۆپۆلیتیکی ناوچەی کۆمار بە ئابلۆقەدراوی هێشتیانەوە یەکێتی سۆڤێتیش هیچ هەنگاوێکی بەرەسمی نەنا، هیچ جۆرە رێکەوتنێ، بروتۆکۆلێ، بەڵێنێکی نووسراو لەگەڵ کۆماردا نەکرا، ئەو نەبوونی شەرعییەتی یاساییەی نێودەوڵەتان و ناوچەکە مەترسییەکی ئاشکرای نیشاندەدا.

هەر لە سەرەتای پرۆسەی داگیرکردنی ئەو ناوچانەی ئێران، گەلێ پەیمان و رێکەوتن لەنێوان دەوڵەتانی هاوپەیمان و لەگەڵ تارانیشدا مۆرکرا، مەبەستی سەرەکی هەموولایەك پاراستنی سنووری سیاسی و جوگرافی ئێران... یەکێتی خاك و میللەتانی بووە، بۆ بەڵێندان و دووپات کردنەوەی چۆڵ کردنی ئێران بووە لە دوای جەنگ.

لە29ی کانوونی دووەمی 1942پەیمانێکی سێ قۆڵی ناسراو بە پەیمانی(الاتحاد) لە نێوان علی سهیلی وەزیری کاروباری ئێران، سێر زیدر بۆلارد سەفیری بەریتانیا لە تاران و سەمیرۆنۆف سەفیری یەکێتی سۆڤێت لە تاران ئیمزا کرا، لە مادەی یەکەمدا هەموویان بەڵێنیان دابوو رێزبگرن لە یەکێتی ئەرزو سەرداری و سەربەخۆیی ئێران، لە مادەی پێنجەمدا بڕیاردرا کە دوای ئاگربڕ رێکەوتن لەگەڵ ئەڵمانیاو هاوبەشەکانی لە ماوەیەکدا کە لە شەش مانگ تێنەپەڕێ دەبێ، هێزەکانی خۆیان لە ئێران ببەنە دەرەوە، کورد و رۆشنبیرانی هیوایەکی گەورەیان بە(ئیعلانی ئەتڵەنتیك) بەستبوو سەبارەت بەم برگانەی ناوی (هەموو گەلێ دەبێ مافی ئەوەی هەبێت کە خۆی فۆرمی بەڕێوەبردنی خۆی هەڵبژێرێ) بەندەکەی ویلسۆن وەبیرهێنرایەوەو(هیچ گۆرانێکی ناوچەیی دژ بە خواستی گەلان نەکرێ).

لە راستیشدا ئەم برگەیەی دوایی لە دەستکەوتی تاران و دژ بە بەرژەوەندی کوردبووە، چونکە مەبەست لە خواستی گەلان خواستی دەوڵەتان بووە، بۆیە هەر ناوەرۆکی ئەمەشیان بەئەنجام گەیاند، هەروەك چۆن لە دواییشدا دامەزراندنی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان مەبەست لێی رێکخراوی دەوڵەتان بوو.

لە 27–29 دیسەمبەری1943 کۆنگرەی تاران لە نێوان رۆزفلت، چەرچل و ستالیندا بەسترا، یەکێ لە خاڵە گرنگەکانی: پاراستنی سنوورو یەکێتی ئێران و کشانەوەی هێزەکانی هەر سێ دەوڵەتەکەیان بوو، لە دوای برانەوەی جەنگ.

پێکهاتنی تاران و مۆسکۆ لەسەر دامەزراندنی کۆمپانیای هاوبەشی نەوت و بلاوکردنەوەی دەقی پەیمانەکە، زیاتر لەوە، "قوام السلطنة" پەیوەندی نێوان هەردوو پایتەختی وا باش کردبوو کە تەنانەت بکەونە بلاوکردنەوەی بەندو باوی خواستنی کچی ستالین بۆ حەمە رەزاشا کە لە دواییدا رۆژنامەی کوردستان بە خۆشییەوە هەواڵی درۆبوونی باسەکە بلاویکاتەوە.

کاتێ سەرانی دەوڵەتانی هاوپەیمان لە بۆتسدام کۆبوونەوە بۆ دیاریکردنی چارەنووسی ئەڵمانیاو دابەش کردنی دەستکەوتەکان سەبارەت بە چۆڵ کردنی ئێران دوای برانەوەی جەنگ ئەو بەڵێنەی دابوویان دووبارە کرایەوە. لە29ی ئازاری1946دا تورکیاو عێراق پەیمانی باش دراوسێتیان ئیمزاکرد. ئەو رێکەوتنە مەبەست زۆر روون و ئاشکرایانە مۆردەکران بەرامبەر بە نەبوونی هیچ جۆرە بەڵێنێك یا بەڵگەنامەیەکی باوەڕپێکراو لەلایەن سۆڤێتەوە بۆ کورد، لەگەڵ نەبوونی هیچ جۆرە یارمەتییەکی جیدی ئەوتۆ کە کۆمارەکە بکرێتە هێزێکی خۆڕاگر بەڵکو قسەش لەوە دەکرێ گوایا ئامۆژگاری کوردەکان کراوە تا رێ لە ئارتەشی تاران بۆ مەهاباد نەگیرێ چونکە هێزێکی بچووك هەر بۆ چاودێری هەڵبژاردن دێتە ناوچەکەو لە دواییدا دەکشێتەوە...!

## دیاردەی تری نائاسایی

زیاتر لەوانە ئەگەر سەرنجێکی باری ناوخۆی سنووری کۆمارەکەی کورد بدەین، لەناو تێروانینێکی ئەقلیمی سیاسی و دیبلۆماسی سەرکردایەتی حیزب و کۆماردا گەلێ دیاردەی تری سەیری سەردەمەکەمان دەکەوێتە بەرچاو..

کۆمەڵگای کوردەواری زۆر دواکەوتوو بوو، ئەگەر بزانین ئامارو رازەی نەخوێندەواری دوای بیست ساڵ (1966) لە دامەزراندن و رووخاندنی کۆمار لە دێهاتەکانی: مەهاباد94٪ لە سەقز 93.10٪ لە سنە 92.9٪ کرماشان 88.2٪ بووە ئەوا دەتوانین مەزەنەی سەردەمەکەی کۆمار بکەین، ئەم بارە نالەبارو دەردە کۆمەڵایەتییە کوشندەیە دەیان گیروگرفتی گەورەو ناکۆکی ناو کۆمەڵی رۆژگارەکەی قوڵ کردبووەوە..

لێپرسراوانی حیزب و کۆماریش هەڵقولاو و خولقاوی ناو ئەو دۆخە ئاڵۆزە بوون. بۆیە تێگەیشتنی تیپەکان و چارەکردنیان تێگەیشتنی بارە نێودەوڵەتییەکەو دیبلۆماسیەتە ئاڵۆزەکە بوو بۆ ئەوان زۆر زەحمەت

بووە... لە ڕۆژی کارەساتیشدا هەر ئەوە چاوەڕوان دەکرا کە ڕوویدا، بەتایبەتی ناکۆکی عەشایەری و یارمەتیدانی دوژمن، ململانێ و ڕقەبەری و پاڵ بەیەکەوەنان بۆ پەڕینەوە بۆ بەرەی بەرامبەر چاوەڕوانی هەل و تۆڵەسەندن.

ئەوانە ئاشارامی و بێباوەڕیی ڕەخساندبوو، ئەنجامی ئەوەش لە ڕۆژگاری سە ختدا دەرکەوت چەندە ترسناک بووە.

سەرکردایەتی کۆمار، زیاد لە پێویست خۆی بە وتوویژی بێ ئەنجامەوە بەستبووە. بێ بناغە لێی بە ئومێدبوو، هەرچەندە جۆرێ لە جیاوازی بە ئومێدو بێ ئومێدی لە نامەکانی کۆمیتەی مەرکەزی حیزب لەلایەك و سەرۆك کۆمار لەلایەکی تر دەردەکەوێ. جگە لەوە زۆر لە لێپرسراوانی تر نە بڕوایان بە تاران بووە وە نە ئومێدو بڕواشیان بە گفتوگۆ بووە.

لەکاتێکدا ڕژێمی تاران تەنها بۆ کات بردنە سەرو دەستی دەستی گفتوگۆی کردووە، خۆ لێپرسراوانی ئەرتەش هەر بە ئاشکرا لە نامەکانیاندا گاڵتە بە گفتوگۆدەکەن، بگرە جاری وا بووە ژاندارم تەقەی لەو خەڵکە دەکرد کە پێشوازیان لە نوێنەری ئازەرو کورد دەکرد لە تاران وەك لە گفتوگۆی بانەمەڕی1325دا، 2کوژراوو3 بریندار ئەنجامی بوو.

وەك پێویست بە لێکۆڵراوەیی و دانانی نەخشە، مامەڵەی ڕووداوەکان نەدەکرا، لە دوژمن لە نەخشەو پلان و، لە گەمە سیاسییەکان لە دیبلۆماسیەتی هاوپەیوەندە بە کێشەو مەسەلەکەی کوردەوە نەدەگەیشتن ئەگەر جۆرێ لە تێگەیشتنیش هەبایە ئەوا دژە کردارو کاری بەرامبەر نەبوو.

خۆبەستنەوە بە دروشمی خودموختارییەوە، دەرگای بیرکردنەوەی لە ئەلتەرناتیڤێکی تر لەسەر داخستن، بڕیارە مێژوویەکەی دووی ڕێبەندانی1314خراپە لاوە، کە ئیختیار درابووە دەست کۆمیتەی مەرکەزیو ئەنجومەن بۆ بە ئیستیقلالی تەواو گەیاندنی کورد لەو جێگایانەی لێی دەژین.. (ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە–8– ڕۆژی 1946/1/28).

ئەوە لە کاتێکدا زۆربەی زۆری جەماوەر، زۆربەی کاربەدەستان بڕوایان بەو دروشمەو کاری ڕزگاریە هەبوو.

خۆبەستنەوە بە ستراتیجی سەربازی بەرگری... بە خۆمەڵاسدان لە سەنگەرا بۆ چاوەڕوانی هێرشی دوژمن، کە ئەمە ڕۆڵی خۆی لە هیلاکیو نائومێدی لە پەلامارو دەستپێشخەریو هەڵبژاردنی زەمان و زەمینی جەنگدا بینی، لە کاتێکدا ئەرتەشی ئێران سەربەستی جوڵەو مانۆڤەر و هێرش و پەلامار و کشانەوەی هەبوو.

هەرچەندە جیاوازییەکی گەورە لە نێوان هێزی چەکدارو چەك و تەقەمەنیو تفاقی جەنگ و کەرەسەی گواستنەوە هەبوو، بەڵام لە ڕووی توانای شەڕو ورەو باوەڕو گیانی خۆبەختکردن بۆ نیشتمان بە پێچەوانەوە تەواو لە بەرژەوەندی کورد بوو، بۆیە ئەگەر ئەو ستراتیجەو پەیڕەوکردنی ئامۆژگاری لێپرسراوانی سۆڤیەت بۆ شەڕنەکردن نەبایە ئەوا ڕەوتی ڕووداوەکان بە جۆرێکی تر دەبوو یان هیچ نەبێ جۆرێ لە گەمەی سیاسی و مانۆڤەری سەربازی و نەبزگرتن و شەڕی دەروونی دەست پێدەکرا.

هەوڵ نەدان بۆ سنوور فراوانکردن بۆ سوودوەرگرتن لە توانای مرۆیی و زەمینی و ئابووری ناوچەکانی تر، بۆ بێبەشکردنی دوژمن لێیان، بە تایبەتی ئابووری کۆمار، زۆر لاوازبوو، خەڵکی زۆر هەژاربوون، کە دەنگی هەنگاونان بەرەو ئەم ڕێبازە بەرزدەبۆوە، گوێیان لێ نەدەگیرا، کە بە هۆی دەست درێژی دوژمنیشەوە ڕووداوێ بخوڵقێنرایە، نەخشەی سوود لێ وەرگرتن دانەدەنرا هەر زوو هەلەکە لە دەست دەدرا، وەك شەڕو هێرشی(سەراو سەرچاوە و مل تەرەنی) دیسان شەڕی مامەشا، نموونەیەکی ترە کە ڕۆژنامەی کوردستان بەم جۆرە هەواڵی پێکدادانەکەی بڵاوکردەوە:

## لە جەبهە

وەکو لە جەبهە وەڵام گەیشتووە ئەم شەڕەی دوایی کە لە گردی دڵی مامەشا ڕووی داوەو دوژمن بە 3هەزار کەسەوە پەلاماری هێناوەو تانك و تۆپ و تەیارە لە ئەرزو ئاسمان پشتیوانیان لە دوژمن کردووە تەنیا بە هۆی 30کەس لە برایانی بارزانی دەستە مەلتەرەنی بە سەرەکی برای قارەمان مستەفا خۆشناو جواب دراوەتەوەو لەلایەن حەزرەتی پێشەواوە سادر بوو کە11کەس لە شەڕەکەرەکان کە یەکێ لەوان برای خۆشەویست محمد قادرییە میدالیای قارەمانی بدرێت.

زیاد لە سنووری پێویست کۆمار ئەوقی ئازەربایجان و سیاسەتی حکومەتەکەی کرا، هەر چەندە لە زۆر ڕووەوە بێسوود نەبوو، بەڵام لە هەندێ ڕووی ترەوە بێزیانیش نەبوو، بە تایبەتی ئازەرەکان ڕێبازی تایبەتی خۆیان هەبوو، رابەرو لێپرسراوە ناسیۆنالیستەکانی ئازەربایجانی سۆڤیەتیش لە هەموو ڕوویەکەوە یارمەتیدەریانبوون، بە نەخشە کوردیان دەستنگەی ئەو کۆمارە کردبوو، کاتێ ئەو ڕایە خراپە بەردەم پێشەوا کە گوایا تەواوی کوردستانی دەوڵەتیش ئوستاندار دادەنێ.. بێشك یەکەم ئوستانداریش قازی دەبێ.. هیچ جۆرە ئامادەییەکی نیشان نەدابوو بۆ قەبوڵ کردن، بێگومان ئەو یارییەش بێ مەترسی و مەرام نەبوو، کەچی ئازەرەکان لە گفتوگۆی مانگی جۆزەردان 1325یاندا لەگەڵ ڕژێم لە تەورێز، نە نوێنەری کوردیان بەسەرکردەوە وە نە مەسەلەی نەتەوایەتی کورد و کۆمارەکەشی باس کرا، هەروەك بە ئەنقەست بیانەوێ مەسەلەکە خەفە بکەن.

نەبوونی ئازادی جوڵەو دستپێشخەری، چونکە ڕووسەکان لە چەند لایەنێکەوە سنووریان بۆ جموجوڵی کۆمار دانابوو لەوانە:

نەجوڵان لەبەردەمی شەڕدا بۆ بەرگری نەبێ، خۆبەستنەوە بە خودموختارییەوە، بەردەوامی لەسەر گفتوگۆ.. بەستنەوە بە ئازەربایجانەوە. بۆیە بیر لە جوڵەی سەربازی و مانۆڤەری سیاسی، ئەمری واقیع دروست کردن، و جوڵاندنی خەڵکی کورد لە ناوچەکانی دەری سنوور نەکرایەوە، نەبوونی ئەم ئازادییە، ئەو چاوەڕوانییە، بێ دەرامەتییە، بێ ئومێدی لە تاران، جۆرێ لە بێ ئومێدی لای خەڵکی

خوێندەوار و هۆشمەند دروست کردبو، بێنەوەی سەرنجێکی وردی دیاردەی خۆبەدەستەوەدانی سەرۆك کۆمار بدریٚ، بابەتیانە لێبکۆڵرێتەوە، وا دەردەکەویٚ کە هاندەری ئەو دیاردە نائاساییە، هەر تەنها بەڵێن و سوێندەکەی لەسەر مانەوە لەگەڵ خەڵکی کورد وەك هەوڵێکی خاوکردنەوەی قینی ڕژێمی تاران بەرامبەر بە خەڵك بۆ تۆڵە، هەر سەبارەت بە بەڵێنی گیانی(سەرتیپ همایوونی) بۆ پێشەوا نەبوون، بەڵکو گەلیٚ دیاردە و هۆی تر لە ئارادابوون و لە دروست بوونی ئەو پرۆسەیە ڕۆڵیان بینی لەوانە: کشانەوەی لەشکری سوور، بیٚ نەخشەی هاوپەیوەندی بە چارەنووسی کۆمار.

ئامۆژگاری ڕووسەکان کە شەڕی ئەرتەش نەکەن.

ڕووخاندنی کوتوپڕی ئازەربایجان و ڕاکردنی ڕابەرانی و شەڕی خوێناوی.

نەبوونی پشتوپەنا، مانەوەی بە تەنها، بێچەکی قورس و هەلومەرجی بەهێزبوون و داکۆکی بەرامبەر بە هێزی دوژمن کە لەو ڕۆژگارەدا گەلیٚ هەنگاوی وەرچەرخێنەری هەلومەرجەکەی نابوو، زلهێزەکانیش یارمەتی دەریبوون.

بڕوا نەبوونی قازی محمد بە جەنگو خوێنڕشتن، بە شەڕی بێهودە، خۆ هەر لە سەرەتاوە کۆمەڵەی ژیٚ- کاف ڕێبازی خۆی لە شەڕی چەکدارو شۆڕش دیارکردبوو، دیسان نامە پارێزراوەکانی پێشەوا تیشك دەخەنە سەر ئەم بۆچوونە.

گرفت و هەڵەو بۆشایی و لاوازی و ململانێی ناوخۆ کەم نەبوون بەتایبەتی:

ناکۆکی و ململانیٚ و ڕقەبەرایەتی نێوان ئێلو تیرەو بەرەباب و بەگزادەکان.

نەبوونی دیسپلینی پێویست لەناو سوپاو چەکدارەکاندا.

لاوازی زۆر لە سەرکردەکانی حیزب و کۆمارو زوو ورە بەردان، لەگەڵ هەندیٚ سەرەك عەشیرەتدا کەوتنە بڵاوکردنەوەی گیانی خۆبەدەستەوەدان.

تەنیا هێزی جێگەی ئومێد، هێزەکەی بارزانی بوو، پێدەچیٚ پێشەوا لای ئاسان نەبووبیٚ ئەو هێزە چەتری پاراستنی بووبیٚ، بە تایبەتی هەر لە سەرەتاوە ئەو جێگەو هەلە بۆ بارزانی نەخولقێنرا کە ڕۆڵی خۆی ببینیٚ، هەروەك نامەکانی خۆشی دەریدەخەن، هەر بەو(فەرماندەی کل هێزی بارزانیان) ماوەتەوە بە پلەی(ژەنراڵ)یەوە، دانانی بەشێکی گرنگ لە هێزەکەی لکەکانی 1و 2و 3و 4 بە فەرماندەیی:

مستەفا خۆشناو میر حاج، بکر عبدالکریم، نوری احمد تەها لە ژێر فەرماندەیی ژەنراڵێکی ترا کە حەمە ڕەشید خان بوو، جێگەی سەرنجە، لە ژمارەکانی ڕۆژنامەی کوردستانیشدا شتێکی وا نابینریٚ کە پێچەوانەی ئەو قسەیە بێت، هەر چەند هەندیٚ جار لەگەڵ وەزیری هێزدا(سەیف قازی) سەردانی بەرەکانی شەڕو هێزەکانی کردووە، ڕۆڵی گرنگی لە لابەلاکردنی ناکۆکی عەشایەرییدا بینی، جگە لە ڕۆڵی هەموو هێزەکە کە لە کارەسەتەکەشدا بە یەکگرتوویی لە مەیدانەکە دەرچوو، دیسان لە سەرچاوەی بڕیار ئەو ڕۆڵەی نەدرایە.

لەگەڵ ڕووخاندنی ئازەربایجان هەندیٚ سەرەك عەشیرەت و لێپرسراوان خۆیان بەدەست ئەرتەشەوەدا، لە ڕاستیدا هەر لە دوای کشانەوەی لەشکری سوور، گەلیٚ لەو سەرەك هۆزانە ورەیان بەردا بوو، نائومێدی سەری دەرهێنا، لە دواییدا لێپرسراوانیشی گرتەوە.

کورت و پوخت زەمینەی خۆیی و بارودۆخەکەی کۆماری تێدا دامەزرێنرا، ڕەسیوو کامڵ نەبوو، بارودۆخە نێودەوڵەتییەکەش لەسەر تەماح و مانۆڤەرو بەرژەوەندی نەبوو هیچ جۆرە پێکهاتن و ڕێکەوتنیٚ بکات کە لەلایەنی کەمیٚ نەتەوایەتی و نیشتمانی کوردی تیا بێت..

سەرکردایەتی کوردیش لەو ئاستەدا نەبوو کە بزانیٚ و بتوانیٚ ئەڵقە لاوازەکانی موعادەلەکان بدۆزێتەوە و هەوڵی گۆڕانی بدات هەر لەسەر بەڵێن و چاوەڕوانی و وەرگرتنی ڕاسپاردە بڕیارەکان دادەڕێژران و سەرنجی ڕووداوەکان و پاشەڕۆژ و چارەنووس نەدرا، جەماوەریش لە ئازادی و باری دیموکراسی کە زۆر گرنگبوون بە ئومێد بوو، بەڵام لە پاشەڕۆژ و مامەڵەی ڕۆژانەو گوزەرانی ژیان لەناو گرفت و ئومێدی، چاوەڕوانی و نائومێدیدا دەژیا... بەتایبەتی ئەو هەموو ڕووناکییە سوورانە، دەردەکەوتن بێئەوەی ڕابەرانی کورد بجوڵێن و بگەنە ئاستی ڕووداوەکان، پێکهاتنی تاران و مۆسکۆ، پەیمانی نەوت، کشانەوەی لەشکری سوور بیٚ ڕەخساندنی هیچ جۆرە زەمان و دڵنیاییەك، ئەوانە زەنگی مەترسی و نیشاندانی سەردەمی وەرچەرخاندن بوون.

سۆڤیەت بە مەرامی خۆی گەیشتبوو یارییەکەی بە ئەنجام گەیاندبوو دەستبەرداری کورد بووبوو، کەچی کورد لەسەر هیواو چاوەڕوانی و بەڵێن و باوەڕی خۆی دەژیا، سەیری ڕەوتی ڕووداوەکانی دەکرد، بەو بڕوایەوە کە بەتەنها ناتوانیٚ کاریٚ بکات، کاتیٚ ساتیٚ بڕیاری چارەنووسساز هات ڕابەرانی کۆمار گەیشتبوونە بڕیاری خۆیان، بڕیاری پێچەوانەی ڕەوتی مێژووبوو، پێشەواش سەبارەت بەو هۆو هەلو مەرجانەی تیشکیان خرایە سەر خۆی کردە قوربانی، کاروانێك لە شەهیدانیش ڕابەری کرد، دوورنەبوو، ئەگەر ڕێگەی پێچەوانەی هەڵبژاردایە مێژووی ئەمڕۆ بە جۆرێکی تر نەنووسرایە، بێگومانیشە کە ڕەوتی ڕووداوەکان بە جۆرێکی تر دەبوو، چونکە ئەو بڕیارە دوا هەلبوو، بەڵام وەك لێکدانەوەیەکی لۆجیکی، ئەگەر لە ساتی هێمنی و لەسەر خۆیدا زۆر هەل لە کیس درابیٚ، ئەوا دوا هەل لە بارودۆخێکی وا سەختو قورسدا هەر دەبیٚ بەو جۆرەبیٚ، دوژمنی داگیرکەریش بڕیار لەسەر چارەنووسەکە بدات نەك خاوەن کێشەکە.

## سەرچاوە

تێڕوانینێکی سەردەم بۆ کۆمارەکەی مەهاباد،
مەحمود مەلا عززەت، چاپی یەکەم

# ڕازی هۆشیاری و هۆشمەندی

کاتێك ویژدان ئەجوڵێ و گیانی مرۆڤ ئەبزوێنێ و.. سۆزی هەستی ناسك ئەلەرێنێتەوە و... دڵی ساردوسڕ گەرم و وریا ئەکاتەوە، کاتێك ویژدان هەستی مات و خامۆش ڕائەچڵەکێنێ و هۆشیاری ئەکاتەوە و.. ڕازی زام و جەستەی ئازاردراوی پێ ئەگەیەنێت.. ئەو کاتە مرۆڤی ناو ڕووداو و کارەسات سەرنجی دەوروپشتی خۆی ئەدات و هۆشی دێتەوەبەر و ژیرانە شوێن پێی هەنگاوەکانی ئەبینێ و باری سەرنجی چڕ و تیژ و وردتر ئەبێت.. هەر لەو ساتانەشدا تێ ئەگات... بۆچی ویژدانی هاتۆتە جوڵە و چی کاری لەسەر کردووە.. هۆی مات و خامۆشی.. و سڕو وڕی بۆ دەرئەکەوێت و ئەزانێت لە جیهانێکی ئاڵۆز و جەنجاڵدا ئەژی.. ئەبینێت و تێ ئەگات جیهان هەمووی تۆڕ و داوە.. هەموو ڕۆژ و هەموو ساتێك دەیان و سەدان بێتاوانی تیا گیرۆدە دەکرێ و بە ئازار و لەشی پوکاوەوە بێگیان ئەکرێن.. تێی ئەگات جیهانی زۆرانبازی ژیان و مردنە.. دیاردەی پێکدادانی ئازادی و کۆیلەیەتی‌یە.. هی بەختیاری و ئاوارەییە.. ململانێی چەوساوە و چەوسێنەرە.. هی داگیرکراو و داگیرکەرە.. شەڕی بێ دەسەڵات و ڕووت ڕەجاڵیە و دژی دەسەڵاتدار و خاوەن سامانە چاوچنۆکەکان.. لەو ڕاستی‌یە ئەگات کە ئەو زۆرانبازی‌یە سیمای ژیانی مرۆڤە.. دەرکی پێ ئەکات کە "هەستی خەڵك.. شوێن و جێگەیان دیار و دەستنیشان ناکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە، شوێن و جێگەیان هەستیان دیار و دەستنیشان ئەکات.." ئەو ساتەش خۆی ساغ ئەکاتەوە و... بەرەی چەوساوە و زۆرلێکراوان هەڵئەبژێرێت و هەروەکو دەروێشی ناو ئەم شانۆگەری‌یە ئەبێتە سەربازی ئەو بەرەیە و تێکەڵی ئێش و ئازارەکانیان ئەبێت..

واتە: لە ناو ئازار و ئەشکەنجەی ئەو زۆرانبازی‌یە و لە ناو قووڵایی ئێشی بێ دەسەڵاتی و ئازاری دەستی خوێنڕێژان و.. لە ناوجەرگەی چەرمەسەری و زەحمەتی خۆگرتن و وورە بەرنەدان.. لەبەردەم کەرەسەی ئەشکەنجە و زەبر و پەلاماری بێ بەزەییەکان.. هەستی هۆشمەندی زیاتر هەستیار ئەبێت و ئەگەشێتەوە و چرۆ ئەکات.. هۆی پەژارەیی و نەهامەتی و چەوسانەوەی بۆ ڕوون ئەبێتەوە و.. مرۆڤ ئەبێتە خاوەن کێشە و ئیتر ڕێبازی خەبات و ئامانجی بەرەی چەوساوەکان هەڵئەبژێرێ و ئەبێتە سەربازی ئەو کاروانە.. ئەگەر چەکی بەدەستەوە بوو ئەوا پێشمەرگەیەکی سەنگەری پێشەوەی ئەو کاروانە پڕ لە شانازی و سەروەرییەیە، ئەگەر پێنووسیشی گرتە دەست ئەوا ئەبێتە جوڵێنەری وزەی مات دراوی هەژار و چەوساوەکان.. ئەبێتە مۆمی ڕۆشنکەرەوەی ڕێبازی زۆرلێکراوان دژی باری نالەباری ژیانی هاوڕێ و هەڤاڵ و برادەرانی..

کێشەی ناو زۆرانبازی مرۆڤیش، لە هەموو سەدەکانی ژیانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی‌دا، هەر لەو سەردەمەوە کە خاوەندارێتی تایبەتی پەیدا بووە، کێشە و مەسەلەی ژیان بووە.. ژیانیش مانای ئازادی و بەختیاری و ئاسوودەیی و ئاسایش و سکتێری بووە.. مانای ژیانی دوور لە ئازار و چەوسانەوەی مرۆڤ بە دەستی مرۆڤ بووە.. مانای ژیانی هاوسانی و یەکسانی بووە.. جا لە ناو زۆرانبازیی ئەو کێشەیەدا، هەر لە سەرەتاوە تا ئێستا چەوساوە و زۆرلێکراوان دژی چەوسێنەر و زۆردار و داگیرکەران جەنگاون.. چەند مرۆڤ و خەبات و کێشەکەی.. تووشی نوشوستی و هەڵنوتان و گلان و کەوتن بووبێت.. لەوە زیاتر




بەتوانا و ووزەتر لەژێر داروپەردوی نوشوستیەوە هەڵساوەتەوە و بەرەنگاری زۆرداران بۆتەوە.. کێشەکەی نەشونومای کردووە و گەشاوە تر بووە و ئیتر لە ووزەی هیچ کەسێکدا نەماوە کە دەنگی دلێری مرۆڤ کپ بکات.. زیاتر لەوەش.. و لەو ڕێرەوەدا و لە دواپلەی هێرشی زۆرداران ولوتکەی تەوژمی چەوسانەوەدا.. لە توندوتیژترین کاتی بەکارهێنانی ئاگر و ئاسندا.. لەو بارودۆخەشدا کە مرۆڤی بێتاوان و بێ ئاگا ئەکرانە قۆچی قوربانی.. زیاتر مرۆڤ هەستیار و هۆشمەند بووە و باشتر هەستی ئازاردراویی ژیاوەتەوە و خوێنی گەرم و نوێی کردۆتە لەشەوە و.. بۆتە ئاگردانی گەشاوەی خەبات و ژیلەمۆی سووتێنەری دوژمن و.. بڵێسەی خەباتی مرۆڤ زیاتر کڵپەی سەندووە و.. کەم و زۆر قەڵای زۆردارانی هەژاندووە و گەندەڵ و لەرزۆکی کردووە و جاربەجارێکیش هەرەسی پێهێناوە.. یا هەر هیچ نەبێت، دەروێشانە.. بەرامبەریان وەستاوە و ملی بۆ تاوانی زۆرداران دانەنەواندووە و خۆی کردۆتە قوربانی دەستگرتن بە ڕاستی‌یەوە، بەڕاستی بێتاوانی‌یەوە، بە بێتاوانی چەوساوەکانەوە.. بەڕاستی و ڕەوانیی خەباتی هەژارانەوە.. بەوەش هەست و هۆشی سەدان نووستووی ئاگادار کردۆتەوەو ڕاستیی کێشەی مرۆڤ و

رەچاوکردنی جیاوازییەکانی نێوان هەردوو کۆمەڵگەو هەردوو وڵات لەوبوارانەدا. لە کارەکەشم پەیوەندیی باش و دۆستانەم لەگەڵ ئەرشیفکار و پسپۆڕانی دامەزراندنی ئەرشیف هەبو. رۆژانە پەنام بۆ دەبردن و زۆر سەخی و دۆستانە یارمەتیان دەدام. سەرەنجام ئەم نوسینەیە، کە بۆ یەکەم جارە لە مێژوی کولتووری ئەرشیفی نەتەوەییماندا کارێکی وا بەم چڕی و فراوانیە بەزمانی کوردی بڵاوبکرێتەوە. هیوادارم ئەمە سەرەتاو هەنگاوێك بێت لەسەر رێبازی لێکۆڵینەوەی زیاتر و چەسپاندن و گەشەپێکردنی ئەرشیفەکانمان.

## ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان (ئەنك)[2]

ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان (ئەنك) سەنتەری کۆکردنەوەو رێکخستن و پارێزگاریکردن و پەرەپێدان و سودلێوەرگرتنی نوسراوە جۆربەجۆرەکانی سامانی مێژوویی و کولتووریی کوردستانە.

ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان لێپرسراوە لە کۆکردنەوەو رێکخستن و پارێزگاریکردن و پەرەپێدانی بەڵگەنامەو نوسین و دەستخەت و تۆمار و وێنەو ئەفیش و هەمەجۆرو بابەتێکی تر کە پەیوەندیی بە سامانی مێژوویی و کولتووری و ژیاری کۆمەڵەوە هەبێت لە کوردستاندا. لێپرسراوە لە سەرجەم ئەرشیفەکانی هەموو دایەرەو دام و دەزگا دەوڵەتییەکان (دیارە لێرەدا ئەرشیف هەر ئەو مانایە دەگرێتەوە کە سەرجەمی مەتریاڵەکانی سنووری هەردام و دەزگایەك کە ئەرشیف دەکرێ وە هیچ جۆرە کارێکیان لە دایەرەکە یان دەزگاکەدا پێنەماوەو هیچ جۆرە مەترسییەکی چونە بەرەوەی نهێنییەك کە کار لەسەر رەوتی چارەسەری کێشەکەو دوابڕیار بکات، لە ئارادا نەماوە).

واتە هەموو ئەو بەڵگەنامەو دەستخەت و نوسراوو ئەو نوسینانەی پەیوەندییان بە بەرژەوەندی گشتی و کارو ئامانجی ئەرشیفکردنەوە هەیە، جگە لەو دام و دەزگا دەوڵەتییانەکە دەسەڵاتدارێتی بەرز دیاریان دەکات وەك:- ئەنجومەنی وەزیران، وەزارەتی بەرگریی، زانکۆکان، بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش و هیتر. ئەوانیش بەپێی ئامۆژگاری و یاسا، هەر لایە ئەرشیفی خۆی دادەمەزرێنێت و لە هەموو سەردەمەکاندا دەیانپارێزێت.

دامەزراندنی ئەرشیف بۆ چەند مەبەستێکی گرنگە، سەرەکییەکانیان:

-کۆکردنەوەو پارێزگاریکردن و رێکخستن و گەشەپێدانی سامانی نوسراوی مێژووی نەتەوەیە لە مەڵبەندێکی ئەرشیفیدا.

-تا ئەو ئەرشیفە بکرێت بە مەڵبەندێکی کراوە و ئازاد بۆ لێکۆڵینەوەی بابەتی و زانستیانە.

-رێکخستنی نوسراوو بەڵگەو دەستخەت و بەڵگەنامەکان و هەموو دۆکومێنتێکی تر [3] بە جۆرێکی وا ئاسان و رێك و پێك و رون کە بتوانرێت ئەوەی پێویست بێت ئاسان بهێنرێتە بەردەست.

-بۆیە دەبێت ئەو رێکخستنە لەسەر بنچینەو پرنسیپێکی وابێت کە بزانرێت بەشی سەرەکی بەشە ناسەرەکییەکانی هەر ئەرشیفە لە کوێدا دادەنرێن و لەکاتی پێویستدا بتوانرێت بێ‌هیچ زەحمەتییەك هەر نوسراو و مەتریاڵێك پێویست بێت راستەوخۆ بهێنرێتە بەردەست. بۆئەمەش هەر لە سەرەتاوە دەبێت رێکخستن و ئەرشیفکردنی هەر بەشێك و پەل و چڵەکانی لەسەر بنچینەی ئەو پرنسیپانە بێت کە ئەو مەبەستە دەهێننە دی لەسەرەنجامیشدا ئەو تۆمارانەی بۆ کاری رێکخستنەکە دەکرێن. دەبنە دەلیلی ئەرشیفەکە هەر لە دۆسییەکەوە تا بەشە سەرەکییەکانی. گواستنەوەی هەر ئەرشیفێك لە وەزارەت و دام و دەزگا سەرەکییەکان و رێکخراو و کۆمپانیاکانەوە بۆ (ئەنك) بەپێی پرنسیپە دانراوەکان و لەسەر رێککەوتنی هەر دەزگایەك لەگەڵ ئەنك - دا دەبێت.

* هەر دەسەڵاتدارێکی بەرز، هەر لەپەرلەمان و ئەنجومەنی وەزیران و زانکۆکان و هەروەزارەتەو دایەرەکانیان، رێکخراوی پیشەیی و جەماوەریی کە کەرەکتاری رەسمی و نیمچە رەسمییان هەبێ تادام و دەزگا هەمەجۆرە سەربەخۆکان، کە بە بەرژەوەندییە گشتییەکانەوە بەستراونەتەوە، لێپرسراوە لە پارێزگاریکردنی ئەرشیفەکانی سنووری دەسەڵاتی یاسایی و بەڕێوەبەرایەتیی خۆی، هەروەك چۆن ئەنك لێپرسراوی سەرەکییە لەسەرجەمی ئەرشیفەکانی سنوری دەسەڵاتی بەڕێوەبەرایەتیی سیاسی و ئیداریی هەرێمەکە جگە لە هەستیارەکان کە دەستنیشان کراون.

دیسان بانك و رێکخراو و کۆمپانیا ئەهلی و نارەسمییەکان دەتوانن ئەرشیفەکانی خۆیان لە (ئەنك) بپارێزن دوای ئەوەی تۆمارو مەتریالەکانی کۆن دەبن و ئیتر پێویستییان پێیان نامێنێت، کە ئیتر دەبنە بەشێك لە ئەرشیفی نەتەوەیی، دوای ئەوە هیچ لایەك بۆی نییە هیچ جۆرە نووسراوو تۆمارنامەو حساباتێ بفەوتێنێت، ئەگەر ئەوان بۆ بەرژەوەندیی گشتیی و کاری لێکۆڵینەوە سوودێکیان هەبێت بۆ ئایندەی مێژووی گەشەکردنە کۆمەڵایەتی وسیاسی و ئابووری و ئاینییەکانی .. و تاد بەسوودبن.

پارێزگاریکردنی هەر ئەرشیفە لە هەر وەزارەتێکدا و تەسلیمکردنی بە ئەنك، بەپێی کۆنی و نەمانی هیچ جۆرە کارو مەبەستێك بە ئەرشیفەکەو سەرجەمی نووسراو تۆمار و مەتریالەکانی ناوێتی، یەکەم وە بەپێی ئەو ماوە یاساییانەیە کە بۆیان دیاری دەکرێن دووەم. وە سێیەمیش لەسەر رێککەوتنی ئەنك و هەر ئەرشیفێك ئەنجام دەدرێت.

هەر وەزارەتە بۆخۆی مەزنەی گرنگی و هەستیاریی نهێنییەکانی ناو ئەرشیفەکەی دەکات و بەو پێیەش بڕیاری گواستنەوەی دەدرێت.

-بەشێوەیەکی ئاسان و روون ئەرشیفەکە رێکبخات، تا ئاسان و بێ گیروگرفت بهێنرێتە بەردەست و سودی لێوەربگیرێت.

-ئەرشیفگەیەك (ئەرشیفخانەیەك) بۆ ئەرشیفەکە تەرخان بکرێت تا بە ئاسانیی هەموو دۆکومێنتەکان، جۆری رێکخستنی ئەرشیف. ناوەرۆکەکانی تێدا بپارێزرێت، و بکرێتە سەنتەرێکی کراوەو ئازاد بۆ لێکۆڵینەوەی زانستییانە، بۆئەوەش پێویستە هەلومەرجی گونجاو هەڵبخرێت و پێداویستی تایبەتیی بۆ پارێزگاریکردنی بڕەخسێنرێت.

-یەکێك لە کارو ئەرکە هەرەگرنگەکان پارێزگاریکردنی ئەرشیفەکەیە لە فەوتان و لەناوچوون.

-هیچ نووسراو و دۆکومێنت و کتێبێك نابرێتە دەرەوەی ئەرشیفەکە، وە تەنها لەناوخانوی ئەرشیفەکەدا سودی لێوەردەگیرێ وە هەر لە سنوری ئەو ماوە دیاریکراوانەشدا دەبێت کە بەڕێوەبەرایەتیی ئەرشیفی نەتەوەیی یان لێپرسراوەکانی تری ئەرشیف بڕیاری لەسەر دەدات.

-لەهەر ئەرشیفێکدا سنوری ئەو نوسراوانەی دەیگرێتە خۆی بە روونی دیاری بکرێت.

-لەناو بودجەی ساڵانەی وەزارەتی رۆشنبیریدا، بودجەی تایبەتیی ساڵانەی ئەنك تەرخان دەکرێت، بەوجۆرە کە وەك ئەرشیفێکی نوێ لەدایك بوو، بتوانێت رۆڵ و ئەرکەکانی خۆی لە باش رێکخستن و پەرەپێدان و بەرینکردنی ئەرشیفی نەتەوەیی و هەموو بەشەکانی ببینێت.

-هاوکاریی ئەرشیفە سەرەکییەکان لەگەڵ یەکتری لەهەموو ئەولایەنانەوە کە کەڵکی گشتیی تێدایەو بۆ سوودوەرگرتن لە زانیاری و تاقیکردنەوەی یەکتری لە هەموو روویەکەوە زۆرپێویستە.

-لەپاش تێپەڕبوونی ماوەی مێژوویی (ماوەی نەمانی هەستیاریی و بایەخی نهێنیی ناوئەرشیفەکە بۆ زیاندان، چی بۆ لایەنی گشتی و چی بۆ لایەنی ئیندڤید و تایبەتیی) بەسەر ئەرشیفی هەر یەکێك لەوانە، (بەپێی هەستیاری و بونی نهێنی و پێویستیی نەخستنە بەردەست) بڕیار لەسەر خستنە بەردەستی مەتریاڵە هەستیارەکان لەلایەن ئەنك - وە دەدرێت، بەپێی یاساو رێگە و شوێنەکان.

-دوای رێککەوتن لەنێوان دەسەڵاتە بەرزەکانی ئەرشیفەکاندا، دەتوانرێت ئەو ئەرشیفانە بگوێزرێنەوە بۆ ئەنك، دیسان بۆ کاتی پێویست و سود وەرگرتن لەو ئەرشیفانە لەلایەن ئەو لایەنەی کە خاوەنی بووە و پێویستییان تێی دەکەوێتەوە وەزارەتی رۆشنبیری دەتوانێت بەپێی پێویست ئەرشیف دابمەزرێنێت. ئەگەر دەسەڵاتی سەروتر ڕازیی لەسەربێت.

-بڕیارەکانی ئەنك دەبێت لەبەرتیشکی یاسا و ئامۆژگارییەکانی پەرلەمان و حکومەت بن.

-قەرزکردنی ئەرشیف لەلایەن هەر دام و دەزگایەکەوە بێت دەبێت بە ئاگاداریی ئەنك بێت.

-لەکاتی بڕیاردان لەسەر هەڵوەشانی دایەرەیەك، یان تێکەڵکردنی بە یەکێکی تر، پێویستە ئاگاداریی ئەنك بکرێت تا کاری پێویست بۆ ئەرشیفەکەی ئەو دایەرەیە بڕیار لەسەر بدات.

-ماوەی بە دەرخستنی ئەرشیف بۆ کاری لێکۆڵینەوە بەپێی ئەو بڕیارانە دەبێت کە دەسەڵاتی بەرز دیاریان دەکات کە بە گشتیی لە نێوان 30 –70 ساڵدایە، دیارە نوسراو هەیە کەهیچ جۆرە هۆیەك رێگری ئەوە نابێت زوتر بخرێتە بەردەست، هەروەك چۆن هی تر هەیە کە رێگردەبێت کە تەنانەت دوای 70 ساڵەکەش هەر نەخرێتە بەردەست تا ئەوهۆی بەردەست نەخستنە رۆڵی نامێنێت.

-جگە لەوانە ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان بەرپرسیارە لە:

-دانانی ئەو رێگەو شوێنانەی کە دەستەبەری پارێزگاریکردنی ئەو سامانە مێژووییەن بەوجۆرەی کە بەباشی دەزانێت و دەسەڵاتداری پەیوەندداری لێئاگاداردەکات و یارمەتیی پێویستیی لێ وەردەگرێت.

-لێپرسراوەکانی هەر بەشێکی ئەرشیفێك لە بچوکترین یەکەوە تا گەورەترینیان؛ لەخواروترین دایەرەوە تا بەرزترینیان بەرپرسیارن بەرامبەر بە یاساو دەسەڵاتداریی لێپرسراو، بۆ پارێزگاریکردنی ئەرشیفەکەو نهێنییەکانی و ئەنجامدانی پرنسیپەکانی دیاریکردنی ماوە یاساییەکان بۆ بەردەست نەخستنی ئەرشیف و پارێزگاریکردنی.

-ماوە یاساییەکان بۆ بەدەرخستنی هەر ئەرشیفێك، یان بەشێکی هەر ئەرشیفە، بەپێی هەستیاری و گرنگییان لەلایەن بەرزترین دەسەڵاتی یاسایی یان بەڕێوەبردنەوە دیاردەکرێ.

-هیچ جۆرە مەتریالێك ناخرێتە بەردەستی هیچ لێکۆڵەرێك ئەگەر لێپرسراو لێی لەوە دڵنیانەبێت کە نهێنییەکی لەوبابەتە باسکراوانەی تێدا نییە.

-بۆیە باش وایە لە سەرەتادا لەسەرخۆ و بەهێمنی و دوای لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەل و هەڵسەنگاندنی هەمولایەنە هەستیارەکان کە پەیوەندیان بەنهێنی و پارێزگاریکردنییەوە هەیە کارەکان ئەنجام بدرێت و دوایی تر ئەولایەنانەی تر بەسەربکرێنەوە. بەوەش باشتر ئەنجامی دروست و بێ هەڵە لە جێبەجێکردنی کارەکاندا بەدەست دەهێنرێت. جگە لەو بابەتانەی کە هیچ جۆرە مەترسییەکی لەوجۆرانەیان لەسەر نییە.

بەگشتیی هەموو ئەو ئەرشیف و مەتریال و نوسراوانەی پەیوەندییان بە بەرژەوەندیی گشتیەوە هەیەو پێویست دەکەن نهێنی و ناوەڕۆکەکانیان بپارێزرێت، دیسان ئەو نووسینانەی پەیوەندییان بە ئازادیی و ناو و ناوبانگی تاکەکەس و خێزان و کێشەو گرفت و روداوەکانیانەوە هەیە، درێژترین ماوەی نەخستنە بەردەستیان بۆ دادەنرێت کە بە گشتیی لە سنووری (70) ساڵدا دەبێت. جگەلە هەندێ نوسراوی هەستییار کە پەیوەندییان بە ئیندڤید و نهێنی خێزان و ناو ناوبانگیانەوە هەیە کە حساب بۆ

ئەوەدەکرێت کە ئایا لە ژیاندان یان نە، خۆ ئەگەر لە ژیاندا بون وا دەبێت ماوەکە لەوە درێژتر بکرێت، کە ئەمەش لێپرسراوی ئەرشیف و کارمەندی لێپرسراوی ڕاستەوخۆ لە نوسراوی لەو بابەتانە بەرپرسیارن لەوە.. ئەرشیفی نەتەوەیی وە ئەو لێپرسراو و فەرمانبەرانەی کاری سەرپەرشتی و پارێزگاریکردنی ئەم جۆرە ئەرشیفانەیان پێ سپێردراوە، لێپرسراون لە نەدرکاندن و نەبردنە دەرەوەی نوسراو و هیچ نهێنییەك و باسێکی لەو بابەتانە، بەدەم یان بە نوسراو یان بەهەر ڕێگەیەکی تر بێت، وە ڕاستەوخۆ لێپرسراون بەرامبەر بە یاسا ئەگەر شتێك لەوجۆرە ڕوبدات، لەم کاتەدا دەسەلاتی یاسایی و جێبەجێکردن، دەکەونە لێپرسینەوەو لێکۆڵینەوە بۆ وەرگرتنی بڕیاری پێویست..

## دامەزرێنەران و لێپرسراوانی ئەرشیف ئەمانەن:

-ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان (ئەنك): لێپرسراوە لە سەرجەمی ئەرشیفەکان، جگە لەم ئەرشیفانەی خوارەوە:

-ئەرشیفی پەرلەمانی کوردستان. ئەرشیفی تایبەتیی خۆی دەبێت و ڕاستەوخۆ لێپرسراویشێتی.

-ئەرشیفی ئەنجومەنیی وەزیرانی کوردستان: ئەرشیفی تایبەتیی خۆی دەبێت و ڕاستەوخۆ لێپرسراویشێتی.

-ئەرشیفی وەزارەتی کاروباری پێشمەرگایەتیی و بەرگریی: ئەرشیفی تایبەتیی خۆی دەبێت و خۆشی لێپرسراوێتی.

-ئەرشیفی زانکۆکان، هەریەکەیان ئەرشیفی تایبەتی خۆی دەبێت و ڕاستەوخۆش لێی بەرپرسیارە.

-ئەرشیفی پۆلیس، ئاسایش: هەریەکەیان پێکەوە، بەپێی جۆری نیکی و تێکەڵاویی ئەو دوو دەزگایە کە بەپێی سستێمی سترەکتوری دەولەت و حکومەت دەگۆڕرێت، ئەرشیفی تایبەت بەخۆی دادەمەزرێنێ و هەر خۆشی لێی بەرپرسیارە..

-ئەو ئەرشیفانەی تر کە دامەزراندنیان بە پێویست دەزانرێت.

## یاساو بڕیارو ئامۆژگاریی
## بۆ ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان (ئەنك)

پرنسیپ و ڕێگەو شوێنی بەڕێوەبردنی ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان، ڕێکخستنی کاروباری هاوپەیوەند بە ئەرشیفەوە، (بەشێوەی ئاسایی، پەرلەمان دایدەنێ، بۆ ئەم پلەیەی بارودۆخی کوردستان. لەجێگەی ئەو ئەنجومەنی وەزیران ئەو ڕۆڵە دەبینێت چونکە لە بارودۆخی ئێستادا پەرلەمان پەکخراوە. وەزارەتی ڕۆشنبیری ڕاستەوخۆ لەسەرپەرشتی و بەڕێوەبردنی ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان بەرپرسیارە. بۆشی هەیە ڕاسپاردەو ڕێنمایی پێویستی ئەرشیفەکە بکات، بەمەرجێك لەبەر ڕۆشنایی یاساو بڕیارەکانی پەرلەمان و حکومەت بن.

## سنووری کارو دەسەلاتی ئەنك

-ئەنك جگە لەو ئەرشیفانەی ئاماژەیان بۆ کرا، لێپرسراوە لە هەموو ئەرشیفە حکومەتی و نیمچە ڕەسمیی و هەموو ئەو ئەرشیفە تایبەتییانەش کە پێی دەبەخشرێت، یان پێی دەسپێردرێت. دیسان:

-وەزارەتی ڕۆشنبیری ئۆرگانی سەرەکیی بەڕێوەبردن دادەنێت پاش ڕەزامەندیی ئەنجومەنی وەزیران.

-وزارەتی ڕۆشنبیریی بەڕێوەبەری گشتیی ئەنك و بەڕێوەبەرێتێکە دادەنێ، دوای ڕەزامەندیی ئەنجومەنیی وەزیران.

-ئەو یاساو بڕیارانەی پەیوەندیان بە ئەرشیفەکانی حکومەتییەوە هەیە، ئەرشیفەکانی نیمچە ڕەسمیش دەگرێتەوە.

-مافی ئەندامانی کۆمەڵ لە بینینی ئەرشیف مسۆگەر دەکرێت بەتایبەتی بۆ کاری لێکۆڵینەوە، بەمەرجێك ماوەی یاسایی بەسەر ئەو ئەرشیفەدا تێپەڕ بوبێت، یان هیچ زیانێکی بۆ بەرژەوەندیی گشتیی و پارێزگاریکردنی نهێنییەکانی ئەندامانی کۆمەڵ نەبێت و کار نەکاتە سەر ئازادیی هەڵوێستی ئیندڤید.

-بۆ گەیشتن بە بڕیاری ڕاست و دروست و دادپەروەرانە، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵ و گەیشتنە مەبەستی ڕاستیی، ئەنك ڕێگەو شوێن دادەنێت و ماوە هەڵدەخات تا سوود لە ئەرشیفەکە وەربگیرێت.

-ئەرشیف لە خزمەت کاری لێکۆڵینەوەو پشکنین و توژینەوەدا دەبێت لە سنوری یاساو ئامۆژگارییەکاندا.

-ئەرشیفی دەولەت (حکومەت) بۆی هەیە ئەرشیفی ئیندڤید، یان کۆڕو کۆمەڵی پیشەیی، وەرزش، ئابووری سیاسی، ئایینی.. تاد (بۆ پارێزگاریکردن یان بەخشین) وەربگرێ و بەشێکی تایبەتیی بۆ ئەم بابەتە بکاتەوە بۆ هەمان مەبەستەکانی ئەرشیف و بۆ پارێزگاریکردنی ئەو نوسراوانەی خزمەتی گشتییان تیا دەبینرێت. بۆ گەیشتنە ئەو مەبەستانەش پێویستە:

• هەر وەزارەت و بەڕێوەبەرێتی و دەزگایەك، هەر لەسەرەوە تا بچووکترین یەکەی بەڕێوەبردن و کاری دەولەتیی، ئەرشیفی خۆی دابمەزرێنێت و بەڕێکوپێکی بەڕێوەی بەرێت، بۆ ڕواندنی کارەکەش ڕێنمایی لە ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان و وەزارەتی ڕۆشنبیریی وەربگرن.

• ئەگەر بەڕێوەبەرێتییەك هەڵوەشێنرا، وا ئەرشیفەکەی دەگوێزرێتەوە بۆ دەزگای حکومەتیی بەرزتر، ئەگەر هەبو، دەنا بۆ ئەنك دەگوێزرێتەوە.

• بەڕێوەبەرایەتیی هەر ئەرشیفێك بۆی هەیە ئەرشیفی دەزگاکانی خوارخۆی بگرێتە خۆی، یان سەرپەرشتیی بکات، یان لە کاتی کۆن بون و نەمانی هیچ پێویستییەك پێی بیگوێزێتەوە بۆ ئەرشیفی سەروتر، بەلام ئەم کارە بەراوێژو بڕیاری هەردولا جێبەجێ دەکرێت.

• بۆئەوەی ئەرشیف لە باشترین شێوەدا بپارێزرێت، پێویستە هەر بەڕێوەبەرێتییەکی ئەرشیف، بایەخی تەواو بدات بە کۆکردنەوەو هەڵگرتن و ڕێکخستنی دۆکومێنتەکان بەپێی بایەخ و گرنگیی هەر نوسراوە بەپێی ئامۆژگارییەکان.

• بەڕێوەبەرایەتیی ئەرشیف دەبێت هەل و مەرجی گونجاو بۆ پارێزگاریکردنی ئەرشیف لە ئەرشیفخانەکەدا برەخسێنێت، بەتایبەتی لە رووی: نەبردنە دەرەوەو قەرزکردن و نەفەوتاندن، لە ئاوو هەواو لافاو و کارەساتی سروشتکردی تر، لە تەڕوتوشی، جرِوجانەوەرو مشك و مار و مێرو.

• لەکاتی بەکارهێنانی نوسراوەکاندا گرنگیی تەواو بدرێت بەچۆنییەتی ئەو بەکارهێنانە، شێوەی بەکارهێنان، کە هەموی لەگەڵ پارێزگاریکردنی دۆکومێنتەکاندا گونجاوبن.

## ئەرشیف بۆچی..؟

یەکێك لە مەبەستە هەرە سەرەکییەکانی ئەرشیف دامەزراندن، لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی کاروانی ژیانی کۆمەڵ و دەوروبەرێتی، ئەمەش وادەخوازێت کە دۆکومێنتەکان وا ڕێکو پێك و ئاسان ئەرشیف بکرێن کە لەکاتی پێویستدا ئاسان بهێنرێنە بەردەست.

بۆ ئاسانکردنی ئەو هێنانە بەردەستەش، دەبێت ئەرشیف لەسەر شێوەیەکی وا ڕێك و پێك و بە پرنسیپ ڕێکبخرێت کە ئەومەبەستە، واتە هێنانە بەردەستی هەر بابەتێکی ئەرشیفەکە، ئاسان و بێ ئەرك و ئاڵۆزیی بێت، بۆ ئەمەش هەر لەیەکەم هەنگاوی دامەزراندنی ئەرشیف و ڕێکخستنی بەشە سەرەکی و ناسەرەکی و پەل و چڵەکانییەوە، دەبێت تۆمار بۆ سەرجەمی ئەرشیفەکە و بەشەکانی بکرێت، لەسەرئەو بنچینەو شێوەی ڕێکخستنانەی خراونەتە بەرچاو، کە ئەمەش دەبێت بە کلیلی نەخشەی ئەرشیفەکەو دەتوانرێت ئاسان بگەینە شوێن و ژوورو ڕەفەو خانەی هەر مەتریاڵ و نوسراوێك کە مەبەست بێ بویستریت بهێنرێتە بەردەست، چونکە هەمان ناو و پیت و ژمارەش لە ژوورو ڕەفەکان دەنوسرێت.

بایەخە سەرەکییەکانی تری ئەرشیف

-مەڵبەندی پارێزگاریکردنی سامانی مێژوویی و کولتوریی نەتەوەیە، بەیارمەتیی دەسەڵاتی دەوڵەتی و سیاسی و سەرجەم ئەندامانی کۆمەڵ.

-سەنتەری کۆکردنەوەو ڕێکخستن و پەرەپێدان و گەشەپێکردنی دۆکومێنتە هەمەجۆرەکانە، بەوجۆرەی کە شارستانێتیی نەتەوەو گەشەکردنەکان لە ناو کاروانی ژیانیدا دەربخات.

-تا مەڵبەندی ئەرشیفخانە بکرێتە سەنتەری زانستیانەی لێکۆڵینەوە لە ژیانی هەمەلایەنەی کۆمەڵ و دەوروبەری و نیشتمانەکەی، تا ئەرشیفخانەکەش ببێتە سەنتەرێکی ئازاد بۆ لێکۆڵینەوە، بە جۆرێك کە ببێتە یارمەتیدەری گەشەکردنی ژیانی دیموکراسی و وشەی ئازاد.

## سەرەتا بۆ ڕێکخستنی ئەرشیف

لە دامەزراندنی ئەرشیفدا، بەگشتیی، باشتر وایە سستێمی ڕێکخستنەکە بەپێی دابەشکردنی جوگرافیی، پارێزگاو ناوچە و شارو شارۆچکە، لەگەڵ هەر یەکەیەکی جوگرافیشدا بە پۆلێنکردن بە بابەت، بریار لەسەر دراو و ئامادەبێت، بەپێی دابەشکردنی ناوچەی جوگرافیی و دابەشکردنی بەڕێوەبەرایەتی (پارێزگاو شارو قەزاو ناحیە) یان بابەتی جۆراوجۆر، یان هەردوکیان، نوسراوەکان بەپێی پەیوەندییان بە بەشە سەرەکییەکانەوە، بەسەریاندا دابەش بکرێن، بۆیە دەبێت پێشەکی بەشە سەرەکییەکانی هەر ئەرشیفە دیاریکرابێت، وە بۆ هەریەکەیان پیتێکی گەورە کرابێت بە ناوی (ڕەمز)، وەك لە نمونەی پیشاندراودا دەبینرێت.

ئەم سستێم و ناونانی بەشە سەرەکییەکان دەبنە سستێم و ناوی بەشە سەرەکییەکانی یەکەیەکەی ئەرشدفەکانی ناو ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان، دیسان بۆ هەموو ئەرشیفەکانی تریش. بەڵام ئەرشیفی وا هەیە بەپێ. مەتریاڵەکانی سنورەکەی هەموو ئەو بەشە سەرەکییانە جێگەیان نابێتەوە، یان بابەتەکان جیاوازییەکی چاوێنییان هەیە لەگەڵ سەرجەمی ئەرشیفەکانی تردا یان زۆربەیان.. لەم حاڵەتەدا دەتوانرێت پیتی کەمتر، یان زیاتر بەکاربهێنرێت.. یان دەتوانرێت بەپێی بابەتەسەرەکی و گرنگەکانی نوسراوەکانی دام و دەزگاکە بەشە سەرەکییەکان دیاری بکرێت و بەهەمان ئەو پیتە گەورانە دیاریبکرێت، باشتریش ئەوەیە کە بە ژمارە لەتەك پیتە گەورەکەی هەر بەشە بێت، ئینجا هەر بەو پێیە مەتریاڵەکان بەسەر یەکەی هەر بەشێکی ناسەرەکیدا دابەش دەکرێن. هەر گروپێك لەمانە زنجیرەیەك پێکدەهێنن، واتە زنجیرەیەك لە دۆسێ و فایل و کارتۆن، هەر فایلێك، دۆسێیەك یان کارتۆنێکی هەر زنجیرەیەك بەپێی ئەو نموونەیەی کە لە شوێنی خۆیدا دەیخەینە بەرچاو بەپێی پیتی گەورەو ژمارەو پیتی بچوك، ناوێکی تایبەتی بۆ دەخوڵقێنێت. زنجیرەکانیش هەر لە ژمارە یەکەوە دەست پێدەکات تا دواژمارە کە بەردوا دۆسێ یان فایل یان کارتۆن دەکەوێت کە هەر بەو پێیانەش لە تۆمارەکاندا دەنوسرێن..

## ڕێنمایی گشتیی
## بۆ دەستپێکردنی دامەزراندنی ئەرشیف

باش وایە لە سەرەتادا هیچ جۆرە مەتریاڵێك کە سادەترین مەترسیی ئەو جۆرەدیاردانەی لەسەر بێت نەخرێتە بەردەستی هیچ کەسێك. خوێنەرو لێکۆڵەربێت یان لێپرسراوێك کە پەیوەندیی بەکاری ئەرشیفەکەوە نییە، هەموو کەسێك بە لێپرسراو و

فەرمانبەرو گشت ئەندامانی کۆمەڵەوە لێپرسراون لە پارێزگاریکردنی ئەرشیف و هەموو نهێنییەکانی، ئەمەکارێکی نیشتمانی و ئەرکێکی دڵسۆزانەیە بۆ نەتەوە، دەبێت هەموو کەسێك بە ویژدانێکی زیندووەوە هەست بە لێپرسینەوەو خزمەتی گەل و وڵاتەکەی بکات و ئەو ئەرکە بگرێتە ئەستۆ.

-هیچ جۆرە مەتریاڵێك ناخرێتە بەردەستی هیچ کەسێ ئەگەر لێپرسراو لەوە دڵنیا نەبێت کەنهێنییەکی لەوبابەتە باسکراوانەی تێدا نییە،

-ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان، بەیارمەتیی وەزارەتی رۆشنبیری و هەمو دامو دەزگا حکومەتییەکانی تر و رێکخراوە جەماوەرییەکان و هەموو هاوڵاتییان، لێپرسراوەتیی یەکەمیان دەکەوێتە سەرشان بۆ بلاوکردنەوەی هوشیاریی ئەرشیف و پارێزگاریکردنی سامانی مێژویی و کولتوریی و رونکردنەوەی گرنگییەکانیان، لە فێرکردن و هاندانی هەموان بۆ رۆڵبینین لەو بوارەدا لەلایەك وە هاوکاری و یارمەتیدان لەکۆکردنەوەو رێکخستنی دۆکمێنت و بەڵگەنامەو نوسراو، لەرێگەی کۆڕو کۆبونەوەو سیمیناروپەنێل و ئامرازەکانی میدیا (رۆژنامەو بڵاوکراوەو رادیۆو تەلەفیزیۆن) و کۆنفرانس و هەرشێوەیەکی تر.

-ئەنك لەناو لێپرسراوەتیی بڵاوکردنەوەی هوشیاریی و بایەخی ئەرشیفدا دەبێت هەوڵ بدات نوسراوی ئەو بابەت و بوارانەی لە فەوتان رزگاریان بوە تا ئێستا ئەرشیف نەکراون، کاریان لەسەربکرێت، دانانی نەخشەو ئاراستەکردنی چالاکیی بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی هوشیاری لەم بوارانەدا. بگرێتە ئەستۆ. نەهێڵرێت وەك لەمەوبەر لەسەردەمە جۆربەجۆرەکاندا کراوەو نوسراو و مەتریاڵە کۆنبووەکانیان فەوتاندووە، ئەوە رووبداتەوە. بەڵکو دەبێ ئەرشیف بکرێن و بپارێزرێن. تا لە سەرەنجامدا بۆ ئەرشیفی نەتەوەیی بگوێزرێنەوە. ئیتر سنوری ئەوانە هەمو ئەو لایەنانە دەگرنەوە کە پەیوەندییان بە ژیانی دەوڵەتی و کۆمەڵایەتی و بەڕێوەبردن و لایەنەکانی ترەوە هەیە. بۆ نمونە: تۆمار و نوسراوی سەرجەم دۆکمێنتەکانی دایەرەی تاپۆ، شاروانییەکان، خەستەخانەکان. پەروەردەو قوتابخانەکان، تۆمارەکانی هاوپەیوەند بە منداڵ بون و ناونان، مردن و شەهادەی وەفات، تەسجیلکردنی میرات و دابەشکردنیان وەهەوڵدان بۆ نرخاندنی یەکە یەکەی کەل و پەلەکان و نوسینی مەزەنەی نرخی هەر شتە لەتەنیشتییەوە کە سوودیان هەم بۆ بەعەدالەت دابەشکردنی میراتەکە دەبێت و هەم بۆ ئاییندەی مێژوو بایەخی تایبەتیی خۆی دەبێت. ئەرشیفی "ناو" بە هەموو چەشنەکانییەوە وەك ناوی جوگرافیی: ئەرشیفی (ناو) ناوی ناوچەوشوێن و شارو دێهات و روبارو دەشت و دۆڵ و چیا.. تاد، بە هەوڵدان بۆ دیاریکردنی ناو گۆڕین لەسەردەمە جیا جیاکاندا ئەرشیفی زمانو دیالێکتو بیرەوەرییەکانی خەڵكو تۆمارکردنیان لەرێگەی قسەی ئاسایی، گۆرانی وەحیکایەت گێڕانەوە، ئەرشیفی وێنەو دەنگ بە هەمو وجۆرەکانییەوە، نەخشەو ئاڵاو پولی پۆست و پارە و ئەفیش.. وە هەموو ئەولایەن و بابەتانەی تر کە لایەك یان چەند لایەنێکی ژیانی کۆمەڵ، شارستانێتی و گەشەکردنە جۆرەبەجۆرەکان دەردەخەن.. تاد

## پرنسیپە سەرەکییەکانی تۆمارکردنی کاری رۆژانەو پارەنووسی.. ئەو مەتریاڵانەی دەبنە ئەرشیف

هەر باس و کێشەو مەسەلەیەك لە هەردام و دەزگایەکدا، هەر لە سەرەتاوە لەبەردەم لێپرسراوانی هەر بەشێك بە چەند هەنگاوو ئاستێکدا تێپەردەبێت تا دەگاتە ئەنجام.. لە رێرەوی کارو جۆری ئیشکردن لە دەستپێکردنەوە بۆ بەردەوامبون لەسەر ئەو کارە، بۆ وەرگرتنی دوابڕیار یان دواهەڵوێست و بەلاداخستنی کێشەکەو کۆتایی پێهێنانی.

-نوسراوەکان لەبەردەستدا دادەنرێن ئەگەر رۆژانە کاری لەسەر بکرێت، یان لە شوێنێکی تەرخانکراو بۆ ئەو جۆرە کارە تەواونەبووانە دادەنرێن.. تا ئاسان بهێنرێنە بەردەست بۆ بەردەوامبون لەسەر کارەکە تادوابڕیار..

-ئەو نامەو نوسراوانەی کە دێن، بە جیاکردنەوەی ئەوانەی پێویستییان بە کار لەسەر کردن یان بەوەڵامدانەوە هەیە، وە ئەوانەی کە پێویستییان پێی نییە و بڕیاری ئەرشیفکردنیان دەدرێ. یا کامیان پێویست دەکات لە بەردەستدا بمێنێتەوە تا کاریان لەسەر بکرێ بۆ گەیشتنە دوا بڕیار، ئەوەش پێویست دەکات کە نوسراوەکانی بەردەم لەو شوێنانەدا دابنرێن کە بۆ کاری تەواونەبوو تەرخان دەکرێن..

-کارێك کە تەواو کراوبێت و هیچ جۆرە باس و خواسێکی لەسەر نەمابێت و ئیتر پێویست بە هێشتنەوەی ناکات، وا لە ئەرشیفی دەزگاکەدا رێکدەخرێت.

-مەزەنەکردنی کاتی تەواوکردنی کارەکان لەسەر مەتریاڵی کێشە، روداو یان باسێك لە سنورێکی ئاسایی و مەعقوڵدایە یاننە؟

-کارەکان بەشێوەیەکی باش دابەش کراون و لێپرسراوەتیی هەریەکە بۆ هەرکارە دیارو دەستنیشان کراوە؟ ئایا بەپێی کارەکەو لێپرسراوەتی و شارەزایی هەر فەرمانبەرە رەچاوی بە لانس لەو دابەشکردنەدا کراوە..؟

ئەوانە هەموو زەمینەی باش و لەبار هەڵدەخەن بۆ رێك و پێك کردنی کارەکان و بەردەوامیی رۆتینی کارکردن و تەواوکردنیان.. دیسان زەمینەیەکی باش دەخوڵقێنن بۆ زانینی چارەنوسی هەر نوسراو و بڕیارو پرۆژەیەك..

ئەگەر ئەرشیفکردن جگە لە پارێزگاریکردن، بە جۆرێك نەبێت کە هەرکاتێك هەر نوسراوێك بێت، بزانرێت چۆن دەهێنرێتە بەردەست و لەکوێ دانراوە، بەپێی ئەو لیستانەی بۆ سەرجەمی ئەرشیفەکە

دەکرێت، وا هیچ مانایەك بۆ ئەرشیفکردنەکە نامێنێتەوە.. بۆیە دەبێت لە قسەکردن لەسەر هەر نوسراو و کارو بڕیار و پرۆژەیەك بزانرێت:

–تا ئەوکاتەی نوسراو و تۆمارەکان لەبەردەستدان، دەبێت بزانرێت ئایا کاربۆ تەواوکردنی ناوەڕۆکەکانیان یا هەر کێشەیەکی تری هاوپەیوەند پێوەی یان نزیك لێی ماوەو ئیشی لەسەر دەکرێت.. یاننە؟

– دوای تەواوبوونی کار لە سەر هەر نوسراو و تۆمارێك، ئایا بڕیاردراوە کە لەبەردەست لابرێت و ئەرشیف بکرێت؟ دیسان لەسەر تۆماری کاری رۆژانە بڕیاری تەواوبون و لابردنەکە نوسراوە..؟

–شوێنی ئەرشیفکردنەکەی بەپێی ئەو پرنسیپانەی ئەرشیفەکانیان لەسەر ڕێکخراوە، دەستنیشان کراوە یان نە؟..

–ئایا هیچ جۆرە گومانێك لەسەر بژارو پاکژکردنی هەیە؟ ئەگەر هەبو لەسەردۆسیێکەی و لیستەی تایبەتیی بژارو پاکژکردندا ئەو تێبینیە بنوسرێ.

–هەر بەو پێیانە لە چیدا دانراوە، فایل دۆسی، کارتۆن دەبێت بنوسرێت.

–ئیتر بەو پێیانە چارەنوس و شوێن و رادەی کار لەسەر هەر باس و نوسراو و بڕیارێك تەواو لەبەرچاو دەبێت. کاتێك هەر باسێك، کێشەیەك، بڕیارێك، پرۆژەیەك.. تاد تەواو دەکرێت، واتە دواحوکم یا بڕیار داڕشتنی خۆی وەردەگرێت، سەرجەمی نوسراوەکانی هاوپەیوەند بەهەر یەکێکیانەوە لە دۆسێ یان فایل یان کارتۆنی تایبەتیدا دادەنرێن، مانای وایە ئیتر ئەم مامەڵەیە، ئامادەیە بۆ ئەرشیفکردن و پێویست ناکات لەبەردەستدا بمێنێتەوە.. دوای نوسینی زانیارییە پێویستەکان وەك پێشتر ئاماژەیان بۆ کرا، و وەك لە شوێنی تایبەتی جۆری ڕێکخستنی ئەرشیفدا دەرخراوە، شوێن و خانەو رەفەی تایبەتی خۆی بۆ دیاریی دەکرێت کە بۆ ئەم بابەت و ناو و جۆری مەتریالە ئەرشیفکراوانە بەپێی ئەو نوسینانەی سەر دۆسێکەو بەپێی دیاریکردنی جێگەی دۆسێکە لە بەشەکانی ئەرشیفی سەرەکیدا دادەنرێن، ئیتر بنچینەی دانان و ڕێکخستنەکە لەسەر هەر شێوەیەك بێت کە لە سەرەتادا بڕیاری لەسەردراوە، واتە لەسەر بنچینەی کرۆنۆلۆجی بێت، یان لەسەر بنچینەی ناوچەو شارو گەڕەك و دێهات یان لەسەر بنچینەی بابەت و کێشە، یان لەسەر بنچینەی ئەلف و بێ و ژمارە، وە یا (ناو) یان بەهەر شێوەیەکی تربێ.

## پرنسیپە سەرەتاییەکان بۆ ڕێکخستنی ئەرشیف

هەموو ئەو نوسراو و مەتریالانەی بەشێك لە چالاکیی کۆمەڵ دەردەخەن و، دەبن بە بەشێك لە مێژوو کولتوری نەتەوەو نیشاندانی لایەنێکی ژیانی کۆمەڵگە، و دەشبنە بەشێك لە میتۆدو شێوەی کاروفەرمان ئەنجامدان و دەرخستنی شێوەی کاری بەڕێوەبردن و ئەزمونە سیاسیی و ئابوری یاساییەکان و جۆری گەشەکردنە هەمەلایەنەکان.. تا ئەوانە ئەرشیف دەکرێن.

–کاتێك ئەرشیف دادەمەزرێنرێت کە نوسراو، داخوازیی، نامە، وەسڵ، پرۆتۆکۆڵ، بڕیار، وەڵام.. تاد دێتە بەردەست، ئیتر لە شوێنێکی ترەوە هاتبێت یان هی دایەرەکە خۆی یان دەزگا، ڕێکخراو، کۆمپانیا.. تاد، بێت کە بەپێی زنجیرەی مێژووی ناردن یان گەیشتنی هەریەکەیان ژمارەو مێژوی تایبەتییان دەخرێنە سەرو ئەرشیف دەکرێن، بە دانانیان لە دۆسی، فایل، کارتۆن یان هەرجۆرێکی تر بێت لە جۆری هەڵگرتن و بونی دووتوێیەك کە ئەم مەتریالانە، بگرێتە خۆی، و لە شوێنی تایبەتیی خۆیاندا دادەنرێن کە لە تۆماری تایبەتیی ئەرشیفیشدا دەنوسرێن، وە کە لە دواییدا دەبنە کلیل یان دەلیلی جێگەی یەکەیەکەی بەشەکانی هەر ئەرشیفە. لە راستیدا زەمینەی دامەزراندنی ئەرشیف لەو هەنگاوە سادەیەوە دەست پێدەکات.

–بەپێی یاسای ئەرشیف، سەرجەمی دایەرەو دام و دەزگا دەوڵەتییەکان، هەر لە بچووکترین یەکەیەوە تا بەرزترینیان، هەریەکە لێپرسراوە لە ڕێکخستنی ئەرشیفی خۆی، لەسەرجەمی ئەو مەتریاڵ و نوسراو و نوسخەی دووەم و تۆمارانەی پەیوەندییان بە کاروبارو چالاکییەکانییەوە هەیە.

–هەر دایەرەو دام و دەزگاو ڕێکخراوە، بۆ پارێزگاریکردنی چالاکییەکانی خۆی و جۆری ئەو خزمەت و کارانەی کەکردوویەتی و وەتا بزانرێت چیی کردوە و چۆنی ئەنجام داوە تاتواناى خەڵکانی چالاك و بە تواناو خزمەتگوزار و بەرژەوەندی میللەت ویست جێگەیان دیاربێت و وەك نموونەیەك لەبەرچاوبن و چاویان لێبکرێت و خزمەتەکانیان لەبەرچاو بێت. تا لە پاشەرۆژیشدا لە مەیدانە جۆربەجۆرەکاندا سودیان لێوەربگیرێت. ئەوانەش دەبنە هاندەر بۆئەوەی کە هەریەکە ئەرشیفی خۆی دابمەزرێنێت..

–رەنگە بۆ هەموان ئاسان نەبێت کە بزانرێت کامە نوسراو و نامە.. تاد گرنگە و کامە گرنگ نییە بۆ ئەرشیفکردن. بۆیە پێویستە سەرجەمیان بپارێزرێن، تا کۆمیتەی تایبەت بەکاری بژارو پاکژکردن بڕیاری لەسەردەدات، ئەمیش بەپێی ئامۆژگاری و پرنسیپە سەرەکییەکانی ئەم لایەنەو دوای خوێندنەوەو نرخاندنی هەر نامەو نوسین و تۆمارە.. تاد بڕیاریان لەسەر دەدات، وەك لە دواییدا زیاتر روناکییان دەخەینەسەر.. بۆیە بەرژەوەندیی گشتیی وا دەخوازێت کە سادەترین نوسراو بپارێزرێ و بخرێتە ناو ئەرشیفەکەوە..

–کاتێك ئەرشیفی دایەرەیەك دەگوێزرێتەوە بۆ سەروتری و سەروتریش بۆ ئەنك کە ئەو نوسراو و مەتریاڵە ئەرشیفکراوانە کۆن بوبن و هیچ جۆرە پێویستی و کارێکیان پێ نەمابێت و هیچ جۆرە چاوەڕوانیەکی ئەوەش نەکرێت کە لە ئاییندەدا ئەو دایەرەیە پێویستیی بەو نوسینانە دەبێتەوە..

## نمونەی پلان بۆ دامەزراندنی ئەرشیفێ..

دیارە شێوەی ڕێکخستن و داڕشتنی هەر ئەرشیفێك، دەکەوێتە سەرخودی ئەرشیفەکە. مەبەستم ئەوەیە کە هەر ئەرشیفێك زۆریی یان کەمیی مەتریاڵ و بەش و بابەت و پەل و پۆو چڵەکانی، پلانی دامەزراندن و داڕشتنی سترەکتوری ئەرشیفەکە دیاری دەکەن..

بێگومانیشە کـە چـەند جۆرێکـەو شـوێن هەیـە بـۆ ڕێکخسـتنی ئەرشیف..

-باشترین شێوە بۆ ڕێکخستنی ئەرشیف و بەشە جۆراوجۆرو پۆل و پەلەکانی، ئەوەیە کە لەسەر بنچینەی پیتی گەورەو بچوك و ژمارە ڕێکبخرێ. ئەم سیستێمی ئەرشیف دامەزراندنە لە زۆر وڵاتی دنیا، بەتایبەتیی ئەورووپا پەیرەو دەکرێت.

-هـەر ئەرشیفە بـەپێی گـەورەیی و بچوکیی، زۆری مـەتریاڵ و نوسراو، زۆرو کـەمیی بەش و بابـەت و بـاس و نـاوەڕۆك، دەکرێـت بەچەند بەشێکی سەرەکییەوە، هـەر بەشێکی سـەرەکیی بە پیتێکی گەورە ناودەبرێت..

-بڕیاردان لەسـەر هـەر بەشـێکی سـەرەکی لەهـەر ئەرشـیفێکدا بەپێی گەورەیی و گرنگیی و ڕۆڵی ئەو بابەتەیە لە کاروچالاکیی دام و دەزگا دەوڵەتییەکەدا، هـەر ئەولایەنەشـە کـە بڕیـار لەسـەر زۆر و کەمیی بەشەکانی هەر ئەرشیفێك دەدات..

-لەهـەر بەشـێکی سـەرەکیدا، بـەپێی کـەم و زۆریـی بابـەت و مەتریاڵـەکان، بەشـە ناسـەرەکییەکان پۆلێـن دەکرێـن، کـە ئەمـەش دەکرێـت بـە بەشـی بچوکـترەوە، واتـە پـۆل و لـق و پـەلی لـێ دەکەوێتەوە، دوابەش ئیتر بە دوپلـە ڕێکخرابێـت یـان زیـاتر، هـەر باسێك، کێشەیەك یان بابەتێك لە دۆسێ یان فاییل یان کارتۆن.. تاد دادەنرێـن، خـۆ ئەگـەر دەرفـەتی بـەرگ تێگرتـن هـەبێت واباشـترە. چونکە ئەگەری بزربونی پەڕەکان نامێنێ.

-دیسان دەستنیشـانکردنی بەشـی ناسـەرەکی و پـۆل و لـق و پەلـەکان بـەپێی بابـەت و هەسـتیاریی و کـەم و زۆریـی هەریەکـەیان دیاری دەکرێت.

-زۆرجار ناتوانرێت بە ئاسانی بڕیار لەسـەر ئـەوە بدرێـت کـە کامە بەش سەرەکییەو کامە سەرەکیی نییە، دیسان جاری وا هەیە لە بەشە ناسـەرەکییەکانیشـدا نـاتوانرێت بـە ڕوونـی و کۆنکرێتیـی بڕیار لەسەر هـەندێ بەشی ناسەرەکیی یان پۆل و لقەکانی بدرێت کە سەر بە کامە بەشی سەرەکییە..

-بۆیە باشترین ڕێگە بۆ لابەلاکردنی ئەم کێشانە ئەوەیە کە بە ڕوونـی لـە ئەرشیفەکەو نـاوەڕۆك و بابـەت و زانیارییـەکان لەسـەری بگەین و، بیناسین، ئینجا پێشەکیی پلانەکە داڕبێژرێت دوای ئەوە، بە کۆنکرێتـی بڕیـار لەسـەر بەشـە سـەرەکییەکانی هـەر ئەرشیفەو ئینجا بڕیار لەسـەر بەشە ناسەرەکییەکانی هەر بەشێکی سـەرەکی بدرێت، ئەوسا کاریان لەسەر بکرێت.

## نمونەی پلان بۆ دامەزراندنی ئەرشیفی دادگا (ئەدك)"

لێرەدا نمونـەی دامـەزراندنی ئەرشیفی دادگـا دەخەینـە پێـش چاو..

-ئەرشـیفی دادگاکـانی کوردسـتان (ئـەدك) وەك ئەرشـیفێکی دەوڵـەتیی، بەشـێکە لەئەرشـیفی وەزارەتـی داد، دیـارە ئـەمیش بەشێکە لە ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان (ئەنك)

-ئەدك، ئەرشیفی گشت دادگاکـانی کوردسـتانە لـە ئەرشـیفی وەزارەتی داد و ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستاندا.

-بـەپێی یاسـاو بڕیـارو ئامۆژگـاری و پرنسـیپەکانی ئـەنك و دەسـەڵاتە بـەرزترەکان، بە ئاگاداری و لـەژێر چاوەدێریی ئەرشیفی وەزارەتـی داد و ئـەنك داڕێژراوەکـان دەدرێـت و ئەرشـیفەکان بـۆ ئەرشـیفی نەتـەوەیی دەگوێزرێنـەوە (بـەپێی تێپـەڕبونی مـاوەی یاسـایی پێویسـت، کـە لایەنـە کـەم و زۆرەکـەی بـەپێی یاسـاو ئامۆژگاریی دەسەڵاتی بەرز دیارو دەستنیشان دەکرێن..).

- پێویستە نوسراو و مەتریاڵەکانی هەر دادگایەك بەتـەواوی و ڕێکخراوی بهێڵرێتـەوە، تـا ئـەو کاتانـەی کەکێشـەکان بڕیـاریی کۆتاییان لەسەر دەدرێت و هیچ گومان و چاوەڕوانیی ئەوە ناکرێت کـە کێشـەیەك یـان بەشـێکی یـان سـوچێکی، جـارێکی تـر سـەرهەڵبداتەوە.. ئەوسـا بڕیـاری ئەرشـیفکردنی دەدرێت. لـە قسەکردن لەسەر گواستنەوەی بەشێکی ئەرشیفی هەر دادگایەك بۆ وەزارەتی داد یان ڕاستەوخۆ بـۆ ئەرشیفی نەتـەوەیی کوردسـتان، دەبێت بە دڵنیاییەوە ئەوە بزانرێت کە هیچ جۆرە پێویستیەك بە هێشتنەوەی ئەو بەشەی ئەرشیفە لە ئەرشیفی دادگاکەدا لە ئارادا نامێنێت. بۆیە باشترین چـارەش بۆنەمانـە، ئەوەیـە کـە ماوەیـەکی باش بەسەر کۆنبونی هەر فایل و دۆسێی و کێشەیەکدا تێپەڕبوبێت ئەوسا بیر لـە گواستنەوەی بـۆ ئەرشیفی داد یـان بـۆ ئەرشـیفی نەتەوەیی کوردستان بکرێتەوە.

-بێگومانیشە کە گواستنەوەی ئەرشیفەکە بو لە یەکگەیشتن و ڕەزامەندی لێپرسراوانی ئەرشیف دەبێت کارێکی زۆ رگرنگیشە کە لەم ماوانەدا هەوڵ بدرێت: هوشیاری و زانیارییەکی بەردەوام لەسەر پارێزگاریکردنی سەرجەم نوسراوەکانی هەر دادگایەك کۆبکرێتەوە تـا هـەر لایـە لـە ئاسـتی خۆیـەوە هـەر لـە سـادەترین نوسـینەوە تـا بڕیارەکانی دادگاکان، هەروەك هەمو دام و دەزگاو دایەرەیەکی تـر مەتریاڵەکان بپارێزن، بۆئەوەی ئیتر دوایی بە نەهامەتیی فەوتاندنی ئـەو سـامانە بـهێنرێت، وەك شـوێنەوارێکی ئـەو سـەردەمەش لەمانەوەی تۆمارو نوسراو و بەڵگەنامەو هەموو ئەو مەتریاڵانەی تر کە بەهۆی ئەو بارو دۆخانەوە پەرش و بڵاو بونەتەوەو بەردەستی هاووڵاتییان کەوتوون بگێڕرێنەوە بۆ ئەرشیفی دادگای کوردستان، یان نوسخەیان لێوەربگیرێت.

## پلان بۆ ڕێکخستنی ئەرشیف

-لە دامەزراندنی ئەرشیفدا باش وایە سستێمی ڕێکخستنەکە بەپێی دابەشکردنی جوگرافیی بێت، واتە بەپێی پارێزگاو ناوچەو شارو شارۆچکە بێت. لەگەڵ هەر یەکەیەکی جوگرافیشدا مەتریاڵەکان بەپێی بابەت پۆلێنکردن ئامادە بکرێن.. نوسراوەکان بەپێی پەیوەندییان بە بەشە سەرەکییەکانەوە، بەسەریاندا دابەش بکرێن بۆیە، دەبێت پێشەکی بەشە سەرەکییەکانی هەر ئەرشیفە دیاریکرابێت، وە بۆ هەریەکەیان پیتێکی گەورە کرابێت بەناوی (ڕەمز)، وەك لەنمونەی پیشاندراودا دەبینرێت.

-ئەم سستێم و ناونانی بەشە سەرەکییەکان دەبنە سستێم و ناوی بەشە سەرەکییەکانی یەکەیەکەی ئەرشیفەکانی ناو ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان، دیسان بۆ ئەرشیفەکانی تریش، بەپێی ئەم سستێمە، بەڵام ئەرشیفی وا هەیە بەپێی گەورەو بچووکیی، بەپێی مەتریاڵەکانی سنورەکەی هەموو ئەو بەشە سەرەکییانە ناگرێتەوە. یان بابەتەکان جیاوازییەکی چاوێنییان هەیە لەگەڵ سەرجەمی ئەرشیفەکانی تردا یان زۆربەیان.. لەم حاڵەتانەدا دەتوانرێت پیتی کەمتر بەکار بهێنرێت.. یان دەتوانرێت بەپێی بابەتە سەرەکی و گرنگەکانی نوسراوەکانی دام و دەزگاکە بەشە سەرەکییەکان دیاری بکرێن و بەهەمان ئەو پیتە گەورانە ناوبنرێن، واتە ئەم پیتانە بکرێن بە ڕەمزیان. لە هەنگاوی سێیەمدا پێویستە ناوی بەشە ناسەرەکییەکانی ژێر هەر بەشێکی سەرەکیی دیاربکرێن، باشتریش ئەوەیە کە بە ژمارە لەتەك پیتە گەورەکەی هەر بەشە بێت.

ئینجا هەر بەو پێیە مەتریاڵەکان بەسەر یەکەیەکەی هەر بەشێکی ناسەرەکیدا دابەش دەکرێن. هەر گروپێك لەمانە زنجیرە یەك پێکدەهێنێت، واتە زنجیرەیەك لە دۆسیێ و فایل و کارتۆن. هەر فایلێك، دۆسێیەك یان کارتۆنێکی هەر زنجیرەیەك بەپێی ئەو نموونەیەی کە لە شوێنی خۆیدا دەیخەینە بەرچاو بەپێی پیتی گەورەو ژمارەو پیتی بچوك، ناوێکی تایبەتی بۆ دەخوڵقێت، زنجیرەکانیش هەر لە ژمارە - یەکەوە - دەست پێدەکات تا دوا ژمارە کە بەردوا دۆسێ یان فایل یان کارتۆن دەکەوێت.. کە هەر بەو پێیانەش لە تۆمارەکاندا دەنوسرێن.

## ئەرشیفی دادگاکانی کوردستان (ئەدك)

ئەرشیفی دادگاکانی کوردستان (ئەدك) وەك ئەرشیفێکی دەوڵەتیی بەشێکە لە ئەرشیفی وەزارەتی داد، دیارە ئەمیش بەشێکە لە ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان (ئەنك).

ئەم ئەرشیفە لێپرسراوە لە پارێزگاریکردن و ڕێکخستن و ئەرشیفکردنی سەرجەم تۆمارو نوسراو و حوکم و بڕیارو نامەو تۆمارەکانی کاری ڕۆژانە و سەرف و دەستکەوتی هەموو دادگاکانی سنوری کوردستان لەگەڵ هەموو ئەو نووسین و نامانەی لە دایەرە و دام و دەزگاکانی دەوڵەتی و ئەهلی و هاووڵاتیانەوە بۆیان هاتووە، یان نوسخەی دووەم و دەستخەتەکانی ئەو نامەو نوسراوانەی لەمانەوە دەنێردرێت بۆ دایەرە ودامودەزگا و کۆمپانیا، یان ئینیدڤید. هەر دادگایەك ئەرشیفی تایبەتیی خۆی دەبێت و بەپێی پرنسیپەکان ڕێکدەخرێ.

بە گشتیی دادگاکان دەکرێن بە دوو بەشەوە:

-دادگای گشتیی: ئەو دادگا بەرزانەن کە بۆ سەرتاسەری وڵاتە و بەرزترین دەسەڵاتی یاسایی و دادگایی هەیە، بەشێوەی ئاسایی لە پایتەخت دەبێ.

-دادگای تایبەتیی، ئەمانەش دووجۆرن، یەکەمیان بەپێی باری جوگرافی و دیموگرافیی لە شارە گەورەکاندا دەبن، دووەمیان: دادگا جۆربەجۆرەکانی ترە کە بەپێی کەم و زۆریی دانیشتوانی شارو ناوچەو هەرێم بۆ کێشە جۆربەجۆرەکان دادەنرێن.. بەهەرحاڵ ئەو دابەشکردنانە هەر جۆرێك بن، هەریەکەیەن ئەرشیفی تایبەتیی خۆی ڕێك دەخات، سەرەنجام کۆی ئەرشیفەکان لە (ئەدك) داو ئەمیش لە (ئەنك) دا ڕێك دەخرێن، دیارە بەپێی ئەو ئامۆژگاری و ڕێگەو شوێنانەی لە شوێنی خۆیاندا باسکراون. هەردادگایەك، لە سنوری کارو چالاکییەکانی بەپێی: کێشە، بابەت بڕیار و حوکم، تۆماری کاری ڕۆژانە، تۆماری نامەو نوسراوی هاتوو، تۆماری نامەو وەڵام و نوسراوی ڕۆیشتو، تۆماری دەعواو شکاتکردن، تۆماری حسابات بەداهات و سەرف و خەرجەوە.. تاد بەشە سەرەکییەکان بڕیار لەسەردەدرێن.. پلەی دوایتر بەشە ناسەرەکییەکانی هەربەشێکی سەرەکی دیاردەکرێن..

## سستێمی دامەزراندن و ڕێکخستنی ئەرشیفی دادگا

لە پێشەکیی ڕێکخستنی نەخشەی ئەرشیفی هەردادگایەکدا، سترەکتوری دادگاکە دەنوسرێت بە حاکم و نوسەرو فەرمان بەرو کارگوزارو هەموو ئەو کەسانەی تر کە پەیوەندییان بە دامەزراندن و کارەکانی دادگاکەوە هەیە، یان هەبوە، لەگەڵ کورتەیەکی چڕ لەسەر مێژووی بونی ئەو دادگایە.

بەشە سەرەکییەکانی هەردادگایەك کە ئەم پلانی ئەرشیفکردنەی بۆ سازدەکرێت. وەك نمونەیەك، داڕشتنەکەشی هەروەها بەم جۆرە دەبێت: دامەزرێنەر: بەرزترین دەسەڵاتی بەڕێوەبردن دەنوسرێت، دوایی دەسەڵاتی خوارئەوە، ئینجا بەشە سەرەکییەکانی ئەرشیفەکە وادابەش دەکرێ:-

نمونەیەکی جۆری داڕشتنی بەشە سەرەکییەکانی ئەرشیف:

I-پرۆتۆکۆڵ و تۆماری بەرنامەی کۆبونەوە و دواحوکم و بڕیار.

II- تۆماری ڕۆژانە بۆ نوسینی شکات و دەعوا و ئەو شتانەی تر کە پەیوەندییان بەوانەوە هەیە.

III-تۆماری ڕۆژانە بە نامە و نوسراوی هاتوو..

IV-تۆماری ڕۆژانە بۆ نامەو نوسراو و نوسخەی حوکم و بڕیاری ڕۆیشتوو (نێردراو)

V-تۆماری حسابات، بە لیستەو وەسڵ و بڕیاری سەرف و خەرج و شێوەی سەرفی هەمو ئەو لایەنانەی کە پەیوەندییان بە داهات و سەرف و خەرجی ئەودادگایەوە هەیە بە نوسینی هەموو ئەو کەس و لایەنانەی پەیوەندارن، بەبڕیاری کڕین و سەرفکردنەوە.

VI-تۆماری ڕۆژانە بۆ نوسینی نامەو نوسراو و بڕیار و وەسڵی دانپێدانان و ئاگادارکردن.

* تێبینی: ئەگەر چەند بابەتێکی تر کە بزانرێت پێویستیان بە کردنەوەی بەشی سەرەکی هەیە، وابەپێی زنجیرەی ئەو ئەلف و بێیانە، وەك بەشێکی سەرەکیی نیشان دەکرێ، بۆنموونە ئەگەر ئامار بکەینە بەشێکی سەرەکی کە گرنگە و ئەگەر لەم سەرەتایەشدا نەکرێت وادەبێت بۆ ئاییندە ببێتە بەشێکی سەرەکیی زۆر گرنگ لەیەکە یەکەی ئەرشیفەکاندا، وا H ی بۆ دادەنرێت، ئیتر بەوجۆرە ئەو بەشانەی تریشی دەخرێتە پاڵ، خۆ ئەگەر یەکێکیان فراوان بوو وادەتوانرێت جیابکرێتەوەو بکرێت بەسەربەخۆ، لە بەشە سەرەکییەکاندا، یاخود لە ناسەرەکییەکانیدا.

نمونەی جۆری ڕێکخستنی بەشە ناسەرەکییەکانی هەر بەشێکی سەرەکیی ئەرشیفەکە بەم جۆرە دەبێت و بەم پیتوژمارانە ناودەنرێن، یا نیشان دەکرێن:

ئەرشیفی دادگای......

A پرۆتۆکۆڵ و تۆماری بەرنامەی کۆبوونەوە و دواحوکم و بڕیار:

A1 تۆماری دوا حوکم و بڕیار لەسەر کێشەکان کە هەریەکە بەسەربەخۆ درابێت یان وەرگیرابێت، بەپێی کرۆنۆلۆجیی ڕێکدەخرێن.

A2 تۆماری بڕیاردان لەسەر ژن مارەکردن و مەراسیمەکانی.

A3 تۆماری ڕۆژانە ، بۆ نوسینی هەموو ئەو شکات و دەعواو کارانەی کە پەیوەندییان بە تەڵاق دان و چارەنوسی منداڵ.. تاد هەیە.

A4 تۆماری بروانامەی سەلماندنی وەفاتکردن و میرات دابەشکردن و کێشەکانی دەوروبەریان.

A5 تۆماری نامەو نوسراوی هاتوو. A6 تۆماری نامەو نوسراوی نێردراو.

A7 هەمەچەشنە، یان (بابەتی تێکەڵ) ئەگەر بابەت یا وردە بابەتی تر هەبو کە ئەو بەشە سەرەکییانە نەیانگرتنە خۆیان، وا لەم بەشەدا ڕێك دەخرێن، هەر بابەتێ، ناوەکەی دەبێتە سەردێڕی خۆی لەگەڵ ئەو پیت و ژمارانە بەشی سەرەکی و ناسەرەکی بەکاردەهێنرێن، هەر لەسەر هەمان ئەو پرنسیپانە. تێبینی: بەپێی پێویست لێرەشدا بەشی تردادەنرێت، ئەو بەشانە هەر بۆ نمونە، دەتوانرێت کەمتریان زیاتر بکرێت. دیسان بۆ تۆماری ڕۆژانە ئەگەر یەك تۆمار بۆ هەموو کاری ڕۆژانە هەبو وا بەپێی زنجیرەی مێژووی بڕیارەکان ڕێکدەخرێن.

نمونەی سستێمێکی تر بۆ ڕێکخستنی ئەرشیف، بەشی سەرەکی و ناسەرەکی، نا سەرەکی و دۆسێکان:

## نمونەیەك بۆ جۆری دارشتنی
## بەشێکی سەرەکیی ئەرشیف

ئەرشیفی دادگای.....

A پرۆتۆکۆڵ و دوابڕیارو حوکم:

A1 پارێزگای سلێمانی

A1a شاری سلێمانی : (قەزای ناوەند) سەرجەمی ئەو حوکم و بڕیارانەی ئەم دادگایە کە پەیوەندیی بە سنوری بەڕێوەبەرایەتیی ئەم شارەوە هەیە لەسەر بنچینەی کرۆنۆلۆجیی ڕێکدەخرێن و هەر دۆسێیەك ژمارەیەك وەردەگرێ: A1a:3,A1a:2,A1a:1 ... تاد Alb قەزای هەڵەبجە: بە هەمان شێوەی سەرەوە بڕیارو حوکمەکانی دادگاکە پەیوەندیی بە شاری هەڵەبجەو هەموو ناحییەو دێهاتیەوە هەیە، بەشێوەی کرۆنۆلۆجی لەناو دۆسێدا بەهەمان ڕێگەو شوێن ڕێکدەخرێن: A1b:4,A1b:3, A1b:2, A1b:1 .

تێبینی: هەر گروپێکی لەم بابەتە یەك زنجیرە پێکدەهێنێت.

A1c قەزای پێنجوین: قەزاو ناحییەو دێهاتەکانی، بەهەمان شێوە ڕێکدەخرێن.. ئیتر بەو جۆرانە سەرجەمی ئەرشیفی ئەو دادگایە لە هەموو قەزاو ناحییەو دێهاتەکانی هەریەکەیاندا لە پارێزگای سلێمانی ئەنجام دەدرێن دەشتوانرێت هەر شارە بەپێی گەورەیی لەسەر بنچینەی گەڕەکیش بکرێت.

A2 پارێزگای هەولێر، هەر بەوجۆرەی سلێمانی، ئەرشیفەکەی دادەمەزرێنرێت...

A2a بۆ شاری هەولێر، A2d:4,A2c:3, A2b:2, A2a:1 بۆ زنجیرە هەر گروپێك (ئیتر بەو پێیە بۆ هەموو قەزاکانی تری پارێزگاکە دەکرێت)

A3 پارێزگای کەرکوك و قەزاکانی ............... هە ربەو جۆرە

A4 پارێزگای دهۆك و قەزاکانی هەربەو جۆرە

ئەگەر هەر پارێزگاو قەزاو ناحییەو دێیەکی تریش هەبو یان هێنرایە ئاراوە وا هەر بەو پێیەو لەسەر هەمان زنجیرە کارەکە ئەنجام دەدرێت. تۆماری بڕیاردان لەسەر ژن مارەکردن و مەراسیمەکانی، ئەم بەشە (وەك بەشێکی سەرەکیی تر)، بە جیاوازیی وەرگرتنی یان ناونانی بە پیتێکی تر (B) یە هەروەك ئەو نمونەیەی سەرەوە و لەسەر هەمان ڕێگەو شوێن بۆ هەمو بەشەکە، بە پارێزگاو شار گەڕەك و قەزاو وردە بەشەکانی ترەوە ڕێکدەخرێ بۆ بەشیی سەرەکیی سێیەم بەپیتێکی تر هەروەها بۆ چوارەم ... تاد

ئەگەر بویسترێت شێوەیەکی تر بۆ ڕێکخستنی ئەرشیفەکە پێڕەو بکرێت وا، دەتوانرێت سەرجەمی ئەرشیفەکە بە کرۆنۆلۆجیی ڕێك

بخرێت. یان لەسەر بنچینەی پارێزگاو شارو بەشەکانی واتە گەرەك، قەزاو ناحییەو دێهاتەکانیان، دیسان دەتوانرێت خۆلە گەرەك و قەزاو ناحییە و دێهات لابدرێت وە تەنها پارێزگا بکرێت بە بنچینەو ئینجا لەهەردو حاڵەتەکەدا بەپێی کرۆنۆلۆجیی ئەرشیفەکە رێکبخرێت، وەیاخود ئەگەر مەتریالەکانی زۆر تێکەڵبون وا لەسەرەتاوە، تا دەتوانرێت لەسەر دوو بنچینە دابمەزرێنرێت

1) دابەشکردنی جوگرافی. پارێزگا، قەزا و ناحیە، [1]

2) لەهەریەکەیەکی جوگرافیدا بەپێی بابەت. ئینجا هەر بابەتە بە کرۆنۆلۆجی رێکدەخرێ.

ئەگەر یەکەم بە نمونە وەربگیرێ، یان هەر شێوەیەکی تر بێت، وا دەبێت و پێویستە هەموو ئەرشیفەکانی تریش هەربەهەمان شێوەو رێگەو شوێن رێك بخرێن، بۆئەوەی هەم کار لەسەرکردنی ئاسان بێت، وەهەم بۆ گەڕان بەدوای مەتریالێکدا کارەکە ئاسانتر دەکرێت، وە هەم بۆ لێکۆڵەریش زوتر و ئاسانتر لە داڕشتنی ئەرشیفەکە دەگات.

## بژارو پاکژکردن..

بێگومانە کە سەرجەمی نوسراو و مەتریالەکانی هەردایەرەیەك ئەرشیف ناکرێن، چونکە نوسراوی واهەیە کە لە پاشەڕۆژی نزیك و دووردا هیچ جۆرە سودێکی بۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەلایەتیی و سیاسیی‌و یاسایی و ئابوریی و ئایینی و مێژوویی.. تاد نییە ئالێرەوە کاری بژارو پاکژکردنی نوسراو لەهەر مەڵبەندێکی ئەرشیفدا دێتە ئاراوە..

سەرچاوەی بڕیاری یاسایی بۆ جۆرو شێوەو مەتریالێ کە دەکەوێتە ناو بازنەی بژارو پاکژکردنەوە، پەرلەمانە، لە نەبوونی ئەودا، ئەنجومەنی وەزیران رۆڵی ئامۆژگاریی ئەو بوارە دەبینێت. وەزارەتی رۆشنبیریی‌و ئەرشیفی تایبەتیی کۆڕو کۆمەڵەکانیش دەگرنەوە کە لە بوارە هەستیارەکاندا سودیان دەبێت.

کە دەگوترێت لە هەمو دام و دەزگاو دایەرەیەك لە نوسراو و تۆمارەکانی سنوری کارو چالاکی هەریەکەیان ئەرشیف دادەمەزرێنێ، ئەوە ناگەیەنێت کە سەرجەمی هەمو ئەو نوسین و تۆمارانە دەگرێتەوە کە لەئەنجامی کاری رۆژانەدا نوسراون یان گەیشتوونەتە ئەو دەزگایە. بەڵکو نوسراوی وا هەیە هیچ جۆرە گرنگییەکی بۆ ئێستاو بۆ ئاییندە نییە و هیچ سودێکیان لێی رەچاو ناکرێت، بۆیە دەبێت لەبە سودو گرنگەکان جیابکرێتەوە. ئەوەش کاری کۆمیتەی تایبەت و پسپۆڕە بە کاری بژارو پاکژ و ئەرشیفکردن هەستێ.

بژارو پاکژکردن واتە جیاکردنەوەی نوسراوی ئایەخ و بێسود لەوبایەخ و بەسودانەی کە دەبێت ئەرشیفبکرێن.. ئەمەش کارێکی زۆر گرنگ و هەستیارە لە ئەرشیفدا، بۆیە کۆمیتەیەکی شارەزاو دڵسۆز و جێگەی متمانە بۆئەو مەبەستە پێك دەهێنرێت تا بڕیار لەسەر بژارو پاکژکردنی نووسراو و دۆکومێنت یان ئەرشیفکردن بدات، گرنگ بۆ سەرەتا، وەك هەموو کارێك، ئامادەکردنی پلان و نەخشەی جۆری کارکردن و شێوەی ئەنجامدانی خاڵەکانی پلان و نەخشەکەیە، کە بۆئەوە دەبێت پێشەکیی سەرجەمی نوسراو و تۆمارەکان بخوێنرێنەوە بزانرێت چیی تێدایە تا ئاسان نەخشەی کارەکە دابنرێت..

ئەم کارە لە پرۆسەیەکی دووروودرێژخایەندا ئەنجام دەدرێت. بەتایبەتیی بۆ ئەرشیفە نوێیەکان کە ئەزمونێکی ئەوتۆیان لەسەر ئەم جۆرە کارانە نییە. کاتێ ئەزمونی باش کۆکرایەوە، وا دەتوانرێ هەر لە سەرەتاوە بەشێ لەو نوسراو و نوسین و مەتریالانە گرنگیی ئەرشیفکردنیان دەستنیشان بکرێن، بەلام ئەمە کاری بەرزترین دەسەلاتە و دوای ئەو بونە خاوەن ئەزمونانە.

## پرنسیپە سەرەکییەکانی بژارو پاکژکردنی مەتریالێ

—پێویستە لە کاتی بژارو پاکژکردندا بەرژەوەندیی گشتی و نرخی مێژوویی بایەخی کولتوریی هەر دوکۆمێنتێك لەبەر چاو بن و پێوانەی ئەو کاری پاکژکردن و بڕیاری ئەرشیفکردنە بن، دەبێت بزانرێت چیی پاکژ دەکرێ و چیی دەهێلرێتەوە. کامە مەتریالێ نهێنی یان نووسراوی هەستیاری تێدایە کە دەبێت هەم ئەرشیف بکرێ و هەم لە دەرچوونی نهێنی بپارێزرێت.

—جگە لە ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان کە سەرچاوەی ئەرشیفکردن و بڕیاردانە لەسەر چارەنووسیی نووسراو و مەتریالێ... هیچ دەزگایەك بۆی نییە بێ ئاگاداری و بڕیاری ئەم، هیچ جۆرە نووسین و نووسراوێ بژار بکات و لێی بفەوتێنێت..

—کۆمیتەی بژار و پاکژ، هەموو ئەو نووسراو و تۆمارانەی کە سادەترین سوودی لێ وەردەگیرێت، دەهێلێتەوە. تەنها ئەو نووسین و نامەو یاداشتانە ناهێلرێنەوە و لە ئەرشیف بژار دەکرێن کە هیچ جۆرە سوودێکی گشتی‌و چاوێنیان لێ رەچاو ناکرێ نە لە ئێستاو نە لە داوڕۆژدا. ئەو سوودانەی کە پوختەکانیان لە ئەرشیفکراون و ئیتر پێویستیی کارکردنیان لەسەر نامێنێت. دەفەوتێنرێن، بەلام گرنگەکان دەهێلرێنەوەو ئەرشیف دەکرێن، بۆ ئەرشیفەکەی ئێمە باشتر وایە لە هەمو حاڵەتێکدا مسوەدەکانیش بهێلرێنەوەو لەگەڵ نوسخەی پوختکراودا، یەکەم بێت یان دووەم ئەرشیف بکرێن، بەتایبەتیی لە پرۆتۆکۆڵ و نوسراوی گرنگدا کە سوودی مێژوویی و گشتیی تیا دەبینرێت و بۆ ئایندەی نوسین و لێکۆڵینەوە و بۆ مێژووی نەتەوە و رەوتی گەشەکردنەکان کەڵکیان دەبێت..

—ماوە وکاتی بژارو پاکژکردن، ئەنك یان دەسەلاتی بەرزتر دیاری دەکات، باشتر وایە سەرەتای ساڵ بۆ کاری بژارو پاکژکردن بکرێتە نەریت.

—ئەندامانی کۆمیتە ب.پ و ئەرشیفکردن بە کۆمەڵ بەرپرسیاری سەرەکی دەبن لەو کارانە. بەهاوکاریی لەگەڵ دەزگا تایبەتییەکانی ئەم بووارانەی هەر وەزارەت و مەڵبەندی زانستی و

مرۆڤییەکـە بـەکاری وەرگرتـن و بـژارو پـاکژو جیاکردنـەوەی بـێ سودەکان هەڵدەستێ، دوای ئەوەی زۆربە وردی بەسەر ناوەڕۆکی سەرجەمی ئەو ئەرشیفەدا دەچێتەوەو ورد دەخوێنرێنەوەو لایەنە جۆربەجۆرەکانی سودی هەر دۆکومێنتە دەنرخێنرێت، ئەوسا بڕیار لەسەر ئەرشیفکردن یان نەکردن دەدرێت..

–دەبێت لەهەر کۆبونەوەیەکدا هەر بڕیارێك لەسەر بژارو پاکژکردن دەدرێت، لەتۆماری تایبەتیدا بنوسرێت و زانیاری پێویستیش بە کورتی و پوختیی لەسەر ئەو بژارکراوانە بنوسرێت، تا لە هەموو کاتێکدا شوێن و چارەنوسی ئەوانە بزانرێت کە چییان لێهاتووە.

–مـەتریاڵی هـەر بـاس و کێشـەیەك، ئەرشیف بکرێـت یـان بفەوتێنرێت، ئەگەر نوسخەی ئەسڵی یا نوسخەی دووەم، کۆپـی، وەهاوپەیوەندەکان بەو کێشەیەوە لەهەر شوێنێك هەبێت دەبێت لەو تۆمارە تایبەتیانەدا ئاماژەیان بۆ بکرێت..

–کۆمیتەکە بەرپرسیارە لەوکارانەو لە نهێنیەکانی ئەرشیفەکەو نـەدرکاندنی هیـچ جـۆرە باسـێك، وەك لـە پرنسـیپ و یاسـا تایبەتییەکاندا دەرخراوە.

–لەبەرئـــەوەی ئەرشـــیفی ن. ك. و ئەرشـــیفی زانکـــۆ و ئەرشیفەکانی تر نوێ دامەزراون بۆیە باش وایە هـەر لـە سەرەتاوە ڕاستەوخۆ سەرپەرشتیی و کۆنترۆڵی تەواوی ئەم کارە بکرێت.

–باشـتر وایـە تاماوەیـەکی چـەند سـاڵیی کـاری بـژارو پـاکژ دوابخرێت، تا بەتەواوی ئەزمونەکانی ئەرشیف بە زانیاری و لێزانین دەوڵەمـەند دەکرێن. کـاتێکیش دەسـتکرا بـەم کـارە، وا نەخشـەی سەرجەمی ئەو نوسراو و بابەتانەی هـەر دەزگاو دایەرەیەك لیست دەکرێن بۆ پاکژکردن.

–باش وایە هەر لەسەرەتاوە بەرپرسیاری ئەم لایەنەی ئەرشیفە سـەرەکییەکان (ئەرشـیفی: نەتەوایـەتی، پەرلـەمان، ئەنجومـەنی وەزیران، زانکۆکان، ئەو وەزارەتانەی ئەرشیفی تایبـەتیی خۆیـان دەبێت هاوکاری بکەن و یارمەتیی یـەکتر بـدەن ئـاڵوگۆڕی بیروڕاو تاقیکردنەوە، کۆبونەوەو سیمینار و پەنێل بۆئەم مەبەستە.

–پێویستە ئیسـتیمارەی تایبـەتیی بـژارو پـاکژکردن هـەبێت و سەرجەم کارەکانی بەستراو بەوەوە بنوسرێت.

–ئەگـەر لـەکاتی بـژارو پـاکژکردنی دۆکومێنتـدا، گومـان و دوودڵیی لەسەر نوسراوێك هەبو کە پێویستە ئەرشیفبکرێت یاننە، وا دەبێت ئەو نوسراوە بهێڵرێتەوە، تا ماوەیەکی باشی تری بەسەردا تێپـەڕ دەبێت، ئەوسا سەرلەنوێ مشت و مڕی لەسـەردەکرێتەوە بڕیاری لەسەردەدرێت. خۆ ئەگەر لە جاری دووەم و سێیەمیشدا هەمان گومان لە ئارادابو.. وادیسان بڕیاری هێشتنەوەی دەدرێت.. بۆ ئـەم جـۆرە نوسـراوانە، باشـتر وایـە هـەر 10 –15 سـاڵ جـارێك سـەرنجیان لێبدرێتـەوە و بڕیـاری نوێیـان لەسـەربدرێتەوە، تـا لـە سەرنجامدا دوای دڵنیابون بڕیاری دروستی لەسەردەدرێت.

–بۆچی باشترین کات بۆ بڕیاردان لەسەر بژارو پاکژکردن، سەری ساڵان بێت؟ چونکە سەرەتایەکی نوێیە بۆ مێژوو کاری نوێ. کە لەو سەرەتا نوێیەدا دەتوانرێت هەم ئەو نوسینانەی کاریان لەسـەر تـەواو بـووەو هیـچ ئیشـێکیان پێیـان نـەماوە، لابـبرێن و ئەرشـیفبکرێن، وەهـەم جێگـە بـۆ مـەتریاڵ و نوسـینی نـوێ چـۆڵ بکرێت.. بەڵام ئەوانەی کاریان لەسەردەمێنێت، ئیتر کەم بێت یان زۆر، کێشەکە گرنگ و سەرەکی بێت یان ناگرنگ .. وا دەهێڵرێنەوە تا کۆتایی پێهێنانیان..

–هـەموو ئـەو نوسـینانەی بڕیـاری بـژارو پـاکژکردن و فـەوتاندنیان لەسـەر دەدرێـت، دوای ئـەوەی بـە کۆنکرێتـی دەردەکەوێت کە ئایەخن و هیچ بایەخێکیان نییەو هیچ سودێکیان لێنابینرێت. دەبێت بەتـەواوی بفەوتێنرێن، واتـە نـابێت بکەوێتـە دەست هیچ کەسێك، ئەو کەسە لێپرسراوبێت یان مرۆڤی ئاسایی.. باشترین ڕێگەی فەوتاندنیش سوتاندنە.

## ئەو هۆو فاکتەرانەی کۆمیتەی بژارو پاکژکردن دەیانکاتە زەمینە بۆ بڕیارەکانی:

کۆمیتەی بژارو پاکژ کە بەکاری بژارو پاکژکردنی نوسراوەکان هەڵدەسـتێ دەبێـت بـە ئاگـاداری و هاوکـاریی و بڕیـاری لایەنـە لێپرسراو و خاوەن دەسەڵاتی ئەرشیفەکان بێت.

بۆئەوەی کۆمیتـەی بەرپرسیار لە بژارو پاکژو ئەرشـیفکردن، بڕیارەکانی دروست و لەبارین، پێویستە لـە هـەر بڕیـارێکیدا ئـەم خاڵانە ڕەچاو بکرێن:

- ئایـا نوسـراو و تۆمارەکـانی ئـەو بـاس و کێشـەیەی لەبەردەستدایەو قسە لەسـەر ئەرشیفکردنی دەکرێت. گەیشـتۆتە دوائەنجام و دوابڕیارو کۆتایی؟
- بایـەخی ئـەو نوسینانەی لەبەردەسـتدان بـۆ باسـەکەو بـۆ بـەردەوامیی لێکۆڵینـەوەو بـاس لەسـەری چـەندە ، ئەگـەر کێشـەو باسـەکە نەگەیشـتبێتە دوا ئـەنجام و دوابڕیـاری کۆتـایی پێهێنـەر وادەهێڵرێنەوە..
- ئایا گریمـانی سـەرهەڵدانەوە یـان سـەرهەڵنەدانەوەی ئـەو کێشـەیە. یان بەشێکی سوچێکی، لە پاشەڕۆژدا هەیە یاننـە، ئـەو هەبون یان نەبونە دەبێت کۆنکرێت بێت نەك بە مەزەنەو خەمڵاندن.
- بایـەخی هـەر نوسـینێك بـۆ مێـژوی هەمەلایەنـەی ژیـانی کۆمەڵ، گەشەکردنەکان، پارێزگاریکردنی کولتورو سامانی مێـژو، سـودی بـۆ نوسـینەوەی مێـژوو، بـۆ لێکۆڵینـەوە لەلایەنـە جۆربەجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵ و ژینگە، هەر لە سادەترین دیاردەوە تـا گرنگـەکانیان، پێشـکەوتن و گۆڕانـە جۆربـەجۆرەکان، پارێزگـاریکردنی داب و نەریتـە کۆمەڵایەتییـەکان، هێشـتنەوەو پارێزگاریکردن و گەشەکردنی مێژووی ئەدەب و زمان و دیالێکت و چیرۆك، ڕاز و نیاز و سەرگوزشتە و پەندو مەتـەڵ و هـەموو ئـەو

لایەنانەی تر کە پەیوەندییان بە وڵات و تۆپۆگرافیاو جوغرافیاو نەخشەو.. تاد و بە ژیانی کۆمەڵ، دەوروبەر، ئاژەڵ، باڵندە و رووەکەوە هەیە بە نوسین و تۆمارکردنی وردەکارییەکانی ناویشیانەوە، باش و خراپیشیانەوە.. جۆری رێکخستنی ئیستیمارەی تۆمارکردنی نوسراو و مەتریاڵ بۆ ئەرشیفەکردن و کار لەسەرکردنی:

لە سەرەتای دەستکردن بە رێکخستنی هەر بەشێکی ئەرشیف، پێویستە نەخشەی جۆری رێکخستنی ئەو بەشە بە رونی و بە قەڵەمی رەش، کە ئاسان بخوێنرێتەوە بنوسرێت تا لە دواییداو پاش دڵنیایی لە راستیی نوسینەکە بە پوختەیی لەسەر ئیستمارە دەنوسرێتەوە.

-لە سەرەتادا لای دەستە راست ناوی ئەرشیفەکە دەنوسرێت (مانای دامەزرێنەری ئەرشیف، بۆ نمونە: وەزارەتی رۆشنبیری)، کە ئەوە دەبێتە سەردێری زنجیرەی بەشە سەرەکییەکان.

-لای دەستە چەپ هەرولەرێکی دامەزرێنەر، مێژووی دەستکردن بەوکارە دەنوسرێت، خۆئەگەر تەواوکەری ئەرشیفەکە بو کە پێشتر دامەزراوە و تۆمار کراوە وامێژوی تۆمارکردنی ئەم نوێیە دەنوسرێت وەك کاری تەواوکەرو بەردەوام.

-لە تەنیشتی ئەوەش ژمارەی تۆمارەکە، کە زنجیرەی ژمارەی ئیتسمارەکە نیشان دەدات، ئەمەش لەهەربەشێکی سەرەکیی ئەرشیفێکدا بە زنجیرەی، بێ پچڕاندن ژمارەکان یەك لەدوای یەك دەنوسرێت، دیارە هەر بەشێکی سەرەیەکی زنجیرەیەکی سەربەخۆیە کە هەریەکە لەگەڵ ناو و رەمزی ئەرشیفەکەو بەشە سەرەکییەکە بە ژمارە و لە یەکەوە دەست پێدەکات.

-لە بەشی خوارو، لە خانەی دووەم: ناوی بەشە سەرەکیەکە، بەرامبەریشی ساڵی دەستپێکردن و کۆتایی هاتن (ئەگەر ئەرشیفەکە نەمابو) دەنوسرێ.

-لە خانەی ژێرنەوە - سێیەم: لە چی ژورو رەفەیەك دانراوە، کە ئەمیش بەپێی ناو ژمارەی بەش و زنجیرەکە هەم لە دەلیل و هەم لە رەفەکانیش نوسراوە، بەپێی ئەو کلیل یان دەلیلەی لەدامەزراندنیدا بۆی کراوە.

-لە تەنیشتیشی ژمارەی دۆسێ یان کارتۆنەکە دەنوسرێت، لە تەنیشتییەوە ساڵەکەی (واتە نوسراوەکانی ناو دۆسێ یا کارتۆنەکە هی چی ساڵێکە.. لە تەنیشتی ئەمیشەوە تێبینیی.. ئەمەش بۆ ئەو تێبینیانەیەیە کە پەیوەندیی بەو فایلە یان زنجیرەیەوە هەیە وەك: ئەگەر تەواوبوبێت، وا دەنوسرێت، ئەگەر لەشوێنێکی تر هاوپەیوەندیی هەبێت دەنوسرێت.. تاد

-ئیتر بەوجۆرە دۆسێ و فایل یان کارتۆنی ئەو زنجیرەیە یەك لەدوای یەك لە ئیستیمارەی بە زنجیردا دەنوسرێت تا تەواو دەبێت.

-هەر زنجیرەیەك وەك یەك یەکە پێکەوە دەنوسرێت، وەك یەك بەشی بەشێکی سەرەکیی ئەرشیفێك، لەگەڵ زنجیرەکانی تردا دادەنرێت.

-لە ژێر تێبینیدا هەر زانیارییەك پێویست بێت لەسەر ئەو دۆسێیە دەنوسرێت، بۆ نمونە: ئەگەر ئەو دادگایە نەمابێت، دەنوسرێت نەماوە لەگەڵ ساڵەکەیدا، یان لە دۆسێیەکی بەشێکی تری ئەرشیفەکە یان ئەرشیفێکی تردا ئەگەر باسی هاوپێوەند بە ناوەرۆکی ئەو دۆسێیەوە هەبو وا ئاماژەی بۆ دەکرێت، یان ئەگەر زنجیرەکە لەبەرگ گیرابێت یان هەر سجل بێت؛ یان ئەوراقی پێکەوە نەبەستراوبێت، یان بەشێکی لێ فەوتابێت.. تاد، دەنوسرێت. .

باشتریش وایە هەر زنجیرەیەك لە ئیستیمارەی تایبەتیشدا بنوسرێت بەم زانیاریانەوە:

ناوی زنجیرەکە، لە تەنیشتییەوە رەمزەکەی کە بەپیت و ژمارە ناونراوە، لەژێرەوەی: لە کوێدا دانراوە، لە تەنیشتییەوە، ژمارەی فایل یان کارتۆنەکە، بە تەنیشتییەوە ساڵەکەی ، ئینجا بە تەنیشت ئەمیشەوە تێبینییەکان.

لەم تۆمارکردنانەدا، دامەزرێنەری ئەرشیف چۆنی بەلاوە ئاسانترە وادەیانگونجێنێت، گرنگ لەو کارەدا: بەرێکوپێك تۆمارکردنە، رونیی لەو تۆمارکرنەدا، نوسینی ئەو زانیاریانەیە کە دەربارەی ئیستیمارەکە نوسراوە، هەر فایلێك بوویسترێت، ئاسان بهێنرێتە بەردەست، وە ئەوەش بزانرێت کە ئایا جێگە هێڵراوەتەوە بۆ فراوان و بەرینکردنی ئەرشیفەکە ئەگەر پێویست بکات.. یاساو رێگەو شوێن و ئامۆژگاری و پرنسیپەکان دەربارەی

## پارێزگاریکردنی نهێنییەکانی ناو ئەرشیفەکان.

دەسەلاتی یاسایی یان بەڕێوەبردن یاساو ئامۆژگاری و رێگەو شوێنی پێویست و تایبەت بە پاراستنی نهێنییەکانی ناو ئەرشیف دادەنێت. وە بەڕێوەبەرێتیی ئەرشیفەکە لێپرسراوە لە باش ئەنجامدانیان.

بەشێك لە ئەرشیفی هەر دایەرەیەك، کەم بێت یان زۆر، پەیوەندیی بە هەندێ نهێنی هاوپەیوەند بە کاروباری گشتیی دەوڵەت یا هەندێ دام و دەزگا، یان هاوپەیوەند بە ئیندڤید یان خێزانەوە هەیە کە بڵاوبونەوە یان درکاندنیان زیان بەو لایەنانە دەگەیەنێت، بۆیە دەبێت سنوری پارێزگاریکردن و شێوەی دابنرێت، لێپرسراو لەو کارەو رێگەی دڵنیایی لەوە دەستنیشان بکرێن، سنوری لێپرسینەوەو سزا بۆئەوانەی لەوە دەردەچن دیاری بکرێت.

بە رونی دەربخرێ کێ لەو کارە بەرپرسیارە.. ؟ چۆن ئەو ئەرکە بەئەنجام دەگەیەنرێت..؟

– دەستنیشانکردنی لێپرسراوەتی پارێزگاریکردنی نهێنییەکان و جۆری بەرپرسیاریی بەرامبەر ئەو یاسایانە و سزاکان بەروونی دەربخرێن.

– پارێزگاریکردنی نهێنی، نەدرکاندن، نەبردنەدەرەوەی مەتریاڵ، نهێنییەکانی هاوپێوەند بەبەرژەوەندیی گشتی و ئازادیی

فەرد و خێزان، کۆڕوکۆمەڵ، دەبێت بە جۆرێك بن کەکەس نەتوانێ لە سنوری ئامۆژگاری و بڕیار و یاساکانی تایبەت بەم لایەنەی ئەرشیف دەربچێت، هەر کەس بە کارێکی وا زیانبەخش هەستا، بەبێ چاوپۆشین سزای یاسایی بدرێت..

—لێپرسراوانی ئەرشیف، هەریەکە بەپێی ئاستی بەرپرسیاریی لەئەنك و هەموو ئەرشیفەکانی بەستراوە پێیەوە، لێپرسراوان لە ئەرشیف و پارێزگاریکردنی نهێنییەکانی. هەر یەکە بەرامبەر بە یاسا لێپرسراوە لە بچوکترین نهێنی درکاندن یان بردنە دەرەوەی، بەهەر رێگەو شوێنێك و بە هەر بیانویەکەوە بێت، هەر لە نهێنییەکی سادەی بەزیبانەوە تا نهێنییە زەق و ئاشکراکان.

—سەرجەمی مەتریاڵەکانی ناو ئەنك و هەمو ئەرشیفەکانی حکومەتیی، دیسان هەموو ئەو نوسراو و مەتریاڵانە بەهۆی بارودۆخی تایبەتیی کوردستان، و داگیرکردن و شەڕو شۆڕەوە کۆنەکراونەتەوە و دەست هاووڵاتیان کەوتووە.. موڵکی نەتەوەیە و دەبێت بە سەلامەتیی بدرێتەوە بە ئەنك، یان هەر ئەرشیفێکی تری خواروتری. بێگومانە کە بەرپرسیاریی نیشتمانی و مرۆڤی ویژدان روبەڕوی هەریەکێك لەو کەسانە دەبێتەوە، لە پارێزگاریکردنی ئەرشیفەکەو نهێنییەکانی تا دەگەیەنرێتەوە جێگەی خۆی..

—ماوەی بە نهێنی هێشتنەوەی مەتریاڵ و نوسین لە ئەرشیفدا بەپێی هەستیاریی نهێنییەکانی ناوی و ماوەی مانەوەو ئەگەری زیاندان بۆ ئەو لایەنانەی باسکرا، دیارە دەکرێت، دەسەڵاتی یاسایی بەرز، یان بەرزترین بەڕێوەبردن لێپرسراوە لە لێکۆڵینەوەی ئەو لایەنانە و سنوردارکردنی ئەو ماوانە.

## سەردانی ئەرشیف

وەك بەشێك لە رێگەو شوێنی بەڕێوەبردن و پارێزگاریکردنی دۆکۆمێنت و ئەرشیف لە فەوتان و خراپ بەکارهێنان، بەڕێوەبەرایەتیی ئەرشیف هەموو مەرجێکی پێویست بۆ مسۆگەرکردنی ئەوانە دادەنێت..

بەشێك لەوانە، رێگەو شوێنەکانی سەردانی ئەرشیفە بە مەبەستی خوێندنەوەو:

لەناو ئەو ئامۆژگاریانەی هەمو لایەك دەیزانن و پەیڕەو دەکرێن، بە باش زانرا جەخت لەسەر ئەم خاڵانە بکرێت:

—لە تۆماری تایبەتیدا ئەو کەسەی سەردانی ئەرشیف دەکات بەمەبەستی لێکۆڵینەوە، یان سەیرکردنی دۆکمێنتێ، دەبێت ناوی تەواوی خۆی ئەدرەس و تەلەفون بنوسێ.

—ئەو دۆکومێنت، دۆسێ یان ئەو مەتریاڵەی وەری دەگرێت بە روونی لە ئیستمارەی تایبەتیدا لەگەڵ رۆژ و بەرواری سەردانەکە بنوسرێت.

—دەبێت ئامۆژگاریی پێویست لەسەر جۆری نەرم و نیان جوڵانەوەو بەکارهێنانی نوسراوەکان بنوسرێت، تا مەتریاڵەکان لە دڕان و سووتان بپارێزرێن..

—دەستکاریکردن و لەسەر نوسین و خەت پێداهێنان و نیشانە کردن و هەمەجۆرە دیاردەیەکی تری لەوبابەتانە قەدەغەیە.

—بردنە ژورەوەی پاڵتۆو جانتاو ئەو جۆرە شتانەی تر کە دەتوانرێت شتیان تیا حەشار بدرێت قەدەغەیە.

—جگەرەکێشان لە ساڵەکەو لەو شوێنانەی نزیك و دەوری کە دەبنە خوڵقاندنی هەر جۆرە گومانێك بۆ ئاگرکەوتنەوە بە تەواوی قەدەغەیە. بۆیە دەبێت جگەرەکێش لە دەرەوەی ئەرشیفخانەکە جگەرە بکێشێت.

—هیچ خواردن و خورادنەوەیەك نابرێتە ناو ساڵەکەوە.

—رێگەی هیچ کەسێك نادرێت سەردانی مەخزەنەکانی ئەرشیفگەکە بکات بەبێ ئاگاداریی لێپرسراوی یەکەم.

—کۆپیکردنی نوسراو، مەبەست ئەو نوسراوانەی کە هیچ نهێنییەکی لەو بابەتانەی لە شوێنی خۆیدا باسکراون تێیدا بێت، بێ بڕیاری لێپرسراوی هاوپەیوەند بە ئەرشیفەکەوە قەدەغەیە، تا بتوانرێت کەمتر کۆپی دۆکۆمێنت بکرێت، بەتایبەتی کۆن و رزیوەکان، چونکە هەر کۆپیکردنێك بەشێك لە تەمەنی دۆکومێنتەکە کەم دەکاتەوەو لە فەوتان نزیکی دەخاتەوە، بۆئەم حاڵەتانە باشتر وایە یەك کۆپی لە ئەسڵییەکە وەربگیرێت بۆ بەردەست، ئیتر نوسخە ئەسڵییەکە نەخرێتە بەردەست.

## هەندێك رێگەو شوێنی پراکتیکانە بۆ ناسینەوەی دۆکومێنت..

بۆ بڕواو متمانە کردن بە دوکومێنتێك، ئەگەر گومان لەسەری هەبێت، نەزانرێت ئایا ئەوە ئەسڵییە یاننە.. بەبێ پەنابردن بۆ کارو ئامرازی تەکنیك کە زۆرجار بەزەحمەتییەکی زۆر دەکرێت، بەهۆی ئەو جۆرە پرنسیپانەی بۆ ئەرشیفکردن دانراوە و پەیڕەو دەکرێن، دەتوانرێت تارادەیەکی باش پەی بەوە ببرێت کە ئایا ئەسڵییە یاننە، بەتایبەتیی ئەگەر وەڵامی دروستی ئەم پرسیارانە بدرێتەوە:

—کێ دۆکومێنتەکەی نوسیوە..؟

—کەی نوسیویەتی..؟

—لەکوێ نوسراوە..

—کەی نێرراوە بۆ شوێن و لایەنی مەبەست..؟

—یان کەی و لەکوێوە هاتووە..؟

—ئایا لە تۆماری رۆژانەدا نوسراوە..

—لە ئەرشیفخانەدا لە شوێنی تایبەتیی خۆیدا تۆمارکراوە..؟

—ئایا لە دۆسێ یان فایلی تایبەتی خۆیدا و لە لیستەی ئەو جۆرە نوسراوانەدا تۆمار کراوە..؟

—کێ و کەی بڕیاری ئەرشیفکردنی داوە و کارەکەی ئەنجامداوە..؟

—ئایا ئەو دەزگا و دایەرەیە پەیڕەویی سستێمی تۆماری رۆژانەی نوسراوی هاتوو وە رۆیشتوو و دابەشکردنی کردووە..؟

-ئایا هیچ جۆرە دەسکارییەکی ئەرشیفەکە یان تۆماری کلیلی زنجیرەکان بەپێی زنجیرەی تۆمارەکان کراوە..؟

## تێبینی:

ئەگەر لە دۆسیێ، فایل یان کارتۆنی هەر باس و بەشێکی ئەرشیفی هەر دادگایەکی تر شتێك هەبوو کە پەیوەندیی بە کێشەیەك یان حکومەتێك یان بڕیارێکی تا و دۆسێ و فایل و هەرباسێکی تری ئەرشیفێکی کار لەسەرکردوودا هەبێت وادەبێت، لەهەردولادا ئاماژە بۆئەوی تر بکرێت، لە دەلیلەکەشدا ئەوە روونبکرێتەوە.. لەوو شوێنە تایبەتییەی بۆ ئەم لایەنە تەرخان کراوە، هەروەك لە شوێنی خۆیدا رونکراوەتەوە، بەوەش ئەو بڕیارە و حوکم و باسانەی پەیوەندییان بە یەك کێشەوە هەبێت و بەستراوە بەو کێشەیەی ناو ئەو فایلەی جێگەی مەبەست، بەمەش زانیارییەکان و ئاگاداربون لێیان ئاسان دەکات، کە بەوەش کاری هێنانە بەردەست بۆلێکۆڵینەوە زۆر ئاسان دەکات. وەهەروەوپێیە لە ئیستمارەی رێکخستنی هەر بەش و بەشە سەرەکییە ئەوانە دەنوسرێن.

## تێبینی:

مەبەست لە کارتۆن بەو قەبارەیە بێت کە کتێبێك بە درێژی 4 (بە قەبارەی کاغەزی خورشیدی)، و پانیی ئاسایی، کە چەند سەد لاپەڕەیەك بگرێت، تا ئەو سنورەی کە بتوانرێت ئاسان کارتۆنەکە بۆ کارلەسەرکردن، هاتوچۆی پێ بکرێت بێئەوەی زیان بە مەتریاڵەکانی ناوی بگەیەنرێت. دیارە بۆ دۆسێ و فایل دەبێت، نوسراوەکانی دوتوێیان زۆرو کەمترو بچوکتر بن.. تا بشتوانرێت هەر بە زنجیرە یەك بەیەك جۆر کارتۆن یان فایل و بە قەبارەش نزیك لەیەك بن باشتریشە کە لەهەر کارتۆن یان فایلێکدا نوسراوی یەك کێشەو یەك زنجیرەی تێدا هەڵبگیرێت، واتە نابێت مەتریاڵی زنجیرەیەك تێکەڵی یەکێکی تر بکرێت، بەڵام ئەگەر چەند نوسراوە یان کێشەیەکی یەك زنجیرە لەیەك کارتۆن یان فایلدا دانرا وادەبێت لە تۆمارەکاندا و لەسەر کارتۆنەکەدا ئاماژەی بۆ بکرێت تا ئاسان بهێنرێتە بەردەست و لەناوەخنەکانی حاڵی بن..

## پەراوێزەکان

(1)ئەو پەیوەندیەی دانیشتن و قسەکردن و هەوڵانە چەند و لە چەند بۆنەدا بو کە ئێرە جێگەی باسکردنیان نییە.

– ساڵی پار لەگەڵ تەواوبوونی نوسینەکە سەرو نوسخەم بۆ سەرۆکی وەزیران و وەزیری رۆشنبیری ناردو بەدەستیش نوسخەیەکم دا بە سەرۆکی زانکۆی سلێمانی. ئەمە هەمان دەقە بەراستکردنەوەی هەڵەی تایپ و کەمێ زیادکردن و ئاڵوگۆڕو دەستکاریی بۆ بڵاوکردنەوەی.

– بە پێویستم نەزانی لێرەدا ئەو یاسایانەی بۆ دامەزراندنی ئەرشیف دانراون و کران بە کوردی و خستبومە تەك نوسینەکە، بڵاوبکرێتەوە.

(2)ئەگەر کورتکراوەی گونجاو تر هەبوا دەتوانرێت بخرێتە جێگەی ئەمانە. بەڵام ئەوەی بڕیاری لەسەر دەدرێت ئیتر نابێت هیچ لایەك بیگۆڕێت.

-دیارە ئەم یاساو پرنسیپ و رێنمایی و رێگە و شوێنانە هەموو ئەرشیفانەی دەبری یان ناویان نەبراوە دەگرێتەوە.

(3)زاراوەی دۆکمێنت لە ئەرشیفدا جگە لە مانا تایبەتییەکەی خۆی، مانای هەموو ئەو بەڵگەنامەو نوسراو تۆماری دەستکەوت و خەرج و وەسڵ و کارانە دەگرنەوە کە لە سنوری کاری ئەرشیفیدا جێگەیان دەبێتەوە، لەکاتێکدا بەڵگەنامە سنورەکەی تەسکترە، مانای هەموو بەڵگەنامەیەك دۆکمێنتە، بەڵام هەمو دۆکومێنتێك بەڵگەنامە نییە.

## سەرچاوەکان بە زمانی سویدی:

**1**)کتێب دانراو:


Nils Nilsson - Arkivkunskap – Lund 1975
Anna Christina Ulfsparre – Arkivvetenskap – Lund 1995
Annika Holmberg - Vilse i kriget Falkoping 1995
Arsbok for Riksarkivet och Landsarliven - det gamla som det nya – 1994
Artsbok for Riksarkivet och Landsarkiven - Arkiv hemma och ute – 1995
Arsbok for Riksarkivet och Landsarkiven - Arv och Vavor – 1996
Arsbok for Riksarkivet och Landsarkiven - Grannar emmellan - 1997
Arsbok for Riksarkivet och Lan.isarkiven - Krig och fred 1998

-2 گرڤارو بڵاوکراوە:

Arkiv samhslie och Forskning nr: 1-1998 - Svenska Arkivsamfundet
Arkiv Magasinet nr: 3- 98 Riksarkivet
Nordiskarkivnyt nr: 2-4 1991, 1-4 1992, 1-4 1993, 2-4 1994, 1-4 1995, 1-4 1996, 1-4 1997 1-3 1998
Tima Arkiv nr : 3-98

-3 مەتریاڵی ئەو کۆرسانەی هاوبەشیم تێداکردبوون کە ئەم خانمانە بەڕێوەبردن:

Gunilla Lyck
Greta Solberg
Annika Carlsson
Elisabeth Celaner
Anna- Karin Westerlund

ئەمانەش بەشێ لە مەتریاڵی ئەو کۆرسانە بوون

-Svensk forfatttningssamlin 1991`:446, 1995:1474
Forteckningsplan for Lansratter-
Arkivbidningsplan –
Domstolar: Haradsratt, Radhusyatt Tingsratterna (Upprattad av Domstolsverket-
Svenska Uppslagsbok, bund 11 – 1995
Svenska Uppslagasbok bund 11 1955


## سەرچاوەکان بە زمانی سویدی:

**2**)کتێب دانراو:


Nils Nilsson - Arkivkunskap – Lund 1975
Anna Christina Ulfsparre – Arkivvetenskap – Lund 1995
Annika Holmberg - Vilse I kriget Falkoping 1995
Arsbok for Riksarkivet och Landsarliven - det gamla som det nya – 1994
Artsbok for Riksarkivet och Landsarkiven - Arkiv hemma och ute – 1995
Arsbok for Riksarkivet och Landsarkiven - Arv och Vavor – 1996
Arsbok for Riksarkivet och Landsarkiven - Grannar emmellán - 1997

Arsbok for Riksarkivet och Landsarkiven - Krig och fred 1998

-2 گرڤارو بلاوکراوه:

Arkiv samhslle och Forskning nr: 1-1998 - Svenska Arkivsamfundet

Arkiv Magasinet nr: 3- 98 Riksarkivet

Nordiskarkivnyt nr: 2-4 1991, 1-4 1992, 1-4 1993, 2-4 1994, 1-4 1995, 1-4 1996, 1-4 1997 1-3 1998

Tima Arkiv nr : 3-98

-3 مەتریاڵی ئەو کۆرسانەی هاوبەشیم تێداکردبوون کە ئەم خانمانە بەڕێوەبردن:

Gunilla Lyck
Greta Solberg
Annika Carlsson
Elisabeth Celaner
Anna- Karin Westerlund

ئەمانەش بەشێ لە مەتریاڵی ئەو کۆرسانە بوون

-Svensk forfatttningssamlin 1991`:446, 1995:1474

Forteckningsplan for Lansratter-

Arkivbidningsplan –

Domstolar: Haradsratt, Radhusyatt Tingsratterna (Upprattad av Domstolsverket-

Svenska Uppslagsbok, bund 11 – 1995

Svenska Uppslagasbok bund 11 1955



نموونەیەك لە وەرگێڕان

# شانۆنامەی دەروێشەکان بەدوای راستیدا دەگەڕێن

نووسینی مستەفا حەللاج

و: مەحمود مەلا

## پەردەی یەکەم

**شوێن**

(لەناوەڕاستی شانۆکەدا ژوورێکی تەنگی زیندانێکە لەبەشی سەرەوەی لای چەپی دیوارەکە، کونێکی بچووکی چوارگۆشەیە کە بەشیشی ئاسن تەنراوەو ئەمە تاکە ڕوانگەیە بۆ دەری ژووری زیندانەکە،

لەسەر ئەرزەکەی قاپێکی کوون و دۆلکەیەکی شکاوی چا دانراون. لەهەندێ کاتدا ژوورەکە بەچۆڵ و هۆڵیی دەردەخرێت. لای ڕاست و چەپی شانۆکەو هەردوولای ژووری زیندانەکە چۆڵ و تاریکە، هەرکاتێك پێویست بێت ڕووناکیی ئاراستەی هەردوولا دەکرێت.)

(دەرگای ئاسنینی ژوورەکە لەپێشەوەیە.)

(بازنەی ڕووناکیی لە زیندانەکەدا ناوەڕاستی شانۆ کەشی گرتۆتەوە، دەروێش بەرامبەر چاودێرگەکە دانیشتووە. هەردوو چاوی لێکناوەو بەپەستییەکەوە سەری ئەهێنێ و ئەبا. لەپڕ دەنگی مۆسیقای سەما بەتوندیی و تێکەڵ بە گۆرانی و پێکەنین بە چەند وێنەیەکی نواندن دەستپێدەکات.

لەگەڵ بەرزبوونەوەی دەنگی تەسجیلەکە لەدەرەوەی ژوورەکە، دەروێش لەجێگەکەی خۆیەوە رادەپەڕێت).

دەروێش: (کەمێك گوێ قولاغ دەبێت، مۆسیقاکە ئەوەستێ، هەناسەیەکی خۆشیی ئەداتەوە) ئاخخخ، خۆ کات زۆری بەدەمەوەماوە، ئاخخخ لەدەست مۆسیقای شەو لەپڕ بۆڕەی دێت و کاتیش زۆری بەدەمەوە ماوە!

**(ڕووناکییەکە لەسەر دیواری ژووری زیندانەکە فراوان دەبێت)**

**توخوا مۆسیقای ناوەخت کەمێك سەبرو بەزەیی..!**

(لەدەرگا ئاسنینەکە ئەدرێت) من لێرەم..

(بەواق وڕماوییەکەوە سەری ئەلەقێنێ)

پاسەوان گیان بەسەر سەرو بەسەر چاوان، من لێرەم و هیچم ناوێ(قسەکەی ئاراستەی خودی پاسەوانەکە ئەکات بەبێ ئەوەی بیبینێت) بەمۆسیقاکە بڵێ با جارێ بوەستێ و سەبر بگرێت. ئەگەر یەکێکیان ویستی شتەکان بخاتە کار ئەوا پێی بڵێ جارێ کات بەدەمییەوە ماوە(دووجار لەدەرگای زیندانەکە ئەدرێت) هیچم ناوێ ئەوە نەبێت کەبەو پیاوەی دانیشتووەو چاوی بڕیوەتە شتەکان بڵێیت جارێ کات زۆری بەدەمەوەیە بەزەییەکت پێمدا بێتەوە، توخوا پاسەوان: کەمێك بەزەیی و دوو وشەی بچکۆلە بەگوێی ئەو پیاوەدا بچرپێنەو بڵێ: جارێ کات زۆری بەدەمەوەیە(پاسەوانەکە پەنجەرۆکەکەی دەرگا ئاسنینەکە ئەکاتەوەو چاوێك بەژوورەکەدا ئەگێڕێ، دەروێش ئەبینێت وا خۆی بەدیوارەکەوە مەلاس داوە).

پاسەوان: (لەدەرەوە) هۆو کوڕە تۆ!

دەروێش: (لەشوێنی خۆیەوە لەنزیك دیوارەکەوە) بەڵێ گەورەم پاسەوان.

پاسەوان: وەرە ئێرەوە، وەرە بەردەمم!

دەروێش(دێتە پێشەوە) بەڵێ گەورەم فەرموو.

پاسەوان: ئەوە چی ئەکەیت لەپشت دەرگاکەوە؟

دەروێش: قوربان وەستاوم.

پاسەوان: ئینجا بۆچی لەوێدا وەستاویت؟ چیت لەژێر سەردایە؟

دەروێش: هیچ گەورەم.. بەچیت بڕوایە هەر تەنها لەوێدا وەستاوم و هیچیتر.

پاسەوان: (بەتوڕەییەوە) ئەفرەتت لێبێت ئەزانم لەوێدا وەستاویت، بەڵام من ئەڵێم چیت ئەکرد؟

دەروێش: (بەشڵەژاوییەکەوە): چیم ئەکرد!؟

پاسەوان: بەڵێ چیت ئەکرد؟

دەروێش: گەورەم پاسەوان: نازانم، بەڵام من، (قسەکەی تەواو ناکات)

پاسەوان: (ئەنەڕێنێت) من چی؟ دەی قسە بکە

دەروێش: وامەزانی یەکێك مۆسیقاکەی کردەوە.

پاسەوان: یەکێك مۆسیقاکەی کردەوە؟ جا مەبەستت چییە؟

دەروێش: قوربان گوێ ئەگرم!

پاسەوان: (قاچی بەئەرزەکەدا ئەدات) گوێ ئەگریت! یان شتێکت لەژێر سەردایە؟

دەروێش: خوا ئەزانێت گەورەم هیچ شتێکم لەمێشکدانییە، ئەوە نەبێت کەیەکێکیان شتەکانی خستەکار بەبێ ئەوەی کاتی هاتبێ، ئیتروا (بەسەرسوورمانەوە هەردوو دەستی بەرز ئەکاتەوە) بەو جۆرە منت لەپشت دەرگاکەوە بینی...![1]

پاسەوان: (بەوردی پێیدا هەڵدەڕوانیت) وەرە (دەروێش نزیك ئەبێتەوە) دەی وەرە پێشەوە... زیاتر دەی زیاتر (دەروێش بەترسەوە نزیکتر دەبێتەوە) ئەوە چییە وا ئەزانیت ئەتخۆم.

دەروێش(نزیك ئەبێتەوە): نا گەورەم... نامخۆیت!

پاسەوان: ئاخخ.. ئاخر توخوا کەس شتی وای بیستووە؟ هەر بەڕاستی وا دەزانیت کە نایکەم..!

1. مەبەست لەوشەی شتەکان، دوابڕاوەکان، ئامرازەکان کەرەسەی ئەشکەنجەدانە.

دەروێش: (سەری بەنەخێر ڕائەوەشێنێت).

پاسەوان: کوڕە ئەوە تۆ شێتیت؟

دەروێش: نەخێر گەورەم.

پاسەوان: بەڵێ تۆ گەوجیشی و شێتیشیت..

دەروێش: نا نا گەورەم

پاسەوان: (بەتووڕەییەوە) باهەر بەڕاستی تۆ گەوجیشیت و شێتیشیت)

دەروێش: (ئەیەوێت وەڵام بداتەوە، ئینجا ئەچێتە دواوە).

پاسەوان: باشە... ئێستا ڕاستییەکەیم پێ بڵێ، تۆ هیچ پەڕلەیەک، شتێکت لەژێرسەردا نەبوو؟

دەروێش: گەورەم، ئەگەر بڕوام پێئەکەیت، وا من هەر نازانم مەبەستت لەپەڕلەو شت چییە.. هەر بەڕاستیش من هیچم نەکردووە. (ئینجا بەچرپەوە قسەئەکات) ئەو مۆسیقایە وایلێکردم کە لەجێگەی خۆمەوە ڕاپەڕم و خۆم بدەمە پەنا دیوارەکە (سەیرێکی پاسەوانەکە ئەکات، بەڕووخساری پڕ لەپاکانەوە. داوای بڕواپێکردنی لێدەکات).. باوەڕم پێدەکەیت...؟

پاسەوان: (لێی ورد ئەبێتەوە و بەچاوێکی بەزەییەوە): باشە باوەڕت پێئەکەم بەڵام ها بۆ لەمەودوا جارێکی تر شتی وا دووبارە نەکەیتەوە. (دەروێش سەری بۆ ئەلەقێنێت، وەکو وەڵام بۆ هەڕەشەکەی) دووجاریش لەدەرگاکەمدا، کەچی هیچ وەڵامت نەبوو..!

دەروێش: بەڵێ وایە... چونکە پێویستم بەهیچ نییە...!

پاسەوان: ئەی ئێستا پێویستت بەهیچ نییە؟

دەروێش: (بەترسێکەوە لێی ورد ئەبێتەوە، نەوەک ئەمجارەش لێی تووڕەببێتەوە... ئینجا بەدەنگێکی لەسەرخۆوە) نەخێر گەورەم.

پاسەوان: (هەروەک دەروێش، بەدەنگێکی هیواشەوە) ئەزانیت؟ ئەگەر بەتەواوی نەمزانیایە کە گەوجیت، وا گومانی شتێکی ترم لێدەکردیت..

دەروێش: (بەناچارییەکەوە) لەگەڵتام گەورەم... من گەوجم! وابزانم هەر بەڕاستی من گێلەپیاوم..!

پاسەوان: ئەی ئەگەر شتێکت لەژێر سەردا نەبووایە، فریای خۆت نەئەکەوتیت و ئێستا بۆخوت لەدەرەوە پڕ بەسییەکانت هەوای پاکت هەڵئەمژایە...!؟

دەروێش: (بەسەری خۆیدا ئەماڵێت هەروەک دوای کات بەسەرچوون ڕاستی بۆ دەرکەوتبێت) ئاخخخ ئاخ

پاسەوان: هەموو ئەوانە دەریدەخەن، کەتۆ گەوج نیت.

دەروێش: ئاخخخ... بەخوا هیچ شتێکی وام بەبیردا نەهاتووە...

پاسەوان: ئەی ئێستا نایکەیت...؟

دەروێش: بەڵێ ئەگەر ڕێگەم پێ بدەیت..

پاسەوان: (ئاوڕ ئەداتەوەو هاوار لەیەکێک ئەکات هۆ کوڕە تۆ، جارێ بوەستە هێشتا نۆرەی تۆ نەهاتووە... (ئینجا ڕوودەکاتەوە دەروێش) چاوت لێیە، هەر هەلیان بۆ هەڵبکەوێت جار لە دوای جار لەدەرگا ئەدەن و ئەناوا ئیسراحەتمان لێ تێک ئەدەن... ! ئەی جەنابت چیت؟ مشتەری کۆنیت یان تازە؟

دەروێش: (ڕووی وەرئەگێڕێت و لەبەرخۆیەوە قسە ئەکات!) ئایا ئەبێت چی بڵێم! کۆن یان تازە، دەبێت کامیان بم! ڕەنگە ئەم پرسیارە داوێکی لەپشتەوە بێت... ئەی باشتر نییە کەلێی بپرسم و بزانم مەبەستی چییە!

پاسەوان: (بەقاڵسبوونێکەوە) ئەوە چییە... بۆچی مشاوەرەی خۆت ئەکەیت؟ ئەی گوایە نازانیت تۆ لێرەدا کۆنیت یان تازە...؟

دەروێش: (ڕوودەکاتە پاسەوان) گەورەم ئەگەر ڕاستیت دەوێت، ئەوا من نازانم مەبەستت چییە، مەگەر بۆم ڕوون بکەیتەوە، من تەنها دەمویست لەمەبەستەکەت تێبگەم، تا بەدڵی تۆ وەڵام بدەمەوە!

پاسەوان: گوێ بگرە! (بەچرپەیەکەوە قسە ئەکات) من بۆ خۆشم نازانم چی وام لێدەکات کەوا زۆر لات بوەستم، من لێکۆڵەر نیم! قسە بکەو لەهیچ مەترسە... (جوان سەرنجی لێدەدات) من شتێك لەڕووخسارتدا بەدی ئەکەم هەڵسوکەوتت بەوجۆرە سەنجم ڕائەکێشێت ڕەنگە ئەوە زۆر لەسەرنجیش زیاتر بێت.... دەی قسەبکە...!

(دەروێش ئەیەوێت قسە بکات) جارێ با سەیرێك بکەم (پاسەوانەکە کەمێك ئەڕوات و ئەگەڕێتەوە) دەنگت بەرز مەکەرەوە، تا خۆم ئاماژەت بۆ نەکەم...! پێم بڵێ چی تۆی گەیاندۆتە ئێرە؟

دەروێش: (دەرگای ڕازەکانی بۆ کرایەوەو یەکێکی دەستکەوت هەندێك لەنهێنییەکانی ناو دەروونی بۆ بدرکێنێت، ئینجا هەناسەیەك هەڵئەکێشێت) ڕێگەم ئەدەیت وەك هەڤاڵێك قسەت بۆ بکەم، زۆر باشە ئەوە کارەکەم لا ئاسان ئەکات.... ڕاستییەکەی... ڕاستییەکەی ئەوان لەبەر هۆیەك منیان بۆ ئێرە هێناوە.

پاسەوان: خودی باسەکە چییە... تۆ لەخودی باسەکە بدوێ جارێکی تر خۆت گەوج مەکەرەوە.

دەروێش: (سەری ڕائەوەشێنێت) خۆ منیش لەخودی باسەکە ئەدوێم هەموو هەر ئەو دوایەم لێدەکەن، کە لەخودی باسەکە بدوێم.

ئەوان لەبەر هۆیەك منیان هێناوەتە ئێرە..

بێگومان ئەبێت کارەکە وابێت، بەڵام (کەمێك ئەوەستێو لەپاسەوانەکە ورد ئەبێتەوە، کاکی خۆم بەگێل لە قەڵەمم مەدە، ئەگەر ڕاستیەکەم بەدوو وشە پێگوتیت: من بۆ خۆشم نازانم لەبەرچی منیان بۆ ئێرە هێناوە!

پاسەوان: (چاوەڕوان ئەبێت تا دەروێش شتێکی بۆ ڕوون بکاتەوە، بەڵام دەروێش هەر سەیری ئەکات، بەبێ ئەوەی شتێکی تر بڵێت، بەڵکو هەروەکو هەموو ڕاستییەکی گوتبێت).

دەروێش: نازانم کاتێکیش دەستیان کرد بەپرسیارو لێکۆڵینەوە منیش خێرا پرسیاری خۆمم لێکردن.

پاسەوان: (لەو قسەیەدا گاڵتەوگەپێکی دەستکەوت) ئێ تۆش پرسیاری خۆتت لێدەکردن.

دەروێش: بەڵی هەڤاڵ، ئەوان گەلێ پرسیاریان لێکردم یەك لەدوای یەك پرسیاریان ئاراستەم ئەکرد، منیش بیرم لەخودی خۆم ئەکردەوە! ئەوان پرسیاریان ئاراستەی یەکێك ئەکرد قسەکان دەربارەی زەلامێکی دیاریکراو بوون، بێگومان ئەو کەسەش من نەبووم، خۆ بەخوا هێندەیان دەربارەی ئەوکەسە ئەزانێ، کەڕەنگە زۆر زیاتر بووبێت لەوەی پێویست بێت، ناوەکەی، خێزانی، ئیشی، تایبەتییەکانی... ئیتر هەموو وردە نهێنییەکیان دەربارەی ئەو پیاوە ئەزانێ، هەروەك بۆ هەر جێگەیەك رۆیشتبووبێت پێی نابێتە هەر شوێنێك بەدوایەوە بووبن! دوای ئەوە، بەڵێ ئیتر دوای ئەوە، کەزانیم و لەوە دڵنیا بووم کەئەو کەسەی ئەوان مەبەستیانە ئەوە من نیم، ئیتر داوام کرد کەرێگەی پرسیارکردنم بدەن.

پاسەوان: (تائێستاش لەزەت لە گاڵتەوگەپی ناو قسەکانی حەپسەکە ئەبینێ) هەروەك چۆن ئەوان پرسیاریان لەتۆ ئەکرد، تۆش ئاوا پرسیاری خۆتت لێدەکردن...!

دەروێش: بەڵێ ... بەڵێ هەر بەوجۆرە.

پاسەوان: (بەگاڵتەپێکردنێکەوە) وا بەئاسانی... و هەر بەوجۆرە؟

دەروێش: (سەرنج لەشێوەی گاڵتەپێکردنەکەی پاسەوانەکە نادات) گوتم: گەورەم سەرۆك، ئێوە لەبەر هۆیەك منتان بۆ ئێرە هێناوە، گومانی تێدانییە کەمنتان لەبەرشتێك بۆ ئێرە هێناوە دەی گەورەم تۆ ئەو خوایە بەزەییەکت پێمدا بێتەوەو پێم بڵێ، ئەو هۆیە یان ئەو شتە چییە...؟

پاسەوان: ئەوەت پێگوت...؟

دەروێش: بەڵێ بەڵێ..

پاسەوان: ئەی وەڵامی سەرۆك چی بوو؟

دەروێش: سەرۆك خۆی هیچی نەگوت، بەڵام یەکێکیتر کەژوورەکەی بەهاتوچۆ دەپێوا، لەکاتی پرسیارکردنا خێرا هاتە پێشەوەو تا توانی زللەیەکی تێسرەواندم..

پاسەوان: موستەحەق بوویت.

دەروێش: ئیتر خۆم بەخۆم دەگوت رەنگە شێوەی پرسیارکردنەکەم خراپ بووبێت دەی دەروێش ئەمجارەش تاقی بکەرەوەو بەشێوەیەکی‌تر بۆیان روونبکەرەوە... بەڵام داخی گرانم نەمتوانی... چونکە ئەوان هەموو دەرگاکانیان لەسەرم داخستبوو.. هەر کەئەمویست شتێك بڵێم یان شتێك روون بکەمەوە خێرا تێیان دەسرەواندم.

پاسەوان: زللە...! (بەدەنگێکی نزم) هەر زللە..؟

دەروێش: (خۆی جیڕدەکاتەوە) دەتوخوا وازم لێ بێنە... ناتوانم بیگێڕمەوە.

پاسەوان: بۆچی..؟

دەروێش: دە توخوا ئەگەر واز لەوە نەهێنیت، با برینەکانم نەکولێنەوە.

پاسەوان: (سەری بۆ ئەلەقێنێ وەك نیشانە بۆ تێگەیشتن لێی) باشە تێیگەیشتم ئەی دوای ئەوە چی بوو؟ دوای پرسیارکردن (ئاماژە بۆ شوێنی زللەکان ئەکات) چی بوو.

دەروێش: هیچ..!

پاسەوان: (بەسەرسوڕمانێکەوە) هەر هیچ هیچ..؟

دەروێش: نەخێر هیچ نەبوو.

پاسەوان: تائێستاش هەر پرسیار لەیەکتری دەکەن..؟

دەروێش: نەخێر کارەکە لەوەدا نەما.. دوای گێرمەوکێشەیەکی زۆر، دەستمان کرد بەئەنجام هەڵهێنجان.

پاسەوان: پرسیار ئەکەن و وەڵام ئەدەنەوە...؟

دەروێش: کارەکە زۆر ئاڵۆز بوو، پاسەوان گیان ئەوەی ئەوان مەبەستیان بوو من هەر تێینەدەگەیشتم، دەشبوو هەموومان بگەینە وەڵام و ئەنجامی روون و ئاشکرا.. ئیتر بەرەبەرە وام لێهات بەمەسەلەکەوە بەسترامەوە.. بڕگە بڕگە مەسەلەکەمان باس ئەکرد روونمان ئەکردەوەو ئینجا ئەماننووسییەوە، دوای ئەوە جارێکی تر ئەگەڕاینەوە سەری ئیتر بەتەواوی تاووتوێ و ئەمسەرو ئەوسەری راکانمان ئەکرد، تا وای لێدەکرا کەپەسندو گونجاوبن و بەدڵی ئەوان بێت ... ئەوسا ئەچووینە سەر بڕگەیەکی تر.. ئیتر بەوجۆرە.

پاسەوان: بەلەعنەت بم ئەگەر هیچ شتێکت لێ حاڵی بووبم.

دەروێش: (ئەیەوێ رەزامەندی بکات) هەڤاڵ ئاخر دەتۆ تورە مەبە، حاڵەکەم بۆ ماوەیەك هەروا مایەوە دوایی.

پاسەوان: (بەپەلەلێکردنەوە) ئێ ئەی دواییەکەی چی بوو؟

دەروێش: دوایی، دوایی ئیتر ناچاربووم و ریگەی خۆمم دۆزییەوە، خۆ ئەوەندەشیان دەربارەی ژیانی ئەوی تر ئەزانی کەپیاوی هەر وڕو گێژ ئەکرد.

پاسەوان: (بەسەرسوڕمانێکەوە): بەوجۆرە!

دەروێش: (بەکزییەکەوە) بەڵێ بەوجۆرە..

پاسەوان: (سمێڵەکانی با ئەدات و دەکەوێتە بیرکردنەوە) ئەی دوای ئەوە؟

دەروێش: ئیتر دوای ئەوە، ئەوەی ئەوان پێیان خۆش بووایە ئەوەم ئەگوت، بەبێ ئەوەی گوێ بەپاشەڕۆژو کەوتنەناوداوەوە بدەم..! خۆ هەندێ کات ئەمویست خۆم بگرم و هەر سووربم لەسەر راستی گوتن، بەڵام(بەدوودڵییەوە) خۆت ئەزانی، خۆ ئەوەی لەبەینی من و ئەو پیاوەدا هەبوو تەنها ناوەکە بوو ئیتر لەوە بەولاوەو لەهیچ روویەکی ترەوە لەیەکتری نەدەچووین.. ئەوەندەی خۆم خۆمم ناسی بێت و لەخۆم گەیشتبم، من و ئەو دووپیاوی تەواو لەیەك جیاوازبووین، دوو پیاو یەك ناویان هەبوو، بەڵام بەدرێژایی ئەرزو ئاسمان لەیەکتری دوور بووین..! مەسەلەکە لای خۆم ئاشکراو سادە بوو! بەڵام لای ئەوان...!

پاسەوان: زۆر ئاڵۆزبوو..؟

دەروێش: ئیتر ئەوە حاڵەکە بوو..!

پاسەوان: ئەی دوای ئەوە.. راستییان بۆ دەرنەکەوت؟

دەروێش: راستی...!! ئاخخ پاسەوانی هەڤاڵم.. هەریەکەمان وێڵی راستین و بەدوویدا رائەکەین، بەڵام بەدوو ڕێگەی جیاواز و پێچەوانەدا کە هەرگیز یەك ناگرنەوە...

پاسەوان: ئەی کەمێ لەمەوبەر تۆ نەتگوت ڕێگەی خۆم دۆزییەوە..؟

دەروێش: وابوو گەورەم وابوو، دە تۆ کەمێك لێم بوەستە با باسەکەت بۆ تەواوبکەم، من....

پاسەوان: (قسەکەی پێدەبڕێت) جارێ بوەستە با سەیرێکی راڕەوەکە بکەم. (پەنجەرۆکەکە دائەخات و ئەڕوات).

دەروێش: (بەتەنها لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێت) بەناچاری و تا زیاتر لەوە نەوروژێن، ڕێگەی خۆم دۆزییەوە. ئا بەوجۆرە دەروێش هەڵخلیسکایت و کەوتیتە عەودالی شتێك کەمەحاڵە پێی بگەیت، هەروەك خانوویەك دروست بکەیت و بەرد بخەیتە سەر بەرد لەکاتێکدا خانوو و بەردەکان لەبۆشاییدا هەڵواسراون، بەڵام کار لە کار ترازاو هەڵخلیسکایت و ئیتر کارەکە کۆتایی هات، کۆشکێك دروست بکەو لەبۆشاییدا هەڵیبواسە! ئەمە گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە بەردەکان یەك لەسەر یەك بن، (بەبێ ورەبییەوە سەری رائەوەشێنێت) گوێ مەدەرە بناغە دەروێش! با لەبۆشاییشدابێت، تۆ کۆشکەکە دروست بکە.

پاسەوان: (بەسەر قسەکانی دەروێشدا ئەگەڕێتەوە بەبێ ئەوەی دەروێش سەرنج بدات) بەخوا سەیرە دەروێش...ئێ، ئەی دوای ئەوە، دەی کورم تەواوی بکە.

دەروێش: ئیتر بەوجۆرە تادەهات زیاتر ڕووبەڕووی مەسەلەکە ئەبوومەوە، زیاتر لام ئاسان ئەبوو هەریەك لەپرسیارەکان بەربینی ئەوی تری دەگرت، تا وام لێهات هەر ڕووداو چیرۆك بوو هەڵمدەبەستو چونکە هەر تەنها بەوجۆرە ئەمتوانی پشوو بەخۆم بدەم و قورسایی کارەساتەکە لەسەر شانم سووك بکەم.. هەر بەوشێوەیە دوابڕاوەکانیشیان دەوەستان و ئیتر دەحەسامەوە.

پاسەوان: ئەی پرسیارەکان چییان لێهات دەروێش؟ ئایا پرسیارەکانیشیان وەستان؟

دەروێش: (جلەوی بۆ خەیاڵ شلکردووەو بێ ئەوەی ئاگای لەپاسەوان بمێنێت..) ئاخخ.. ئاخخ کاکی پاسەوان پرسیارەکان... پرسیارەکان.. بەجۆرێکم لێهاتبوو کە ئەگەر یەکێکیان پرسیارێکی لێ بکردمایەو بیگوتایە: ئایا کارەکە بەو جۆرە نەبوو؟ ئیتر من وا خۆم نیشان ئەدا کە بەوردی بیر ئەکەمەوە، ئەوسا وەڵام ئەدەمەوە. ئەمگوت: هاااا لەوانەیە، بەڵام با جارێ بێتەوە بیرم، نا نا بەڵکو هەروابوو، ئاا هەر بەتەواوی وابوو، ئیتر گۆڕینێك لەملاو زیادکردنێ لەولا تا تەلارێ دروست دەکراو بەڵام لە بۆشاییدا هەڵواسرابوو، گرنگ لای من ئەوەبوو کەدوابڕاوەکان بوەستێنرێن، (لەپڕێکا ئاوڕ لەپاسەوانەکە ئەداتەوە) خۆ بۆخۆت ئەزانێت دوابڕاوەکان چین؟

پاسەوان: (لەپڕو بەشڵەژاوییەکەوە) ها.. من ... ئینجا من پەیوەندیم بەوانەوە چییە!؟

دەروێش: (لێی نزیك ئەبێتەوەو لەسەر قسەکانی بەردەوام ئەبێت) ... خۆ تۆ دوابڕاوەکان ئەناسیت!! ها وا ئێستاکە زانیم کەئەزانیت دوابڕاوەکان چییە...

پاسەوان: (بەڕووگرژییەکەوە) لەعنەتیان لێ بێت یەك جار بینیومن.

دەروێش: (ئەکەوێتەوە ناو ساتەکانی ئەشکەنجە) بردمیانەوە لای... دوایی... دوایی... (خۆی گرژ ئەکات و ئەلەرزێ بەهەردوو دەستی ناوقەدی خۆی توند ئەگوشێت) ئیتر خستیانەوە کارو خۆیان رۆیشتن... دوایی کەهاتنەوە سەیرێکیان کردم... ئەوکاتە کارەکە کۆتایی پێ نەهێنرابوو!! ئاخخ ... ئاخخ... هەر تاوە ناتاوێك بەتیلەیەکی چاو سەیرێکیان ئەکردم، بەڵام کاتێ چەرخی راستی ئەسووڕایەوە، ئیتر دوابڕاوەکان ئەوەستان...) بەوجۆرە دۆخەکەی ژیان ئاواهی بوو (ئەوەستێ).

پاسەوان: (بەبێ بیرکردنەوە) ئاوا!

دەروێش: هەر بۆ ئەوەی دوابڕاوەکان بوەستێنن، بڕیارمدا چییان ئەوێت و چۆنیان بووێت بیڵێم.. ئیتر دەستیان کرد بەنووسین، چییان ویست گوتم نووسییان... بۆیە وامزانی ئیتر مەسەلەکە بەتەواوی کۆتایی پێهێنراو فایلەکەم داخرا، کەچی لەپڕ(ئەوەستێ و دەستێکی پەشۆکاویی بەسەر سنگیدا ئەهێنێ) شتێك لەناو سنگمدا هەڵقووڵا، دزەی کردە ناو دڵو دەروونم، هەروەك چۆن دزێکی لێهاتوو لەسەر پەنجەی پێیەکانی بەبێ خشپەو چرپە ئەڕوات... ئەی بیرەکان دزی بلیمەت نین و هەر خولیای ئەوەیانە کەدڵنیایی و بەختەوەری بدزن... ئیتر بەوجۆرە لەگێچەڵێ سەرفراز نەدەبووم ئەکەوتمە ناو گێچەڵێکیترەوە..

پاسەوان:... سەرفراز نەئەبوویت و تووشی یەکێکیتر ئەبوویت...!

دەروێش: (رووی تێ ئەکات) فایلەکەم داخرا (لێرەدا بەسنگی خۆیدا ئەکێشێت) لەسنگمدا فایلێکی تازە کرایەوە... ئەی تۆ وائەزانێت کەکارەکە هەروا بەئاسانی ئەڕۆیی..؟

پاسەوان: ئەی راستییەکانیان تۆمار نەکردو مەسەلەکە کۆتایی پێنەهێنرا؟

دەروێش: لێرەدا (ئەکێشێت بەسنگی خۆیدا) بەڵێ ئالێرەدا مەسەلەیەکی تازە دەستی پێکرد... لێرەدا(ئەکێشێت بەسەریدا) بەڵێ وابوو، بەڵام ئالێرەدا یەکێکیتر پەیدابوو، لە خەمی خۆم بوومەوە خەمی ئەویترم تێ ئاڵا، دزەی کردو خۆی خزانە ناو دڵو دەروونمەوە.

پاسەوان: (لێی ورد ئەبێتەوە جارێکیتر گومان لەوە ئەکات کەتێك نەچووبێت) ئەویتر؟ ئەویتر کێیە؟

دەروێش: بەڵێ ئەویتر، دەروێشەکەیتر کەخاوەنی کێشەکەیە! ئەو لەدەستیان رزگاری بووبوو، ئیتر منیان تووش کرد، ئەوان ئەمیان ئەویست و من گیرۆدەی دەستیان بووم و منیان کرد بەو...

پاسەوان: دوای ئەو هەموو پرسیار و وەڵامە، دوای ئەو هەموو چەرمەسەری و گێرمەوکێشەیە نەتتوانی بۆیان بسەلمێنێت کە تۆ کێیت و تۆ ئەونیت؟

دەروێش: پێم گوتن، زۆرم بۆ رستن، بەڵام برِوایان پێنەکردم.

پاسەوان: یەعنی تۆ نەتتوانی شوناسنامەی خۆتیان بۆ بسەلمێنیت؟

دەروێش: نەخێر.

پاسەوان: تێی گەیشتم، برِواناکەن کەتۆ تۆیت...!!

دەروێش: بەڵێ، برِواناکەن کەمن منم و من.

پاسەوان: (ئەکێشێت بەرِووی خۆیدا): خوای ئەرزو ئاسمان...!

دەروێش: ئا ئەوەیە راستییەکەی.

پاسەوان: ئەی دوای ئەوە..؟

دەروێش: ئای کاکی برا (لێی نزیک ئەبێتەوەو دەست بەشیشەکانی پەنجەرۆکەکەوە ئەگرێت، ئەوەی ویستیان پێی رازی بووم، من بووم بەوو وازم لەخۆم هێنا..

پاسەوان: (پاشەکشەیەك ئەکات) هەی گێلەپیاو، گەوجە...!

دەروێش: چار نەبوو برِوام پێبکە... من رازیی بووم کەخۆم تووش بکەم و ببم بەوی‌تر، وام ئەزانی کێشەکە وا چارەسەر ئەکرێ، کەچی خەمی چارەرِەش خۆی خزاندە ناو دڵمەوە، ئەوسا خۆم بەخۆمم دەگوت: دەروێش، کورە دەروێش! تۆ ئەزانیت چیت بەخۆت کرد...؟ کورە تۆ دەستبەرداری خۆت بوویت، خۆتت فرۆشت خۆت گۆرِییەوە بەیەکێکی‌تر، ئیستاش... دەی هەش بەسەر بینۆشە، ژەهراو بنۆشە، خەمێ هەڵگرە کەهی خۆت نییە، ببە بەگیانێك کەهی خۆت نییە، بچۆرە پێستێکەوە کە بەخۆت نامۆیە، لەناو خەڵکا بیدرکێنەو بڵاوی بکەرەوە، ببە بەوەی نەبوویت و ببە بەوەی خۆشت نایناسیت... بەوجۆرە بەڵێ کاکی خۆم ئا بەوجۆرە دەروونم قسەی بۆ ئەکردم... ترسیش هێرشی بۆ هێنام، کەوتمە زۆرانبازی، بەڵام بەسەرما زاڵ بوو، ئیتر کار لەکار ترازاو هیچ شتێك لەشوێنی خۆی نەما.

پاسەوان: دەروێش! ئاخر چۆن کار لەکار ترازا...؟

دەروێش: (هەردووو دەستی هەڵئەبرِێت و بەنائومێدییەکەوە) جارێکیتر نکوڵیم کرد، کەمن ئەوی‌تر بم.

پاسەوان: دووبارە...؟

دەروێش: بەڵێ دووبارە.

پاسەوان: (سەیرێکی رارِەوەکەی دەرەوە ئەکات و دوایی ئەگەرِێتەوەو بەچرپە قسە ئەکات) هەتیو پارچە پارچەت ئەکەن.

دەروێش: (سەری رائەوەشێنێت) ئەزانم... ئەزانم.

پاسەوان: تائێستاش هەر سووریت لەسەر نکوڵیکردن؟

دەروێش: ئەی ئەگەر وا نەکەم دەبێت چی بکەم؟ پێم گوتن چیم لێدەکەن بیکەن و نابم بەوی‌تر.. ئیتر بەوجۆرە چەندم توانی دەستبەرداری خۆم نەبووم.

پاسەوان: (بەوردی سەرنجی لێ ئەدات و لەرِووخساریدا نیشانەی گومان و دوودڵی دەرئەکەوێت): دەروێش!

دەروێش: بەڵێ هەڤاڵ.

پاسەوان: دەروێش! ئەرێ باوەرِ بەوە ناکەیت، کەتۆ هەر گەوج نیت! رەنگە هەر شێت بیت!!

دەروێش: ئاخخخ کاکی هەڤاڵ... ئاخخ و سەدان ئاخ، خۆزگە بەخۆزگایەتی خوا وابوومایە!

پاسەوان: ئاخر هەی دەروێش چۆن ئەقڵ ئەیگرێ کەکارەکە بەجۆرێك ئاڵۆز بێتو وا لەخەڵك بکات، کە گومان لەوە بکەن کەخودی زەلامێك بگۆرِن و بەیەکێکی تری بدەنە قەڵەم؟

دەروێش: (بەبێ‌وورەو بێ هیواییەکەوە هەردوو دەستی بەرز ئەکاتەوە): راستە قوربان راستە، ئەقڵ نایگرێ، بەڵام بۆ نەگبەتی من، وا ئێستاکە ئەقڵ ئەیگرێ و ئەولاتریش.

پاسەوان: (ئەیەوێ خۆی لەو کارەساتە دوور بخاتەوە) دەروێش! گوێ لەم ئامۆژگارییەم بگرە: ببەرەوە بەخۆت.

دەروێش: کام خۆم؟

پاسەوان: (لەپەنجەرۆکەکەوە دوور ئەکەوێتەوە) ببەرەوە بەخۆت!

دەروێش: ئاخر کام خۆم؟ خۆمی خۆم یان خۆمی ئەوی‌تر...؟

پاسەوان: (خەریکە پەنجەرۆکەکە دابخات) بەسە، نەختێکی‌تر چاودێرەکە دێت، خواحافیز.

دەروێش: (ئەپارِێتەوە) دەی کەمێکی‌تر بوەستە کاکی پاسەوان، توخوا ئەگەر تاوێکی‌تر نەوەستیت.

پاسەوان: دەروێش! تۆ خۆت باش ئەزانێت کە قسەکردن لەگەڵ زیندانییدا قەدەغەیە! ئەبێت برِۆم.

دەروێش: کەوابوو تۆش برِوام پێ ناکەیت، وا ئەزانیت من شێتم، باشە ئەگەر تۆ برِوام پێنەکەیت ئەی من چۆن برِوا بەخۆم پەیدا بکەم کەمن ئەو کەسە نیم ئەوان بەدوویدا ئەگەرِێن...؟ دڵم قسە بۆ مێشکم ئەکات: دەروێش: کورە ئەوەتۆ شێتیت، چۆن ئەتوانیت برِوا بکەی کەتۆ دەروێشێکی تری پێچەوانەی خۆتیت؟ مێشکم وەڵام ئەداتەوە ئەبم بەوی‌ترو خۆم سەرفراز ئەکەم. دڵم وەڵام ئەداتەوە: تۆ چۆنت دەوێ هەر وابکە، بەڵام من ناتوانم ئەوە بکەم، مێشکم ئەڵێت دەروێش! قایل ببە بەو ئاڵوگۆرِەو خۆت بحەوێنەرەوە، دڵیشم بێ سرەوتەو تادێت ترپەی زیاد و زیاتر ئەکات و ئیتر گوێم کەرِئەکات، هەر ترپەیەکیشی ئەڵێت: نا... نا... نا (پەنجەرۆکەکە دائەخرێت و پاسەوانەکە ون ئەبێت، دەروێشیش لەسەر قسەی خۆی ئەرِوات): کاکی پاسەوان وەرە، وەرەو خۆت گوێ لە ترپەکانی بگرەو بزانە چۆن، هاوارئەکات، نا ئەی پاسەوانە دڵسافەکە، ئەی هەڤاڵە پرِ لەبەزەییەکەم (بەنائومێدییەوە دەستەکانی رائەوەشێنێ‌و بەهەمووولایەکی ژووری زیندانەکەدا دێت و

دەچێت) کات...! کات ئەوەندەی بەبەرەوە نەماوە... (بەرامبەر بەکونی سەر دیوارەکە ئەوەستێ و سەیرێکی ئاسمان ئەکات) ئەی ئەستێرەی ناو شەوە زەنگ، تروسکەت بیّو چاو داگرەو گوێ مەدەرێ! ئەی مانگە درەخشاوەکە! بەی دەرکەوە بەرەو ژوور سەرکەوەو خۆت ئاسایی هێدی هێدی تەنگ بەپەڵە هەورەکان هەڵبچنە، تا رووە گەشەکەت لەنێوانی ئەم شیشانەوە جیهانی ئەم زیندانەم ببینێ و چاوی گەشی درەخشاوت تیشک ئاراستەی ئەم مەڵبەندە بکات، ئەودەمەش تێدەگەیت کەکاتی هاتووە...! ئەی مانگی وێڵ، وا هەنگاوهەنگاو نزیک ئەبێتەوە، ساتێکیتر دەنگ و ئاوازی خوێنەری بەختەکان چواردەوری ئەم قەڵایە پڕئەکەن و هاوار ئەکات: یەك، دوو، سێ، چوار، پێنج، (لەپڕ دەنگێکی زل بەرز ئەبێتەوەو ژمارەکان ئەخوێنێتەوە): 117، 228، 31، 71، 112، 123، 33، 38، 75...

دەروێش: بەخۆی ئەڵێ و ئەیڵێتەوە: 113، 113، 113.. (دەنگەکە لەدەرەوە هەر بەردەوامە لەسەر خوێندنەوەی ژمارەکان.. دەروێشیش هەر ئەیڵێتەوە: 113، 113...)

دەنگەکە: 113...

دەروێش: (لەشوێنی خۆیەوە رائەپەڕێت) 113.. بەڵێ113 بەڵێ113.. پاسەوانەکان دەی گازەرە ی دەرگا ئاسنەکان بخەنە سەرپشت! ئێوەش ئەی ئەشکەوتنشینەکان ئەی داماوە بێ دەرەتانەکان! خۆتان ئامادەکەن و دەرپەڕێنە دەرێ.. (زرمەو گرمەی کردنەوەو داخستنی دەرگا ئاسنەکان بەرز دەبێتەوە) دەرگای یەکەم بۆ لای چەپ، سێیەم بۆ لای راست، چوارەم بۆ لای راست ئاخخ، ئاخخ و سەدان ئاخخ (بەخێراییەکەوە ئەچێتەوە سەر جێگەیەکەی و دەست ئەکات بەپشکنینی، هەروەکو شتێکی لێ ون بووبێت، چاویشی هەر لەپەنجەرەکەیە) دەی دڵە بەسەزمانەکەم دە کەمێك بسرەوە، کەمێ ئارامی(دەستی ئەخاتە سەر دڵی) ئەی نازانی توانام نەماوەو ورەم رووخاوەو ئیتر چیتر بەرگە ناگرم، هەر لەبەرئەوەشە ئەی دڵە بێ ئارامەکەم کەدەبێت هەر راستییەکە بڵێم، من چیمە بەسەر خەمەکانی تۆوە! پێستم شەقار شەقار بووە، ئەوەی لەفایلەکەدا نووسرا هەموو شتێکەو بڕایەوە..

راستی کێشەکەم هەر فایلەکە ئەیزانێ، ئەوەی لەفایلەکەدا نووسراوە هەموو راستییەکان دەرنەخەن، تۆش ئەی دڵە وێڵەکەم! تائێستا ئازاری قامچییەکان نەیبرژاندوویت، لەنێش و ئەشکەنجەکانی قامچییەکان، لەدڕندەیی دوابڕاوەکان پارێزراو بوویت، لەژێر پێست و ناوەندی قەفەزەی سنگمدا شارراویتەوەو پارێزراویت..! دە وازم لێ بهێنەو بەرۆکم بەردە! (لەپڕ دەنگی مۆسیقای تێکەڵ بەگۆرانیو قسەو دەنگەدەنگو پێکەنین بەرز ئەبێتەوە، هەر لەوکاتەدا دەنگی تەپەتەپی پۆستاڵ تا دێت نزیك ئەبێتەوەو لەبەر دەرگاکەدا ئەوەستێ) دەستبەردارم بە(دەنگەکە خێراتر ئەبێ) وازم لێ بهێنە..

(دەرگای زیندانەکە ئەکرێتەوە، لەناو تاریکاییەکەوە پیاوێك دەرئەکەوێ، ئینجا یەکێکیتر، هەردووکیان ئەملاوئەولای دەروێش ئەگرن، پیاوی سێیەمیش لەسەر ئەو خەتەی نێوان رووناکییەکەی دەوری دەروێش لەناو ژوورەکەداو ئەو دووپیاوی تەنیشتی و تاریکایی دەوریان ئەوەستێت... سێیەم پیاو هەنگاوێك ئەنێت و رووناکییەکە ئەکەوێتە سەر هەردوو قاچی و قامچییەك بەدەستییەوە شۆڕ بۆتەوە... لە کاتی قسەکردندا دەنگی مۆسیقاکە نزم ئەکرێتەوە، بەڵام بەتەواوی ناوەستێ هەندێ: کاتیش بەپێی باری کرژو ئاڵۆزیی هەڵوێستەکان بەرز ئەبێتەوە).

لێکۆڵەری یەکەم: (لەلای چەپەوە ئەوەستێت) ئێوارەت باش دەروێش.

لێکۆڵەری دووەم: (لەلای ڕاستەوە ئەوەستێ و لەسەر یەك ئەژم پێیەکانی بە زەویدا ئەدا)

دەروێش: (سەری هەڵئەبرێ و سەیرێکی هەردووکیان ئەکات) جارێ... ئەگەر کەمێك مۆڵەتم بدەن، هەر تەنها کەمێ مۆڵەتم بدەن، ەوا چارێکی خۆم ئەکەم...

لێکۆڵەری دووەم: ئێوارەت باش دەروێش...

دەروێش: (رووی قسەی تێ ئەکات) تکات لێئەکەم گەورەم..

لێکۆڵەری یەکیەم: کاکە ئێمە هەر بۆ سەردانت هاتووین! ویستمان سەرێکت لێ بدەین!

دەروێش: هەر تەنها مۆڵەتێکی کورتم بدەنێ تا چارەیەکی خۆم بکەم، تکاتان لێ دەکەم گەورەکان، لەدوێنێ وە تائێستاش من هەر منم و خۆ نەگۆڕاوم.

لێکۆڵەری یەکەم: بەڵێ بەڵێ، ئێمەش تەواو دڵنیاین کەتۆ لەدوێنێوە لەوەوبەریش تۆ هەر تۆیت و نەگۆڕاوی.

دەروێش: (دەمی تەتەڵە ئەکات) من.. من مەبەستم ئەوەیە کەمن هەر منم و ئەویتر نیم.

لێکۆڵەری دووەم: ئەی گوایا بۆچی تۆ ئەو ئەبیت، نەك ئەویتر(بەبرادەرەکەی) بۆچی؟ وەڵامم بدەرەوە! دەی برادەر بۆچی ئەم پیاوە نابێت بەویتر!

دەروێش: (چاوەکانی لەنێوان هەردووکیاندا دەهێنێ و دەبا) تێئەگەم گەورەکانم تێئەگەم و ئەزانم ئەتانەوێت هەر بەڕاستی بزانن من کێم! دەی کەوابوو پێم بڵێن کەئەبێت من چی بکەم و چی بڵێم! من راستی ئەڵێم و هەر قسەی راستیشم پێکوتوون.

لێکۆڵەری یەکەم: کام قسەی راست؟ ئەوەکەی دوێنێ یان ئەوەکەی پێرێ؟

دەروێش: دەی باشە مۆڵەتێکم بدەن، کەمێك مۆڵەت.

لێکۆڵەری دووەم: (بەبرادەرەکەی) برادەر هەلێکی بدەرێ، لەوانەیە ئەم مەقاڵەمان خۆی بکات بەزەلامی سێیەم کەمام ناوەنجی بێت لەنێوان هەردوو زەلامەکەیتردا. ئاخر برادەری خۆشەویست توخوا لەهەموو

ژیانتدا قەت یەكێكی تری وەك ئەم پیاوەت بینیوە ئا بەم جۆرە لەزەت لە خۆگۆڕین و ناوگۆڕین وەربگرێت و بیشیكات بەخوو؟

دەروێش: دەی ئەگەر ئێوە ڕێگەم بدەن وا من ناوی خۆم باش ئەزانم، ئەوە سیی ساڵی رەبەقە من ئەو ناوەم پێوەیەو لەناو خەڵكیشدا هەر بەم ناوە ناسراوم و هەر ئەم ناوەشم بووە. گەورەكانم من ناوی خۆم زۆر بەباشی ئەزانم، هەرگیز جێی نەهێشتووم و بەجێم نەهێشتووە! ئاخر توخوا چۆن مرۆڤ واز لەناوی خۆی ئەهێنێ.

ئاخر كێ هەیە دەستبەرداری ناوی خۆی بێت و ناوێكیتر لە خۆی بنێت؟

لێكۆڵەری یەكەم: ئەی بۆ نەبێت، ئا ئا هەیە بۆنموونە خۆت رەنگە لەبیرت چووبێت.

لێكۆڵەری دووەم: بەڵێ وایەو لەبیری چووە، ئەی هەندێ جار پیاو نایەوێت كارێكی وا سەیرو بێ سەمەر بكات...؟

لێكۆڵەری دووەم: دەگوێ بگرە با من بۆت روون بكەمەوە، جاری وا هەیە زەلامێك تووشی زەلەیە یا شتێكی زۆر زەحمەت ئەبێت و بەرگەی ناگرێت، وەك هەڵەیەكی ناقولا، تاوانێكی گەورە، كارەساتێكی ناخۆش، یان با بڵێین كەیەكێكمان ئەكەوێتە ناو گێژاوێكەوە.

دەروێش: (ئەیەوێ لایەنگیری قسەكەی ئەو بكات و بەوجۆرە سۆزو رەحمی بۆ لای خۆی رابكێشێ)... گێژاو... لەوانەیە گەورەم، راستە... دەی ئێستاكە من لەناو گێژاودام.

لێكۆڵەری دووەم: نالێم...(هەردوو دەستی هەڵئەگلۆفێت) زۆر راستە، تۆ ئێستا لە گێژاودایت، دەی هەر ئەو گێژاوەشە بەو جۆرەت لێدەكات كەناوە راستییەكەی خۆتت لا ببێتە بەلا، بەڵكو هەروەك جۆرێك لەتاوان بێت، هەر لەبەرئەوەشە كەئەتەوێت هەرچی چۆنێك بێت لێی رزگار ببیت و لەكۆڵت بێتەوە..!

دەروێش: ئاخر خۆ من لەم ناوەی خۆم بەرپرسیارنیم، خۆ من خۆم هەڵم نەبژاردووە، بەڵكو لەباوكمەوە وەرمگرتووە! دەی ئەبێت گوناهی من چی بێت و بۆچی ئەبێت ئەو ناوە بۆ من ببێتە تاوان!

لێكۆڵەری یەكەم: (بەگاڵتەپێكردنەوە) لەبەرئەوەی لە سێ وشە پێكهاتووە: دەروێش عەبد ئەلرەحمان.

دەروێش: گەورەم.. ئەوە راستە لەسێ وشە پێكهاتووە... دەروێش عەبد ئەلرەحمان، بەڵام..

لێكۆڵەری یەكەم: وا گەڕاینەوە سەر "بەلامە لەعنەتییەكە" (بەتوڕەبوونەوە) بەسە ئیتر! تۆ دەروێش عەبدولرەحمانیت... كەوابوو تۆ بازرگانەكەی ناو قەیسەری وەسمان پاشایت لەگەڕەكی سەرشەقام خانووی ژمارە114-60دا ئەژیت، ئەو پیاوەیت كەدەمێكە لەگەڵ سیاسەت خەریكیت،نهێنگرو گەڕیدەی ناو شەوەزەنگ، تێكدەرو ئاژاوەچیت.

لێكۆڵەری دووەم: ئەم دەروێش عەبدولرەحمانە ئیشێكی كردووە ئیشێكی ترسناكی وا كەحەتمەن خاوەنەكەی بەلەناوبردن ئەدات، دوای ئەوەی دەستمان بەسەر ئەوپیلانە گەورەیەدا گرت، ئیشەكەی بوو بەمارەكەی شێخ هۆمەرو لەگەردنی ئاڵاو عەیشی لێ تاڵ كردو ئارامی لەبەر بڕی، لەبەرئەوەی ناشتوانێت خۆی لێ سەرفراز بكات و ناشتوانێت بیسڕێتەوە، وا ئێستا بەو پەلە پەلە بڕیاری داوە كە خۆی لە ناوەكەی بێ بەری بكات و خۆی لێ بدزێتەوەو ئیتر بەیەكجاری لێی رزگار ببێت وا ئەزانێت هەر تەنها ناوەكەیە بەو كارەترسناكە هەستاوە، بۆیە ئەیەوێت هەر دوكیان پێكەوە، ناوەكەو كارەكە بپێچرێنەوە و فڕێ بدرێن و ئیتر كێشەكە كۆتایی پێبهێنرێ و لەوكارە سەرفرازی ببێت...

دەروێش: ئاخر گەورەم كام كار؟ سوێند ئەخۆم...

لێكۆڵەری یەكەم: (لەتەنیشتییەوە دائەنیشێت) نا... نا دەروێش پێویست بەسوێندخواردن ناكات، حەزئەكەم ئەوەش بزانیت كەمن خۆم ئەمەوێت بڕواتە پێبكەمو...

دەروێش: (بەدڵخۆشییەوە هەڵئەداتێ و نایەڵێت قسەكە تەواو بكات): دەی بە قوربانت بم، كەوابوو رێگەم بدە با قسەت بۆ بكەم، گەورەم تكات لێ ئەكەم دان بەخۆتدا بگرەو گوێم لێبگرە، بەخوا هەوڵیش ئەدەم هەموو كات و ساتەكانم بەبیربێتەوە، تا بتوانم زۆر لەخۆم ئەكەم تا سەرجەم فلیمی ژیانم بهێنمەوە بەرچاوم و هەموو رووداوەكانی تێدا دەربكەوێ و پیشانتانی بدەم...!

لێكۆڵەری یەكەم: زۆر باشە! خۆ ئێمەش هەر وێڵی ئەوەین و ئەو راستییەمان ئەوێت. دەی بەباشی بیربكەرەوە هەموو شتێكی ژیانت بهێنەرەوە یاد.

لێكۆڵەری دووەم: ئافەرین دەروێش ئیتر ویژدانیشت ئاسوودە ئەكەیت و بەئارەزووی خۆت ئیعتراف ئەكەیت.

لێكۆڵەری یەكەم: (بەبرادەرەكەی) منیش باوەڕم هەر وایە(بەدەروێش) دەی زۆر لەسەرخۆ بیربكەرەوە ئەوسا ئیعتراف بكە، لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە ئیعتراف بكەیت، خۆ هەر بەوەش دەتوانیت یارمەتییەكی گەورەی ئێمە بدەیت ئیتر هەموولایەكیشمان لەم نەهامەتییە رزگار ئەبین، دوای ئەوەش شتێك نامێنێت كەوا لەتۆ بكات رقت لەئێمە بێت، بگرە هەر دەبینە هاوڕێ.

دەروێش: خۆ من هیچ رقم لەئێوە نییە، نا... نا خوا نەكات! جا بۆچی من رقم لەئێوە بێت! ئەوەی كردووتانە ئەركێكی سەرشان و وەزیفەی خۆتان بووە، منیش بڕواتان پێدە كەم و دەزانم كە گوناه گوناهی ئێوە نییە گوناهی ئەوەكەیترە، دیارە ئەبێت هەڵەیەك لەئارادابێت!

لێكۆڵەری یە كەم: چی؟ ئەوە باسی كام هەڵە دەكەیت؟ ئەی ئێمە لەسەر ئەوە رێك نەكەوتین كەتۆ ئەو دەروێش عەبدولرەحمانەی ناو فایلەكەیت؟ (دەست بۆ فایلەكە درێژ ئەكات).

دەروێش: راستە گەورەم لەسەر ئەوە رێك کەوتین، بەڵام تائێستا لەسەر ئەوە رێك نەکەوتووین کەمن... گەورەم! مەبەستم ئەوەیە کەبڵێم من ناتوانم لەسەر ئەوە رێك بکەوم و بڵێم من ئەوم.

لێکۆڵەری دووەم: (ئارامی لەبەر هەڵئەگیرێ) دیارە هیچ شتێك لەگەڵ ئەمەدا کەڵکی نییە! دیسان گەڕایەوە سەر تەڵەکەبازییەکانی.

لێکۆڵەری یەکەم: (دەست بەدەستدا ئەکێشێ) چاوتان لێیە چۆن، چۆنی بایدایەوە سەر فرۆفێڵەکانی. (بیر ئەکاتەوە) لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەبێت بەزەییەکمان پێیدا بێتەوە(بەدەروێش) دەروێش گوێ بگرە! با ئیتر لەسەرخۆو بێهەرەشەو گورەشە قسە بکەین، هەروەك هەڤاڵی یەکتر لەیەك بگەین.

دەروێش: گەورەم ئێوە چۆنتان ئەوێت من ئامادەم..

لێکۆڵەری دووەم: بەڵام تۆ ئەڵێیت من ئەو نیم، ئیتر ئامادەی چیت!؟

لێکۆڵەری یەکەم: (قسە بەبرادەرەکەی ئەبڕێت و بەهێمنییەکەوە دەست بۆ دەروێش درێژ ئەکات):

نا.. نا دەروێش نەیگوتووە من ئەونیم خۆ ئەگەر ئەوەشی گوتبێت ئەوە وا ناگەیەنێت کە ئەگەر بیری کەوتەوە نەڵێت من ئەوم... من بێگومانم هەر کەبیری کەوتەوە خێرا دانی پێدائەنێت کەخۆیەتی، ئیتر دەڵێی چی ئیشەکەی ئێمە ئاوهاییە هەموو ئەوانەی لێکۆڵینەوەمان لەگەڵ کردوون و ئەو پرسیارەمان لێکردوون لەسەرەتادا، ئەیانگوت ئێمە ئەوان نین کەچی لەدواییدا دانیان بەراستیدا ئەناو هاتنە ژێر بارو ئەیانگوت ئەوانین. جا مەسەلەکە هەمووی مەسەلەی کاتە، بەڵام بۆ ئێستاو ئەم حاڵەتەی دەروێش، بەپێی زۆری کارەکانمان و بەرژەوەندی گشتی ئێمە کەمێك پەلەمانەو وەختمان بەدەستەوە نەماوە، وا بزانم دەروێش خۆشی لەوە ئەگات، ئەی چۆن تێی‌ناگات، ئەی خۆی یەکێك نییە لەئێمە!

بگرە هاونیشتمانییەکە وەك ئێمەو وەك ئێمەش بەرژەوەندی گشتی رەچاو دەکات، بۆیە بێ سستی نواندن و زۆر بەئازادیی ئیعترافی خۆی ئەکات، ناشمەوێت بیری بخەمەوە کە ئەگەر بەئازادی و بێ گوشار ئیعتراف نەکات، چی لێ بەسەردێت، من بڕوام وایە کە زۆر بەئازادی و بەخواست و ئارەزووی خۆی ئیعتراف ئەکات! ئەی توخوا وانییە دەروێش؟ دەی کەواتە با دەست پێبکەین دەی بەئازادی قسەی خۆت بکە دەی با لەدەمی خۆتەوەو بەدەنگی خۆت گوێم لە ئیعترافەکانت بێت، چونکە هەر بەراستی ویژدانم قبووڵی ئەوە ناکات کەئیعترافێك لەدەمی خاوەنەکەیەوە بەهەردوو گوێچکەی خۆم(دەست بۆ گوێچکەکانی درێژ ئەکات) نەیبیستم بڕوای پێبکەم! دە توخوا تۆش بڕوات بەوە نییە کاکە دەروێش؟

دەروێش: من... من بڕوام بەهیچ نییە، بڕوام پێبکە من بڕوام بەهیچ شتێك نییە، هەرگیز رێگەش بەخۆم نادەم کەهیچ یەکێك لەئێوە بەرپرسیار بکەم لەوەی رووی داوە... ئەبێت یەکێك تاوانێکی گەورەی وەك ئەم تاوانەی کردبێت خۆ ئەم جیهانە پڕیتی لەوجۆرە تاوانە نەفرەت لێکراوانە، بەڵام ئەگەر ئێوە تاوێك گوێم لێبگرن، هەر تەنها بۆ یەك سات وا راستییەکانتان بۆ دەرئەکەوێت، هەر بۆ نموونە دەبا باسێکی منداڵەکان بکەین، من بەتەواوی منداڵەکانی خۆم ئەناسم، باشە ئەگونجێت من گومان لەوە بکەم گەورەم؟ دە توخوا خۆت بڵێ، ئایا ئەگونجێت باوك منداڵەکانی خۆی نەناسێت، یان تێکەڵیان بکاو ناوو ژمارەیانی لا روون نەبێت! چوار منداڵەکەم، گەورەم من چوار منداڵم هەن نەك سیان، چوارن... چوار، چوار پارچەن لەجگەرم... رێگەم بدە گەورەم با ئیعتراف لەسەر ئەو راستییەشت بۆ بکەم، لەناو هەرچوار جگەرگۆشەکانمدا بچکۆلەکەیانم خۆشتر ئەوێ خۆشەویستی ئەویان مەزنترینە... دەی توخوا ئێوە پێم بڵێن چۆن...

لێکۆڵەری یەکەم: (قسەکەی پێ ئەبڕێت) بچکۆلە کەیان؟ (بەسەرسووڕمانێکەوە) ئەوە کام بچکۆلەیەیە دەروێش؟ خۆ من هەر ئێستا گوتم بڕوات پێدەکەم، کەچی وا دووبارە گەڕایتەوە سەر قەوانە کۆنەکە، ئەری ئەوە تۆ مێشکت دارە، بەردە، چییە، وا وڕێنە ئەکەیت و لەخۆتەوە ئەڵێیت چوارن... چوار ئینجا...

لێکۆڵەری دووەم: دەی باشە تۆ بۆم روون ناکەیتەوە بزانم ئەم بچکۆلەیەت لەکوێوە هێناوە؟ دەی بڵێ بزانم لەکوێوە؟

دەروێش: گەورەم ئەوە کچمە... کچم!

لێکۆڵەری یەکەم: ئاخخ لەدەست ئەم دەروێشە، دەی بۆ ئەوەی لەم بەزمەش قورتار بێت، بابڵێین تۆ ئاواتت ئەوەبوو یەزدان کیژێکی ژیکەڵەت بداتێو ماڵەکەت ئاوەدان بکاتەوە، دەی ناهەقیشت نییە، چونکە کیژۆڵە خنجیلەکان هەمیشە بەزۆرو خۆشەویستن، بەسۆزو ژیکەڵەترن لەکوڕ، بۆیە ناهەقت نییە بەو ئاواتەوە لە گینگڵداندا بیت.. دەی وا بەمجۆرە ئەم لاپەرەیەشمان هەڵدایەوە... (بەدەنگێکی پڕ لەهەڕەشەوە) دەروێش! ئەی ئەو لاپەرەیەشمان هەڵنەدایەوە...؟

دەروێش: (بەملکەچی و ناچارییەوە بۆ دواجار هەوڵ ئەدات): وا بوو گەورەم وابوو... بەڵام .... بەڵام ئەی کچە بچکۆلەکەیان...؟

لێکۆڵەری یەکەم: ئاخر هەڤاڵ دەروێش تۆ ئێستاش ئەوە بەنەقڵتا ناچێت کە ئەو ئاواتەت خەیاڵێك بوو خەیاڵ، ئاواتێك بوو بەڵام نەهاتە دی...!

دەروێش: ئاخر قوربان ئەوە راستییەکەو هەیەو ئەژی..

لێکۆڵەری دووەم: (بەقاچی پاڵی پێوە ئەنێ) ئاخر کام راستی دەروێش...؟

لێکۆڵەری یەکەم: (بەبرادەرەکەی) نا.. نا تورە مەبە، رێگە مەدە تورەبوون لێت نزیك بکەوێتەوە، با کەمێکیتر چاوەڕوان

بین(بەدەروێش) وا دیارە ئێستاکەش باش لەوە نەگەیشتوویت، وا ئێستا خۆم حاڵیت ئەکەم... خەڵکی وا هەیە هەندێ جار وا ئەزانێ ئاواتەکەی خەریکە بێتە دی، چونکە هەمیشە بیری لێ دەکاتەوەو لەگەڵیدا ئەژیو لەناویدا ئەخەوێ، کەچی لەڕاستیدا ئاواتەکە هەروەك ئاوات ئەمێنێتەوە، بەڵکو هەندێ جار ئەوە هەر خەیاڵ و خەوەو هیچی‌تر، ئەوەتا دەروێش یەکێك لەو کەسانەیە کە تائێستاش لەناو ئەو خەیاڵ و خەوەدا ئەژی.

لێکۆڵەری دووەم: خۆ لەوانەشە ئەوە ڕاستییەك بووبێت لەمێشکتداو ئیتر هێندە ئەمسەر وئەوسەرت بەخەوەکە کردووە بیرت لێکردۆتەوە، تا ئەو ئاستە کەخەریك بووە خەوەکەت لێ ببێتە ڕاستییەك، کەچی خەوەکە هەر بەخەو ماوەتەوەو هیچی‌تر.. لەبەرئەوە گوێی مەدەرێ و هەر خەفەتیشی پێ مەخۆ. ئەوەش چیرۆکی بچکۆلەکە. کەوابوو با باسی ئەو بچکۆلەیەش لەبیر خۆمان ببەینەوە. کێش دەڵێت لەپاشەڕۆژدا خەوەکەت نایەتە دی.

دەروێش: (چاوی لەنێوان هەردوو پیاوەکەدا ئەهێنێ و ئەبا، سەرسووڕماوو ڕووخاو) بەڵێ... بەڵێ با وابکەین (هەروەك قسە لەگەڵ خۆی بکات) چوار (بەپەنجە ژمارەیان ئەکات و لەژێر لێوەوە قسە ئەکات بەبێ‌ئەوەی کەس لێی تێ بگات).

لێکۆڵەری یەکەم: کەوابوو با بڵێین منداڵەکان سیانن دەی دەروێش ئینجا بیهێنە بەر چاوت سێ منداڵی خۆشەویست لەناکاو پێی‌ئەزانن کەباوکیان بزربووە، ڕۆیشت و ئیتر نەگەڕایەوە، ئا لەوساتە ناهەمووارەوە ئەو منداڵە بەسزمانە بێدەرەتانانە وێڵ و سەرگەردان ئەبن. لانەیان لێ تێك ئەچێت و سەریان لێ ئەشێوێت، لەماڵەکەیاندا دێن و دەچن،سەرگەردان و وێڵی باوکیان ئەبنو ئەم ژوورو ئەو ژووری بۆ دەکەن، بەواق ورماوی سەیری هەموولایەك ئەکەن و نایبیننەوە...

لێکۆڵەری دووەم: کەهاناش ئەبەنە بەر دایکیان و یەك لەدوای یەك لێی ئەپرسن: دایە گیان! ئەوە باوکم لەکوێیە؟ دایکی سەرلێشێواویش مات و مەلوول، کزۆڵەو بێدەرەتان فرمێسکی گەرم لەچاوانیدا قەتیس ئەبێ و توانای وەڵامدانەوەی نامێنێ و نازانێ چۆن دڵی دڵشکاوەکان بداتەوە.

لێکۆڵەری یەکەم: کاتێکیش منداڵە بەسزمانەکان سەرنجی حاڵی پەشێوو ڕووخساری پڕ لەخەم و ئەسرینی گەشی قەتیسماو ئەکەن، زیاتر پڕ لەخەم و ژاکاوترئەبن و هەمووان بەجارێك بارانی ئەشك ئەڕێژنە سەر فرمێسکی دایکیان.

لێکۆڵەری دووەم: دەی دەروێش بڕوانەو بزانەو تۆ چی کارەساتێکت خوڵقاندووە چۆن هێلانەی ئەوساوا ناسکانەت ڕماندووە دەروێش! ڕەنگە تۆ وابزانیت لەم جیهانەدا شتێکی‌تری وا هەیە کەبۆشایی باوکێکی بەسۆزی ونبوو پڕبکاتەوە! بەتایبەتی ئەگەر دڵێکی گەورەو پڕ لەسۆزی خۆشەویستی وەك دڵی تۆی هەبێت...!

دەروێش: (بەتەواوی ئەژاکێو دەستی خۆی ئەگوشێ و بەئاخ وداخەوە): ئای بۆ منداڵە خۆشەویستەکانم، داخ و سەد داخ بۆ منداڵە لانە لێتێکچووەکانم، توخوا ئەبێت ئێستاکە حاڵیان چۆن بێت!

لێکۆڵەری دووەم: (بەدەنگێکی پڕ لەخۆباییبوون و دڵنیایی‌یەوە) گەورەکەیان، کاکە دەروێش حەوت ساڵە(ددان بەقسەکانیدا ئەنێ) هەڤاڵ.. ئا ئەرێ دەروێش ناوی هەڤاڵ نییە؟

دەروێش: (بەئەبلەق بوونەوە) هەڤاڵ!

لێکۆڵەری یەکەم: کورە ناونجێکەشیان ناوی ئاواتە (وای دەرئەخات کەدەیەوێت بیری بکەوێتەوەو لەناوەکەی دڵنیا ببێ نا.. نا... نا ناوی هیوایە.

لێکۆڵەری دووەم: بەڵام بچکۆلەکەیان، خۆشەویسترینیان کە لەناو دڵو دەروون و هەموو دەمارەکانی لەشدا جێگەی خۆی کردۆتەوەو هەرگیز لەبیرناچێتەوە، ناوی سەرکەوتە.

دەروێش: (بەسەری خۆیدا ئەکێشێ) ئەی هاوار فریام کەون، خۆ نازانم داد بۆ کێ بەرم! ئاخر بەچیتان بڕوایە وانییە، هیچ ناویکیان ڕاست نییە، تەنها ناوێکیشیان ڕاست نییە!

لێکۆڵەری یەکەم: (بەهەڕەشەوە) ئەوە ئەڵێیت چی؟ ئەڵێیت وانییە؟ (پیاوی سێیەم قامچییەکەی ڕائەوەشێنێ و خێرا خێرا بەپۆستاڵەکەیدا ئەکێشێ)...

دەروێش: (چاوی بڕیوەتە جۆری ڕاوەشاندنی قامچییەکە) من گوتم.. ئەڵێم گوتم..

لێکۆڵەری یەکەم: گوتت چی؟ دەی خێراکە و بڵێ بزانم گوتت چی؟

لێکۆڵەری دووەم: (بەهەڕەشەو گوڕەشەوە) ئەرێ دەروێش! ئەوە تۆ ئاگات لەخۆتە چی ئەڵێیت! کورە ئاگاداربە هاااا...ئاگادار..

لێکۆڵەری یەکەم: دەی دەبا بزانین چی ئەڵێیت؟ ئەرێ منداڵەکان سیان نین؟

دەروێش: (بەبێ‌ورەو کەساسییەکەوە، چاویشی هەر لە قامچییەکەیە) بەڵی سیانن..

لێکۆڵەری یەکەم: ئێ ... زۆرباشە... کورە دە قسە بکە قسە، خۆ ئەڵێی زمانت لەدەما نەماوە، دەوا بڵێ، ئەوا ئێستاکە بەرەو ئەوە ئەچین کە بگەینە ئەنجامی ڕاستی کەوابوو منداڵەکان سیانن...

لێکۆڵەری دووەم: هەڤاڵ و هیواو...

دەروێش: (بەپاڕانەوە) دەی توخوا هیچ نەبێت با بەکێکیان بەناوەکەی خۆیەوە بێت، تکاتان لێ ئەکەم با تەنها یەکێکیان بەناوە ڕاستییەکەی خۆیەوە بێت، با ناوە ڕاستییەکەی پێوەبمێنێت!!

لێکۆڵەری یەکەم: کورە ئەوە تۆ وڕێنە ئەکەیت! یان خەڵەفاویت! دیسان گەڕایتەوە سەر تەڵەکەبازییەکەت.

دەروێش: (ڕووی قسەی ئەکاتەلێکۆڵەری یەکەم) ئاخر گەورەم ئێوە

چۆنتان ئەوێت با وابێت، چیتان ئەوێ وا ئەکەم، بامنداڵەکان سیان بن، بەڵام تەنها یەك شتم لەئێوە ئەوێت، ئەویش تەنها بایەکێکیان، هەر یەکێکیان ناوەکەی خۆی پێوە بمێنێتەوە، تاتوانای ئەوەم هەبێت کەخۆم بەپێوە بگرم، تا سەرم توانای خۆگرتنی بەسەر ملمەوە بمێنێت(دەست بۆ ملی ئەبات) گەورەکانم! من ئەمەوێ تەنها راستیتان بۆ روون بکەمەوە دە ساتێك گوێم لێ بگرن و تەنها یەك وشەم بەراستی لێوەربگرن تا بتوانم خۆم بەسەر پێوە بگرم...

(قامچی بەدەست لێی نزیك ئەبێتەوەو قامچییەکە بەرانیدا ئەماڵێت، دەروێش دێتەوە سەرخۆی و هۆشیار ئەبێتەوە...)

لێکۆڵەری یەکەم: باشە، خۆ ئێمەش هەروەك تۆ ئەمانەوێت خۆت بەسەر پێوە بگریت تا بەوشیارییەوە ئیعترافەکەت بکەیت، بەتایبەتی ئەگەر پیاو تەواو هوشیار نەبێت ئەوا نەئیعترافەکەی بەتەواوی ئەبێت نەقسەکانیشی جێگەی بڕوا ئەبن، کەوابوو هۆشیاری زۆر زۆر گرنگە.

دەروێش: بەڵام من تێ ناگەم مەبەستتان لەو هۆشیارییە چییە؟ نازانم ئێوە ئەتانەوێ چۆن چۆنی من هۆشیاربم!! چۆن ئەتوانم هۆشیارییم لەکەللەدا بمێنێ و هۆشم لەسەر خۆم بێت، ئەگەر ئێوە یەکەیەکەی داوی بیرەکانم بپچڕێنن و تەنها یەك داویشم بۆ نەهێڵنەوە کەدەستی پێوە بگرم و بتوانم بەهۆیەوە خۆم لەسەر زەوی بگرم (پیاوەکە زیاتر نزیك ئەبێتەوە) بەڵێ.. سیان(نزیکتر ئەبێتەوە تا پێڵاوەکانی بەدەروێشەوە ئەنووسێنێ، دەروێشیش زەق زەق ئەروانێتە جووڵەی قامچییەکە) من دەروێش عەبدولرحمانم، ماڵم... دەی خوایە ئەبێت بڵێم لەکوێیە، ئا ...ئا لەگەڕەکی سەرشەقامەو خانووی ژمارە114-60 رۆژێك لە رۆژان سیاسەتم نەکردووە(خێرا پاشگەز ئەبێتەوە) نا... نا بیبورن، جارێکیان کردم... با... با شتێکی وام لەبیرە، هەر بەراستی ئەو لایەنەی ژیانم لەبیر چووبووەوە، بەڵام وا ئێستاکە دێتەوە بیرم...

لێکۆڵەری یەکەم: ئافەرین دەروێش، ئائێستاکە بەدڵی منی... (کەمێك بێدەنگی) هەر زۆرباشە. ئێ کورم دوای ئەوە؟ ئەی دەورت لەپیلانەکەدا چی بوو؟

دەروێش: پیلان؟

لێکۆڵەری یەکەم: بەڵێ پیلانەکە!

دەروێش: بەڵام من...! گەورەم توخوا پرسیارەکە چی بوو!؟

لێکۆڵەری یەکەم: (بەقاڵسییەکەوە) دەربارەی رۆڵت بوو لەپیلانەکەدا..

دەروێش: بەڵێ بەڵێ! (گوێی لەدەنگی قامچییەکە ئەبێت) تێیگەیشتم دەوری من(ئەوەستێ)، بەڵام دەنگی قامچییەکە هەر بەردەوامە) دەوری من، دەورێکی ئەوتۆ نەبوو.

پیاوی سێیەم: (بەتوندی قامچییەکە رائەوەشێنێت)

لێکۆڵەری یەکەم: با دەورێکی زۆر گرنگ و ترسناك بوو.

دەروێش: دەی با وابێت، یەعنی گەورەم تۆ چۆن ئەڵێیت هەروایە، رۆڵێکی زۆر ترسناك بوو، دیارە یەکێك هانی منی داو تووشی کردم.

لێکۆڵەری دووەم: ئەوکەسە کێیە؟

دەروێش: ها... ئەوکەسە، ها، رەنگە برادەرە کۆنەکەم بێت، ئا... ئا برادەرەکەی قوتابخانەم. (خۆی وا نیشان ئەدات ناوەکەی بیر بکەوێتەوە) ئا... ئا جەمال، بەڵێ ناوی جەمال بوو.

لێکۆڵەری یەکەم: کام جەمال، ناوی تەواوەتی بڵێ، ئەرێ ئەوە جەمال قەراخی نییە؟

دەروێش: (بەترسەوە) بەڵێ خۆیەتی گەورەم، خۆیەتی گەورەم ئەو قورمساغە بوو هانیدام و خۆم تووشی ئەم داوە کرد. ئەو رۆڵەکەی بۆ دانام، رۆڵێکی زۆر گرنگ و خەتەر بوو، من نهێنگری هەموو کۆمەڵەکە بووم، هەموو نهێنییەکان لای من کۆئەبوونەوە... بەڵام ئامانجەکە چی بوو؟ دەی خوایە گیان بێتەوە بیرم..ئا... بەڵێ... بەڵێ کەوتەوە بیرم، ئامانجەکەمان رووخاندنی رژێم بوو. بەڵێ کۆمەڵێکی چەپڕەوی شۆڕشگێڕ نەخشەی دانابوو هەمووشتێك تێك وپێك بدرێ و ئەم جیهانە سەرەوژێر بکات و باری ئاسایی و خواکرد لەیەك بترازێنێ، چینی رەشوڕووت و هەرچی و پەرچی بخاتە شوێنی گەورەپیاوان و دەوڵەمەند.

لێکۆڵەری دووەم: بەڵکو هەر دەیویست دەستکاری کاری یەزدان بکات و ئەوەی هەر لەسەرەتای خووڵقانی مرۆڤەوە خواوەندی مەزن دایناوە، تێکوپێکی بدات، چاکەو خواپەرستی خێروخۆشی، خووڕەوشت و کرداری باش، هەمووی لەناو بەرن!

دەروێش: (تائێستاش چاوی بڕیوەتە جووڵەی قامچییەکە) بەڵێ ..بەڵێ گەورەم کۆمەڵێك گەنجی ئاژاوەچی و نۆکەر، فەرمانیان وەرگرت کەسیستەمی جیهان هەڵبگێڕنەوە، خوای مەزن خۆبەخت ئەم جیهانەی ئاوا دروستکردووە، گەورەو دەوڵەمەند هەر گەورەبوون، چونکە خوا خۆی وای ویستووە، رەشوڕووتیش هەر رەشوڕووت بوون، کەچی گەنجە ئاژاوەچییەکان، خورمای بابیان دەرخوارد دەدراو کەوتنە خولیای هەڵتەکانی سیستەمی دادپەروەرانەی جیهان، ویستیان گەورەپیاوو بەشان وشەوکەتەکان کەنار بخەن و ماڵومولك و نازونیعمەتیان زەوت بکەن و رەشوڕووتی پێ تێروتەسەل بکەن، واتە ئەوەی لەسەرەوەیە تووڕی بدەنە خوارێ و ئەوی لەژێرەوەیە سەریبخەنە سەرەوە، منیش... دەی بڵێم چی... ئیتر هەڵخلیسکام و تووشی ئەم چارەڕەشییە بووم و بوومە مایەی دروستکردنی ئەم فیتنەیە.

لێکۆڵەری دووەم: هەڵخلیسکانی چی دەروێش؟ تۆ بۆخۆت دانەری نەخشەی پیلانەکەو جێبەجێکەریشی بوویت، ئەی نهێنگر مانای چی؟ دەی پێم بڵێ و بۆم روونبکەرەوە بزانم نهێنگر مانای چییە!

دەروێش: بەڵێ! بەڵێ! هەروابوو، بەڵام من ئەمەوێ بزانم لەبەرچی هۆیەك بوو بێت گەورەم؟

لێکۆڵەری دووەم: دە سەیری ئەم قەشمەرەکەن! لەیەکێك وایە ئێمەشی لەگەڵ بووین! ئەوە هەر خۆت ئەزانیت خۆت، هەر خۆت باشی لێ دەزانیت، دەی خۆت گێل مەکەو بیڵێ.

دەروێش: بەڵام نازانم بۆچی (بەپاشگەزبوونێکی ترساوییەوە) مەبەستم ئەوەیە کەئێستا نایەتەوە بیرم.

لێکۆڵەری یەکەم: دەی لەسەرخۆ بیربکەرەوە، حەزم ئەکرد زیاتر ماوەمان بدایتایە، چونکە لەم جۆرە کارە هەستیارانەدا لەسەرخۆبیر کردنەوە زۆر گرنگە، بەڵام بەداخەوە، ئێمە ئەمجارە پەلەمانەو ناتوانین زۆر چاوەڕوان بین، بۆیە ئەبێت لێمان ببوریت!

لێکۆڵەری دووەم: گوێت لێبوو دەروێش؟ ئێمە پەلەمانەو ناتوانین لەوە زیاتر بوەستین، ئیتر بەسێتی و پەلە بکەو باش بیربکەرەوە با زوو بێتەوە بیرت! (بەتوڕەییەوە) بەسە ئیتر لەتاقەت و حەوسەڵەماندا نەما، پشوو بەخۆت بدەو با ئێمەش لەوەزیاتر هیلاك نەکەیت.

دەروێش: فەرمانی تۆیە گەورەم، ئەبێ نەیەڵم جەنابتان لەوە زیاتر ماندوو بن، هەر بەڕاستی وەك من پێویستتان بەحەسانەوەیەکی زۆرە، بەڵێ من حەسانەوەو دڵنیایی ئێوەم مەبەستە، بەڵام نازانم.. من(خێرا پاشگەزنەبێتەوە) مەبەستم ئەوەیە کەمن ئەو هۆیەم بیر ناکەوێتەوە! ئەگەر بفەرمووێت و یارمەتییەکم بدەیت و هەر تەنها سووچێکم بۆ دەربخەیت، هەر سەرەداوەکەم بدەیتە دەست(بەپاڕانەوەوە) گەورەم بەخوا ئیتر بەوردەکارییەکانەوە خۆم بۆتان تەواو ئەکەم. بیکەن بۆ ڕەزای خوا و سەریشم لەڕێتاندایەو هەر ئەو یارمەتییەم بدەن گەورەم دە توخوا سەرفرازم بکەن و خۆت پێم بڵێ لەبەر چ هۆیەك بوو! ئاخر..

لێکۆڵەری دووەم: (قسەکەی پێ ئەبڕێت کوڕە ئەوە تۆ گێلیت یان خۆت گەوج ئەکەیت! ئاخر ئەوە پرسیارو داوایە تۆ لەمنی ئەکەیت)؟

دەروێش: گەورەم خۆ خۆت هەموو چیرۆکەکە باش ئەزانیت، هەر لەسەرەتاوە تا کۆتاییەکەی لای خۆتانە، بەخوا ئێوە هیچ شتێکتان لێ بزر نییەو هەمووی ئەزانن.

لێکۆڵەری دووەم: (بەهەڕەشەوە) بەڵێ.. بەڵێ.. ئەتانەوێ سەرجەم یاساو سستێم ئاوەدانیی وڵاتەکەمان هەڵبتەکێنن و ئینجا گەجەروگوجەرو ڕەش وڕووت دەسەڵات وەربگرن، کەچی هەروا بەئاسانی ئەتەوێت بەنازانمێ، یان بەبیرم ناکەوێتەوەیەك، خۆتی لێ قورتار بکەیت! دەی بڵێ خۆت بیڵێ و بزانین لەبەرچی بوو وا پیلانگێڕان هەموو نهێنییەکانیان بەتۆ سپارد!

دەروێش: سا بەچیتان بڕوایە نایزانم.

لێکۆڵەری یەکەم: (بەهەڕەشەوە) کوڕە دەروێش!

لێکۆڵەری دووەم: (بەهەڕەشەوە) دیسان گەڕایتەوە سەر فرتوفێڵەکان (ڕووی تێدەکات) دیارە ناتەوێ قسەبکەی و ڕاستییەکە بڵێیت؟ دەروێش! خۆ خۆت باش ئەزانی کەئێمە هەمووشتێکمان لایەو هیچمان لێ ون نابێت، چۆن وشیاری پارێزەرانی دڵسۆز بەنیشتمان بەمەلاسدراوی لەناو پیلانەکەدا دەریانهێنایت، هەر بەوجۆرەش هەموو ڕاستییەکان لەناو مێشك و دڵتا دەرئەهێنین!

دەروێش: لەوانەیە گەورەم، خۆتان باشتر لەمەسەلەکە ئەزانن، من هەر لەگەڵ ماڵومنداڵ و ئیشوکاری خۆم خەریك بووم.

لێکۆڵەری دووەم: ئەی فێڵبازی ساختەچی وا دەرکەوت کەتۆ چ دڕندەیەك بوویت، ماڵ ومنداڵی چیو ئیشیچی! تۆ باسی شتێکمان بۆ بکە کەبڕوات پێبکەین.

دەروێش: بەڵێ باشە گەورەم دەی با باسی ئەوشتە بکەین... بەڵام هەر ئەوەندەش یارمەتیم بدەن کەئاگاداری خۆم ببم و ئەوی ئێوە ئەتانەوێت هەر ئەوە بڵێم، هەر ئەوەندە یارمەتیم بدەن کەهۆشم لای خۆم بێت و بتوانم خۆم بگرم و دەمم گۆ بکات.

لێکۆڵەری یەکەم: (هەڵئەستێ) زۆر باشە، کەوابوو ئێستاکە ئیشی ئێمە پەیداکردنی هۆش و گۆشە بۆ ئەم پیاوە تا بتوانێت خۆی ڕابگرێت، (بەپیاوی سێیەم) دەی دەمێکە ئەم زەلامە مردووی هۆشیاری خۆشە، کەوابوو هەر ئێستاکە ئەیکەیت بەو پیاوە مەعقولەی کەخۆی ئەیەوێت. دەی(ئەقیڕێنێ) دەی خێراکەو بیخەرەوە ناو پێستەکەی خۆی تا لەم سەریەشەیە ڕزگارمان ببێت.

پیاوی سێیەم: (قامچییەکە بەبەری دەستیدا دەکێشێت) بەڵێ گەورەم ئێستا چاوی بەخۆی ئەکەوێ.

دەروێش: (خۆی گرموڵە ئەکات و بەخاوەن دەنگەکە) ئەزانم.. ئەزانم بڕیارەو هەر ئەبێت بچمە پێستەکەیەوە ئەچم.. ئەچم..

لێکۆڵەری دووەم: یانی ئەچیتەوە ناو پیستەکەی خۆت.

دەروێش: ئەچم.. ئەچم گەورەم، بۆ ئەوان دەست لەخۆم هەڵئەگرم... بۆ ئەوی ترو ژن و مناڵەکانی، بەچیتان ئەوێ ئەبم، ئەبم بەلەشێك لەتەختە، بەبیچمێکی ساختەو بۆش و بێ مانا، ئەبم بەتارمایی، بەسێبەر بەڵام توخوا گەورەم ئەگەر ئەگەر ویژدانم لێی پرسیم و گوتی: دەروێش! ئەگەر قایل بیت بەوەی پێی ڕازی بوویتو ئایا دەتوانیت بەوە چاوی ساوا نەناسراوەکان تیفوو بکەیت و پێشوازیت لێبکات و باوەشی خۆشەویستیت بۆ بکاتەوەو پەنجەکانی یاری لەسەر پشتە تەزاوییەکەت بکەن؟ ئینجا ئەگەر تۆش بەوە قایل ببیت، ئایا خەڵکیتر ئامادەن واز لەدڵ و گیانی خۆیان بێنن بۆ تۆ؟

لێکۆڵەری دووەم: (ئەنەڕێنی) بەسە... بەس ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ (بەبرادەرەکەی) چەند ساختەچی و تەڵەکەبازە، ئەیەوێ بەوڕێنەو تەمسیل خەریکمان بکات.. لەبری

ئیعتراف تەمسیلمان بۆ ئەکا(بەدەرویش) قسە بکە کێن ئەوانەی باست کردن؟

دەرویش: قوربان، ژن و منداڵەکان، ئەوانەی خۆتان ناوتان هێنان، گەورەم! ئەتانەوێت لەدەروازەی دەرگاوە هاواریان لێبکەم و بڵێم: ئێوە ئەی منداڵە خۆشەویستەکان، ئەی وردیلە بێ باوکەکان! تۆ ژنە ژیرەکە! ئەی قەشەنگە بێمێردەکە، باوک و مێردتان ئەوێ؟ دەی ئا ئەمەتا وا ئەم پیاوە ئامادەکراوەتان پێشکەش ئەکرێ، دەی منداڵان ئێوەش بیکەن بەباوکی خۆتان، تا زووە لەدەوری کۆببنەوە، تۆش ئافرەتە دڵ شکاوەکە. دڵی بدەرێ و ماچ بەڕوویدا ببارێنە هەمووتان بانگی بکەن و بەناوی خۆیەوە هاواری لێبکەن، شوێنەواری ماچی باوکە ونبووکەتانی نیشان بدەن، فێری بکەن چۆن چۆنی یاری لەناو هێلانەی قژەکانتانا بکا، فێری بکەن چۆن یاری لەسەر سنگو پشتی بکەن چۆن قاقای خۆشەویستی و بزەی سۆزتان بۆ ببارێنێ و چۆن یاری و گاڵتەوگەپتان لەگەڵ بکات.. دەی تۆش ئافرەتەکە! بچۆرە تەنیشتییەوەو بە گوێی ئەم پیاوە نەدیوەدا بچرپێنەو بۆی باس بکە چۆن مێردە ئاوارەکەت دەستی ئەکردە ملان و هەڵی ئەگلۆفیت و لێوی لەکام جێگەی سنگ و رووخسارتدا یاری ئەکرد، ئیوە ئەی منداڵە ساواکان دەی فریای بکەون و رێگەی نیشان بدەن، دەی تۆش ئەی ئافرەتە ژیرەکە، لەبەرئەوەی ئەم پیاوە نەناسراوە وازی لەناوو ماڵو منداڵی خۆی هێناوەو بووە بەمرۆڤێکی‌تر، چۆن پێتان رازییە دەی ئێوەش پێی رازیبن (بەهەردوو بەری دەستەکانی دەموچاوی دائەپۆشێ و بەدڵێکی پڕ لەحەسرەتەوە) ئینجا ئەگەر ئەم پیاوە نەناسراوە کەساسە پێتان قایل بوو ئێوەش بەو قایل ئەبن و سۆزی دڵتان بۆی ئەجولێ.. دەی پێم بڵێن.. دە تو یەزدان ئەگەر پێم نەڵێن (دەست ئەکات بەگریان)

لێکۆڵەری یەکەم: (خۆی وەرئەچەرخێنێ و وانیشان ئەدات کەئەیەوێت بڕوات): نەخێر هیچ شتیك لەگەڵ ئەمەدا كەڵكی نییە، باشە دەرویش وا دیارە قسەی خۆش و رێزگرتنیش هەر بێسوودە.

لێکۆڵەری دووەم: (ئەمیش هەروای دەرئەخات کەئەڕوات) نەخێر کەڵکی چی.. ئەبوو هەر یەکەم جار رەوانەی ساردا وەکەمان بکردایەتەوە(ئاور لەدەرویش ئەداتەوە) دەرویش دیارە هیچ شتێك لەگەڵ تۆ کەڵکی نییە. کەوابوو بیبەن. دەی هەرئێستاکە بیبەن بۆ سارداوەکە، دیارە زۆری حەزلێیە.

دەرویش: (لەشوێنەکەی خۆیەوە قەڵەمبازێك ئەدات بۆ لایان دامێنی چاکەتی لێکۆڵەری یەکەم ئەگرێت).

نا.. نا گەورەم بیکەنە رای خوا مەمنێرن، بەرگەی هیچ ناگرم.

لێکۆڵەری یەکەم: (پیاوی سێیەم) بیبەن. (باشتر ددان بەقسەکانیدا ئەنێت دەی هەر ئێستاکە بیبەن بۆ سارداوەکە با ئیتر قەیری عافێت بزانێت.

دەرویش: (بەسەر هەردوو ئەژنۆیدا دەکەوێت و تائێستاش لای چاکەتەکەی بەدەستەوەیە). گەورەم دەی بیکە بۆ خاتری یەزدان (بەلێکۆڵەری دووەم) گەورەم تۆش بەزەییەکت بەحاڵمدا بێتەوە باوکم من ئەوم، من پیاوەکەم من دەرویش عەبدولرەحمانم، سەرم لێتێکچووبوو، گەورەم هەر دڵە شێواوەکەم بوو کە رایکێشامە ناو ئەم نەگبەتییەوە، من ئەو کەسەم کە ئێوە بەدوایدا دەگەڕێن، من دەرویشم و دەرویش منم، ئەبم بەدەرویشەکەی تر ئەبم بەدوو دەرویش بەسیان و بەهەزار، بەچیتان بووێت ئەبم، لەوە زیاتر خۆتان هیلاك مەکەن گەورەکانم دڵنیابن کەئەو منم هیچ جیاوازییەك لەئارادا نییە، بەبێ هیچ شکو گومانێك من ئەوم ئەو، دەی گەورەم لەوە زیاتر چیتان ئەوێت! کەوابوو کەمێك بەزەیی بەچیتان ئەوێ و بەکێتان ئەوێ ئەبم.. خۆ ئەگەر چیرۆکەکەشتان ئەوێت چیرۆکەکە، وا ئێستاکە هەر هەمووی بەبێ کەم و زیاد ئەگێڕمەوە هەر لەسەرەتاوەو نوختە بەنوختە تا دواوشەی ئەخەمە بەردەستتان.

لێکۆڵەری دووەم: (بەبرادەرەکەی، هەروەك گیانی بەزەیی جووڵابێت)! برادەر دیارە ئەمە پیاوێکی نەگبەتە هەڵێکی نادەیتێ، با بزانین ئەمجارەیان چی ئەبێت. با هەروەکو خۆت دەتگوت هەر ماوەیەکی کورتی بدەینێو بەڵام زیاتر نا..!

لێکۆڵەری یەکەم: (بەتوندییەوە) نەخێر! چونکە هیچ سوودێکی نییە، بەدەست ئەمەوە تاقەت و حەوسەڵەم چوو بیبەن... دەی تا زووە بیبەن بۆ سارداوەکە.

لێکۆڵەری دووەم: با ئەم هەلەشی بدەینێ.

(دەرویش بەدەوری هەردووکیاندا ئەخولێتەوە)

لێکۆڵەری یەکەم: (لەبەردەرگاکەوە) نەخێر هیچ کەڵکی نییە، ئەمە هەر کاتمان لەکیس ئەدات و هیچی‌تر.

لێکۆڵەری دووەم: (بەدەرویش) دەی ئێستا ئەڵێی چی؟ لێرە خەریك بین یان لەوێ؟ بەڵام بەراستی و بێ هیچ پێچ پەنایەك.

دەرویش: گەورەم لێرە (بەپاڕانەوە) نا گەورەم پێی بڵێ پێویست بەوێ ناکات توخوا کەمێ بەزەیی!

لێکۆڵەری دووەم: (هەروەك مژدەیەك بدات بەدەرویش) باشە دەی کەوابوو با بگەڕێینەوە سەر مەسەلەکە، بەڵام.

دەرویش: (خێرا بەدڵخۆشییەوە) ئەگەڕێینەوە.. ئەگەڕێینەوە.

لێکۆڵەری دووەم: (بەدەنگێکی هێواشەوە) بەملاو ئەولاشدا لائەدەین(دەستێکی بۆ لای چەپ و ئەوی تری بۆ لای راست درێژ ئەکات).

دەرویش: نا... نا گەورەم بەهیچ لایەکدا ناچین.

لێکۆڵەری دووەم (دەنگی بەرز ئەکاتەوە) برادەر: کەوابوو با ئەم هەلەشی بدەینێ. با تۆش لەسەر دەی بێت!

لێکۆڵەری یەکەم: ئەی ئەگەر راستییەکەی نەگوت..؟

لێکۆڵەری دووەم: (بەدەنگێکی نەرم و بەدەرویش) گوێت لێیە دەرویش! ها ئەمجارە

هەر پێچ و پەنایەك بكەیت ئیتر خۆت ئەزانیت!؟

دەروێش: (بەهەمان دەنگ نزمییەوە) هەرچییەك تۆ بیڵێیت ئەیڵێم.

لێكۆڵەری دووەم: (بەسرپەیەك) لەعنەتت لێ بێ... دەبێژە هەر راستی ئەڵێم.

دەروێش: گەورەم هەروەك تۆ ئەیڵێیت، هەر راستی ئەڵێم... بەڵام.

لێكۆڵەری دووەم: بەڵام چی؟

دەروێش: گەورەم! بیكە بۆخاتری چاوی منداڵەكانت بەڵكو جەنابیشت یارمەتییەكم بدەیت..

لێكۆڵەری دووەم: چی..؟؟

دەروێش: ئەگەر هەڵەیەك یان هەرشتێكی خراپم گوت، بەڵكو بۆم راست بكەیتەوە!

لێكۆڵەری دووەم: هەی بۆ گەنی پیس، ئەی چاوت لێ نییە چۆن تكاو رجای لێ ئەكەم هەر بۆ ئەوەی كەمێك سەبرت لێبگرێ، ئیتر ئەم ناماقوڵییانە چییە!

دەروێش: چی ئەڵێیت وا ئەكەم و ئەبم بەئەڵقەلەگوێت.. دەی گەورەم تۆ پرسیار بكەو من وەڵامت بدەمەوەو بەڵام با پرسیارەكان ئاسایی و ئاسان بن، بەگوێم ئاشنابن، هەر شتێ تازەی وایان تێدا نەبێت كەمن نەمبیستبێت، جا خۆم ئەزانم چۆن چاری ئەكەم و چۆن بەباشی وەڵام ئەدەمەوەو رازیتان ئەكەم!

لێكۆڵەری دووەم: (دەفتەرێكی بچووك لە گیرفانی دەرئەهێنێت) دەروێش!

دەروێش: (لەبەردەمیدا قوت ئەبێتەوە) بەڵێ گەورەم

لێكۆڵەری دووەم: ناوەكەت بەتەواوی..؟

دەروێش: دەروێش عەبدولڕەحمان.

لێكۆڵەری دووەم: ئیشت؟

دەروێش: بازرگان..

لێكۆڵەری دووەم: جێگەت؟

دەروێش: سەرشەقام خانووی ژمارە114-60

لێكۆڵەری دووەم: ژنت هەیە؟

دەروێش: بەڵێ

لێكۆڵەری دووەم: چەند منداڵت هەیە؟

دەروێش: چوار

لێكۆڵەری دووەم: (هوشیاری ئەكاتەوە) چی؟ ئەڵێم چەند منداڵت هەیە؟

دەروێش: (هوشیار ئەبێتەوەو سەری ئەلەقێنێت) سیان.

لێكۆڵەری دووەم: یەكە یەكە نا وەكانیان بڵێ.

دەروێش: (بەراراییی و دەنگێكی هیواشەوە دە گەورەم یارمەتیم بدەو خۆت ناوەكانیانم پێ بڵێ).

لێكۆڵەری دووەم: هەڤاڵ، هیوا، سەركەوت.

دەوروێش: (وەكو ئەو ئەیانڵێتەوە) هەڤاڵ، هیوا، سەركەوت

لێكۆڵەری دووەم: ئافەرین زۆر باشە، ئەلحەمدولیلا، مەسەلەی شوناسنامەكەی تەواو.

دەروێش: (هەناسەیەك هەڵئەكێشێ) شوكور بۆ خوای مەزن، گەورەم تەواومان كرد.

لێكۆڵەری دووەم: هێواش دەروێش جارێ دەستمان بەمەسەلەكە نەكردووە، تازە وا دەگەینە سەرەتا!

دەروێش: دەی گەورەم باقی ئەوانیتر ئاسانە، وشە بەوشەیان لەناو فایلەكەدا نووسراون چی تێدایەو نووسراوە هەمووی وایە، هیچ پێویست بەوە ناكات عەزیەتی خۆتان بدەنەوە!

لێكۆڵەری دووەم: قەیناكە دەروێش ئەم ئەزیەتەش هەر لەبەرخاتری تۆیە، بۆ زیاتر دڵنیاییە، خۆ هەر بەكورتیش پێیدا دەچینەوە.

دەروێش: گەورەم تۆ چۆنت لا باشە با هەر وابكەین دەی بابیڵێینەوە.

لێكۆڵەری دووەم: لێرەدا لەئیفادەكەتدا گوتووتە: تۆ لەرێكخراوێكی شۆڕشگێڕدا بوویت، بەتەواوەتیش ئەتزانی كەئامانجی رێكخراوەكە تێكدانی ئارام و ئاسایشی نیشتمانەو بۆ رووخاندنی سستێمی وڵات و بەمەبەستی حوكم زەوتكردن بووە...

دەروێش: بەڵێ گەورەم..

لێكۆڵەری دووەم: بەبەكارهێنانی زۆری هێزو بەشۆڕش؟

دەروێش: (بەبێ بیركردنەوە قسەكانی دووبارە ئەكاتەوە) بەبەكارهێنانی زۆری هێزو بەشۆڕش.

لێكۆڵەری دووەم: بۆ لەناوبردنی ئەو یاساو دام و دەزگایانەی كە گەل بەخواست و هەڵبژاردەی خۆی دایناون؟

دەروێش: بۆ لەناوبردنی ئەو یاساو دام ودەزگایانەی كە گەل بەخواست و هەڵبژاردەی خۆی دایناون.

لێكۆڵەری دووەم: خۆتان ئامادەكرد بۆ هاندانی كرێكار و جووتیارو رەش و رووت بۆ خۆنواندنی چەكدارانە؟

دەروێش: بەڵێ پشت بەیەزدان ئەمانكرد..

لێكۆڵەری دووەم: (ئەنەرێنێت) چی..چی؟

دەروێش: (بەترس ولەرزەوە) گوتم پشت بەخوا ئەمانكرد. بۆ.. خۆ غەڵەتم نەكردووە! ئەی ئێوە ناتانەوێ من وابڵێم؟

لێكۆڵەری دووەم: (بەپەستی و رووگرژییەكەوە) خۆتان ئامادە كردبوو كەئاژاوە بنێنەوەو بەزۆری چەك دەزگاكانی دەوڵەت زەوت بكەن، خۆ ئەگەر پێویستیش بووایە، بێگومانە پێویستیش هەر ئەبوو، هەر كەسێك بهاتایەتە سەر رێگەتان یان لەگەڵتان نەبووایە ئەتانكوشت؟

دەروێش: بەڵێ... بەڵێ ئەمانكوشت

لێكۆڵەری دووەم: كێتان ئەكوشت؟

دەروێش: (بەشڵەژاوییەوە) خوا ئەیزانێ گەورەم... میری،كاربەدەستان، خەڵك هەمووكەسێك!

لێكۆڵەری یەكەم: (هاوار ئەكات) كورە هەی گەوجە، چۆن هەمووكەس؟

دەروێش: (بەشێواوییەوە) ئەی چی بڵێم؟ ئەو لێی پرسیم ئەتانكوشتن،منیش گوتم ئەمانكوشتن.

(بەدوودڵییەوە) گەورەم راستییەكە هەر ئەوەیە كە لەناو فایلەكەدا نووسراوە!! خۆ

ئەگەر هەڵیەکیشم کرد، وا فایلەکە راستی ئەکاتەوە!

لێکۆڵەری دووەم: (ئەیەوێت لەباری گرژی ئەو هەڵوێستە رزگاریان بێت) باشە دەی ئێستا باسی دەوری خۆت لەپیلانەکەدا بکە!

دەروێش: دەوری من!

لێکۆڵەری دووەم: (بەئۆف هەڵکێشانەوە) ئەی گوایە دەوری کێ؟ دەوری باوکم دەی قسە بکە!

دەروێش: (وەك هەوڵی وەبیرهاتنەوە بدات خەم و هیلاکیو بێورەیی هەموو رووخساری ئەگرێتەوە، سەروقژی ئەخورێنی) گەورەم لەفایلەکەدا نووسراوە، ئەو چۆن ئەڵێت هەر وایە.

لێکۆڵەری یەکەم: (لێی نزیك ئەبێتەوە) ئاخر هەی ئەقڵ سز چەندجارم پێگوتیت کەئێمە ئەمانەوێت لەدەمی خۆتەوە راستییەکان بزانین نەك لەفایلەکەوە.

دەروێش: (بەسڵەمینەوە) گەورەم یەعنی لەوەش زیاتر لەفایلەکەدا نووسراوە؟

لێکۆڵەری یەکەم: دەروێش، با واز لەفایلەکە بهێنین، بیرمەکەرەوە لەوەی لەوێدا نووسراوە.

دەروێش: ئەی هاوار، ئاخر گەورەم چۆن ئەبێت! ئاخر مەسەلەکە خۆی بێکەم وزیادو هەر چۆن رووی داوە، ئاوا لەفایلەکەدا نووسراوە.

لێکۆڵەری یەکەم: (بەتوڕەبوونەوە) من پێت ئەڵێم بیر لەوانە مەکەرەوە لەقسەکەم ناگەیت؟

دەروێش: یەعنی گەورەم ئەمەیان شتێکی تازەیە، ئیتر مەسەلەی فایلەکە تەواوبوو ئەچینە ناو کێشەیەکی ترەوە؟!

لێکۆڵەری یەکەم: کوڕە تۆ گەوجیت، کەریت، شێتیت بۆچی تێناگەیت، خۆ ئێمە بەتورکی قسە ناکەین.

دەروێش: (هیلاکی کەنەفت و پەرێشانی کردووە و خەریکە زیاتر بێورە ئەبێت و پەکی ئەکەوێ هەروەك تۆقاو) گەورەم بۆچی جگە لەمن و ئەوی‌تر دەروێشێکی تریش هەیە؟ ئەویش لەپیلانەکەدایە؟

(سەرنجی هەڵچوونی لێکۆڵەرەوەکان ئەدات) گەورەم! تکات لێئەکەم تووڕە مەبە، تەنیا ئەمەوێ لەوە بگەم کە ئایا دەروێشی سێیەمیش هەیە یان نە؟

لێکۆڵەری دووەم: دەروێش، ئاخر قەولمان ئەوە نەبوو کە راستی بڵێیت!؟ وا جارێکی تریش گەڕایتەوە سەر تەڵەکەبازی و ساختەچێتییەکانت! ساردواوەکەت لەبیرە یان لەبیرت چۆتەوە؟ (باش ددان بەوشەکاندا ئەنێت) ئێمە ئەمانەوێت چیرۆکی پیلانەکەمان بۆ باس بکەیت، باسی دەوری خۆتمان بۆ بکەیت دەوری یەکەیەکەی ئەوانی‌تر روون بکەیتەوە، کەوابوو هەر خۆت سەرپشك بە، ئەمیان یان ساردواوەکە؟

دەروێش: ئاخر گەورە بەڕێزەکانم، بۆچی ساردواو!، هەر کەئێوە ناوی ساردواوەکە ئەهێنن من هەردوو ئەژنۆم ئەشکێ و ورەم لەبەر ئەبڕێ. دەی کەمێك سەبرم لێبگرن با بۆم روون بێتەوەو بزانم ئایا دەروێشی سێیەم لەئارادایە؟ خۆ ئەگەر ئەویش هەبێت، وا هەر خوا بۆ خۆی ئەیزانێ کێشەکە چەند ئاڵۆزتر ئەبێت! هەر دەبێت بەهێلانەی جاڵجاڵۆکەو ئیتر مەحاڵە سەرم لەهیچ دەربچێت..! بگرە هەر تەواو ئەمفەوتێنێت، حاڵی حازر من چوومەتە پێستی ئەوی ترەوە و کارەکە کۆتایی هاتووە، بەڵام پەیدابوون و دۆزینەوەی زەلامی سێیەم هەر تەواو کارەکە ئاڵۆزتر دەکات و هێندەی تر سەرم لێ ئەشێوێنێت.. یەعنی ئەبێت سەرلەنوێ و لەسەرەتاوە دەست پێبکەینەوە: ناوی، ماڵی، ژن و منداڵەکانی ئیشی، پیلانەکەو دەوری..! بەخوا ئەوانە بەمن هەر حەل ناکرێن.. دە خوایە گیان ئاخر بۆچی هەر دەروێشەکان بەم کێشەیەوە بەستراونەتەوە...!

لە کاتێکدا ئەم جیهانە بەرین و فراوانە پڕێتی لەخەڵك، ئەی بۆچی ئەبێت هەر بەتەنها دەروێشەکان هەڵگری تۆوی تاوان و مەترسی و پیلان بن...؟ تێیی ناگەم.

لێکۆڵەری دووەم: (لەتووڕەبووندا جێگە بەخۆی ناگرێت) بەسە بەس، دەمت داخەو لەوە زیاتر خۆت لەباسەکە مەدزەرەوە!

دەروێش: (بەترسێکەوە) بەڵێ باش گەورەم، باهەر لەسەر باسەکە بەردەوام بین، ئەبێ لەم باسەدا بگەینە ئەنجام و بنبڕی بکەین، چارمان بێچارەیەو هەر ئەبێ وا بکەین،ئەی ئەگەر یەکێکیان تاوان نەکات ئیتر چۆن بێ‌تاوانمان بۆ دەرئەکەوێت!

دەروێش عەبدولڕەحمان بەرامبەر ئارام و ئاسایشی گشتی تاوانبارە... رەنگە دەروێشێکی تر بووبێت، رەنگە من بووبم لەوانەشە دەروێشی سێیەم بووبێت، خۆ من تێئەگەم گەورەم ئەشزانم ئەگەر یەکێك بەردێکی هاویشتە ناو دەریایەکەوە ئیتر ئەوە چوارگۆشەی جیهان ئەهێنێتە گرمەو لەرزین، خۆ لەڕاستیشدا هەر ئەوە رووی داوە.. دەروێشێك هات و بەردێکی توڕدا، ئیتر ئەبێت لەشی هەموو دەروێشە داماوەکانی ئەم جیهانە بێتە لەرزین و گرمەو دەنگدانەوە، بەندەش یەکێکە لەو دەروێشانەو ئەبێت لەناو ئەو دەنگدانەدا، بلەرزێت، تاوانەکە تاوانی هەموو دەروێشەکانە، هەقی خۆیەتی بەهۆی منی دەروێشەوە تووشی جۆرەها ئازارو ئەشکەنجەو چەرمەسەری بن.

لێکۆڵەری یەکەم: (بەخێرایی بەرەو رووی ئەڕوات و شانی راتەوەشێنێ) ئەی چۆن! بەسەری باوکت ئەبێ تۆو ئەوانی تریش بەدەردێك بەرین ژەهراوتان پێبێنینەوە هەی تەڵەکەبازی پیلانگێڕی چەپەڵ! ئەبێ وات لێ بکەین ئەودنیا بەچاوی خۆت ببینی.. ئەبێ هەر رۆژەو پارچەیەکت لێبکەینەوە.

دەروێش: گەورەم.. گەورەم

لێکۆڵەری یەکەم: بەسە.. بەس ئیتر تەواو، گوێت لێناگیرێت، نامانەوێت گوێمان لەیەك وشەش بێت!

دەروێش: (لەبەینی دەستیایەو هەموو گیانی ئەلەرزێ) گەورەم، ئەی ئێوە یەکێکتان لەوان ناوێت؟! دە من ئەوم ئەو.. دەی بەپێی تاوانەکەم سزام بدەن! بەپێی ئەوەی لەفایلەکەمدا نووسراوە سزام بدەن! دەی بمکوژن و بابڕێتەوە.

لێکۆڵەری یەکەم: نا..نا هەروا بەئاسانی نامرێت، ئەتەوێ هەروا ئاسان بمریت و لەدەستمان سەرفراز بیت! دەسا ئەوە بزانە نەك هەر رۆژە جارێك ئەتکوژین و زیندووت ئەکەینەوە، بەڵکو هەموو سات و دەقیقەیەك کەرەتێك ئەمرێت و گیانت بەبەردا ئەهێنینەوە! (هاوار ئەکات دەی بیبەن نەیەڵن چیتر ئیسراحەت بکات).

دەورێش: (بەسەر زەویدا ئەکەوێت و هەردوو ئەژنۆی لێکۆڵەر ئەگرێت) گەورەم مەیەڵە، توانام نەماوە بەرگە ناگرم، بەزەییەکتان بەم تەرمەدا بێتەوە... ئەبم.. ئەبم بەدەروێش و بەدەروێش و بەدەروێش چۆنتان ئەوێ تادوالاپەڕەکانی فایلەکانتان پڕبکەن، تاوان لەدوای تاوان بهۆننەوەو دایبڕێژن و تۆماریان بکەن، ئەبم بەدەروێش بەبازرگان، بەکرێکار بەشۆڕشگێر، بەهەر گیانلەبەرێکی عەنتیکەتان ئەوێت ئەبم...

فایلی تاوانم بکەنەوەو ئەوی بەبیری مرۆڤیشدا نایەت بینووسن و بیخوێننەوە، لەتاوان و خراپەدا نوقمم بکەن، بەهەمووشتێك رازیم، دەی بمکەن بەپەندو نموونە بۆ هەموو خەڵك، لە هەر لاپەڕەیەکی فایلەکەدا کەمنی پێدا هەڵواسراوە، چی لەسەر رەش دەکەنەوە بیکەن، هەر ژمارەو ناوو رووداوو مێژوو و تاوانێك ئەنووسن بینووسن... تێکەڵی هەموو شایەت و تاوان و رووداوەکانم بکەن، بەهەمووی رازیم و مەهێڵن بمبەنەوە، نامەوێ جارێکیتر چاوم بەسارداوەکە بکەوێتەوە.

لێکوڵەری یەکەم: (خێرا خێرا ئەقە بەدەروێشدا دەماڵێت) خۆت پەڕەی تاوانباریت پڕ بکەرەوە، بەدەمی خۆتەوە(لەسەر لەقەپێداماڵینی بەردەوامە) ئێمە راستیمان ئەوێت راستی بەپوختەکراوی و بێ پێچ وپەناو لەزاری خۆتەوە!.

دەروێش: دەی گەورەم منیش هەر وێڵی ئەو راستییە پوختەکراوەم، تا ئەوپەڕی جیهان بەدوایدا رائەکەم، خۆم بۆتانی دەهێنم، هەر لەبەر ئێوە ئەیگرم بەکۆڵمەوەو هەموو کوچەو کەلەبەری وڵاتانی پێ‌تەی ئەکەم و پڕبەدەم هاوار ئەکەم: منم راستی، منم راستی دەبوٚم بێنن و بارمکەن لێی، با بیخەنە ناو مێشك و دڵوسەرزمانم، تا دواهەناسەم ئەیڵێم و ئەیڵێمەوە دەی گەورەکانم پێم بڵێن کوا راستی؟ بیکەنە رایی خوا، پێم بڵێن راستی لەکوێیە؟ لەکوێیە ڕاستی...!؟

ئەگەر بیلبیلەی چاویشم بێت شەرتە بۆتان دەربهێنم و پێشکەشتانی بکەم.

لێکۆڵەری یەکەم: (هاوار ئەکا) راستییەکەم لەتۆ ئەوێت لەتۆ، لای تۆ خۆی حەشارداوە، راستی پیلانەکە لای تۆیە تۆ، دەی بیڵێ وەکو خۆی و بەدووروودرێژی چۆن بووەو چۆن رووی داوە بۆمان باس بکە، بەتەواوی بەبی نوقسانی، تێگەیشتیت؟

دەروێش: (سەیری هەردوو لێکۆڵەرو قامچی بەدەست ئەکات و بەچاوی رێشکەوپێشکاوی و لەنائومێدی و پەستی و شەکەتییەکی زۆرەوە) بەدووروودرێژی باسی پیلانەکەتان لەمن دەوێت، ئەتانەوێ وشەبەوشە چۆن بووە هەروەکو خۆی لەدەمی منەوە بیبیستن...!

لێکۆڵەری یەکەم: (بەتوڕەبوون و هەڕەشەوە) ئا.. ئا هەر لەسەرەتاوە تا دواییەکەی و لەدەمی خۆتەوە چۆن بووە، ئاوامان ئەوێت!

دەروێش: (خۆی کۆئەکاتەوە، هەردوو باڵی راست و چەپی لەسەر سنگی توند کردووە) لەسەرەتاوە تا دوایی؟

لێکۆڵەری یەکەم: هەر لە یەکەم وشەوە تا دواوشەی.

دەروێش : (چاوی لەنێوانیاندا دەهێنێ و دەبا) بەڵێ باشە هەر ئێستاکە هەمووی بەیەکجار دەڵێم.

لێکۆڵەری دووەم: (بەخۆشییەوە) ئادەی کاکە دەروێش! دەی خێراکەو دەستی پێبکە، دەی خێراکەو خۆت رزگارکە، هەر بەو گوتنە گیان و لەش و هۆش وگۆشت،سەرفراز ئەکەیت.

دەورێش: (بەدەنگێکی هێمن و لەسەرخۆو هەروەك بڕیارێکی شاراوەو بێهیوا لەمێشکیدا دەرپەڕێنێ و سووریشە لەسەر درکاندنی) کەوابوو گوێم لێبگرن گەورەکان، سەرەتا پیاوێکی هەژار و بێوەی بووم، لەخۆم زیاتر نەم ئەزانی چی تر هەیە، هەستم بەوە نەئەکرد کەچی دەوری داوم. وام نەزانی ئەم جیهانە هەر تەنها شوێنێکەو تێیدا ئەژیم، هەموو حیهانم خۆش ئەویست، هەر تەنها لەبەرئەوەی تێیدا ئەژیام، بەدەر لەوە ئەم دنیایە هیچ مانایەکی‌تری بۆ من نەبوو نەئەو رازەکانی منی هەڵئەگرت و نەمنیش دەربەستی رازەکانی ئەوبووم، ئەو بەئارەزووی خۆی ئەجووڵاو منیش لەگەڵ رازونیازی خۆمدا مێشیش میوانم نەبوو، تنۆکێك بووم لەدەریایەك، گەورەم هەر لەیەك تنۆك زیاتر نەبووم، چۆنم بویستایە ئاوا ئەژیام و وا ئەمخوارد، ئەم جیهانە شوێنێکی پان وبەرینەو هەتا بڵێی فراوانە، بەلاّم پڕە لەناکۆکی و پێکادان لەناو خەم و چەرمەسەرییەکانا ونبووەو بەلاّم من خۆم خزاندبووە ناو ژیانی نازو نیعمەتەوە، خۆشگوزەران و بەختەوەر لەناو ئیش وکاری خۆمدا ئەژیام ئەگەر تۆفانیش هەڵبستایە وام ئەزانی هیچ رووی نەداوە. ئەم جیهانە هەمووی شەڕو خراپەیە زەوییەکی پڕ لەمین و دینەمێتە، هەمووی داوو تەڵەیەو ئەیەوێت تووشت بکات و لەناو داوەکانیدا حەشارت بدات. جیهان شەیتانێکی جانەوەرەو ملیۆنەها رۆڵەی لەسۆزو دەروونی پڕ لەبەختی خۆیان بێبەشکردووە و گیرۆدەی داو و خەمەکانی خۆی کردوونو بەلاّم من وشیار بووم و

ئاگاداری خۆم بووم، ئەمزانی چۆن خۆم لەو داوانەلابدەمو چۆن هەنگاوبنێم.

لێکۆڵەری یەکەم: (سەبری لەبەر هەڵئەگیرێ و قسەکانی پێ ئەبڕێت) کوڕە ئەو جیهانە شەیتانەی تۆ بۆ دۆزەخ هەی گێلە، من چیمە بەسەر ئەو قسە هەڵەق و مەڵەقانەی تۆوە، من تەنها باسی پیلانەکەم ئەوێ پیلان،تەنها باسی خودی پیلانەکەم بۆ بکەو چەنەبازی ترم ناوێت...

دەروێش: (بەهەمان دەنگ و بەهەمان سووربوونەوە) ئاخر گەورەم خۆ منیش هەر باسی خودی پیلانەکەت بۆ ئەکەم، ئەی خۆت ناڵێی وشەوبەوشەو بەدووروودرێژی، گەورەم ئاخر جیهان خۆی پیلانە هەر جیهان خۆی پیلانەکەی لێکردم و تووشی ئەم داوەی خۆی کردم.

لێکۆڵەری یەکەم: چۆن چۆنی تووشی کردیت، چۆن؟

دەروێش: رایکێشام.. بۆلای خۆی کێشی کردم کردمی بەمێردو بەباوک، رابردوو و ئێستاو پاشەڕۆژی بۆ دەستنیشان کردم، چۆنی گەرەك بوو هەر وای کرد، ئەم جیهانە پۆخڵە بەریبینی گرتم، رایکێشام و رایکێشام تا بمکات بە بەشێك لەخۆی و ببم بە بەشێك لێی. شڵەقاندمی و هەژاندمی تا تێکەڵی یەکێکیتری کردم، ناوو شوناسنامە و ماڵ و منداڵ و شوێن و شارو وڵاتی خۆمی لێم زەوتکردو هی نوێ و نامۆیان بەسەرمدا سەپاندو کرام بەلێپرسراویان.

لێکۆڵەری یەکەم: (وا توڕە بووە خەریکە لەپێستەکەی خۆی ئەچێتە دەرێ). باشە باشە! ئەی پیلانەکە خۆی چی لێهات...؟ دەی باسی پیلانەکەمان بۆ بکە... پیلانەکە!

دەروێش: (بەدەنگێکی ساردوسڕەوە) جیهان خۆی پیلانەکەیە!

لێکۆڵەری یەکەم: (هەروەکو شێتی لێهاتووە هاوار ئەکات) چی چی؟ ئەوە گاڵتەم پێدەکەیت؟ من پرسیاری پیلانەکەت لێ ئەکەم.. پیلان!

دەروێش: (ئەمیش هاوار ئەکات) منیش عەرزم کردی کەجیهان خۆی پیلانەکەیە.

لێکۆڵەری یەکەم: (بەهەڵچوونێکی شێتانەوە روو لەجەماوەر دەکات) دەی خوای ئەرزو ئاسمان! ئەرێ خەڵکینە کەستان لەژیانتاندا شتی وای بیستووە جیهان پیلان بێت؟ خاوەن پیلانەکەش هەژارو بەسەزمانەو ئاگاداری هیچ نییە. (رووی تێئەکات) هاااا تۆ خۆت هیچ نیت.... هاااا تۆ خۆت زۆر بێ تاوانیت (بەرەورووی ئەڕوات و دەروێشیش بەخۆخشاندنەوە خۆی دوور ئەخاتەوە) دەدەی بڵێ! جیهان پیلانەکەیەو بەڵام خۆت.. خۆت ئەو شەیتانە بۆگەنەی کە لەژێر پێستی دەروێشدا خۆت مەڵاس داوە، تۆ هیچ نیت و ئاگاداری هیچ شتێکیش نەبوویت. نا.. نا ئەم لەگوێی گادا نوستووەو هێشتا بەخەبەر نەهاتۆتەوە! (دەروێش بەر لێکۆڵەری دووەم ئەکەوێت کاتێك ئەم قاچی هەڵئەبڕێت و ئەیخاتە سەر شانی دەروێش) باشە باش... ئێستا خۆت ئەزانیت چیت لێئەکەم.. ئەوە ئەوەد دانە روژە تۆ وەك منداڵ یاری بەئێمەئەکەیت لەسەر ئەنجامی ئەو هەموو هیلاکیو ماندووبوونەمان وائێستا راستییەکەمان بەوجۆرە پێ ئەڵێیت (لەسەر پشتی دەروێش ئەوەستێ) ها ئەمەیە راستییەکەت، جیهان پیلانەکەیە، جیهان خۆی بوو بەپیلانگێڕو یاخیبوو، بەرگی رەشوڕووت و خائینی لەبەرکردوو ئەو خەڵکەی تووشی فەلاکەت کرد، ئینجا خۆی بۆ دڵسۆزان و بۆ دەوڵەت نایەوە، ئێی حەمەدەروێش ئێستا جیهان پیلانەکەیە. خۆشت بێئاگایت لە هەموو شتێکو نازانی چی بووەو چی رووی داوە. دەی باشە کەوابوو هەر ئێستا ئەم جیهانە ئەهێنینە گیروگازو هەر خۆمان ئەزانین چۆن راستییەکە لەناو مۆخیدا هەڵئەهێنجینو هەر ئێستاکە جیهان بۆ سارداوەکە کێش ئەکەین وئەیخەینە بەردەم ئامرازەکان، ئەیکەینە میوانیان تا بەکەماڵی ئیسراحەت لەشی لەئێش و ئازار تێروتەسەل بکەن، تا دەنگی ناڵەو هاواری ژێر ئەشکەنجە، ئاسمان پڕ بکەن، (خۆی ئەنوشتێنێتەوەو شانی دەروێش رائەکێشێت) ئەمەتا! ئائەوەتا، وا ئەو جیهانەمان بەتاوانەوە گرت، هەر ئێستا دەبرێتە سارداوەکەو لەوێ لەگەڵی ئەکەینە گفتوگۆ (رائەکێشێ) دەی وەرە ئەی جیهانی پیلانگێڕ با کەمێك لە نێوان چوار دیواری سارداوەکەدا قسەی خۆش بکەین (دەروێش خۆی رائەپسکێنێ تا خۆی بەربدات، بەڵام بێسوودە) وا ئێستا جیهان کەوتە ناو داوەکەوە، تازە رزگاربوونی بۆ نییە، (رائەکێشێ ودەروێش خۆی گیرئەکات دەی رایکێشن.. رایکێشن (هەرسێ زەلامەکە دەروێش بەخۆیانەوە جووت ئەکەن).

لێکۆڵەری یەکەم: (دەستی لێبەرئەداو بۆ ئەوانی تری بەجێدەهێڵێ) رایکێشن بەرەو سارداوەکە، بیکەن بەمیوانی ئامرازەکان.

دەروێش: (هاوار ئەکات) بەخوا راستیم گوتووە، بەچیتان بڕوایە راستییەکەم گوتووە!؟

لێکۆڵەری یەکەم: (بەگاڵتەپێکردنەوە) ئێی ئێمەش بڕوامان بەتۆ کرد، ئەی پیلانەکە جیهان نیە!؟

دەروێش: (دوو زەلامەکە دەروێش رائەکێشن بۆ دەرەوەو ئەویش هاوار ئەکات) بەڵێ وایە جیهان پیلانەکەیە بەو خوایەی هەمووماندروستکردووە جیهان پیلانەکەیە... جیهان پیلانەکەیە.

## سەرچاوە

دەروێشەکان بەدوای راستیدا دەگەڕێن، نووسینی: مستەفا حەللاج، وەرگێڕان و پێشەکی نووسین: مەحمود مەلا عززەت، چاپی دووەم، لە چاپکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سەر بە وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان – سێمانی.

# چەند پەیڤێك بۆ یادەوەریی هونەرمەند قادری حاجی حسێن[1]

بەقەڵەمی: مەحمود مەلا عززەت

تابلۆی تا چاو بڕ بکات سەوزایی ئەو ناوچەیە و ئەم لاو ئەولای زەڵم-ی ئەو بەهارەی کە ئاوی ڕووبارەکەی گەیاندبووە لێوارەکانی و بە مەنگی و لەسەرخۆ ڕووەو دوو ئاوان بەنەرمە شەپۆل گوزەری دەکرد، لە پشتیشیانەوە زنجیرە چیای هەورامانی سەوز و سپی پۆشی ناو باوەشی ئاسمانی شینی کوژەکەیی نەخشێنکراو بەوردە پەڵە هەور..

مەڵبەندی ئەو سەیرانە سیاسییەی ڕازاندبۆوە کە لاو و پیاوانی سەر ڕێبازی کوردایەتیی ئەو سەردەمە سازیان کردبوو.

دوای ماندوبونێکی زۆری ڕێگەی پڕ لە هەڵبەزودابەز و تاسە، سواربووانی سێ چوار لۆری. کە بەیانییەکی زووی سەرەتای ساڵێکی کۆتایی چلەکان، کە بۆ خۆم لە زەینمدا نەماو، 1948 بوو یان 49، لە مزگەوتی "تەکیەی سەرکارێزەوە" کە مەلا شێخ ڕەئووف ئیمامی بوو، کەوتبوونە ڕێ. منیش لە تەمەنی منداڵی و قوتابی پۆلی چوار یان پێنجی قوتابخانەی خالیدییە بووم، خۆم تێهەڵکێشی ئەو سەیرانە کردبوو، چونکە هەر شەوەکەی ئەو ڕۆژە، سوێندی کاکە حەمەم دابوو، کە یەکێك بوو لەو لاوانەی دەرکم دەکرد کە کوردایەتی و سیاسەت دەکەن، لەگەڵ خۆیدا بمبات.

گەلێ لاوی تری دەرکەوتوو چالاك و بزۆز لەگەڵ ڕێکخستنی سەیرانەکە خەریك بوون، ئەوانەی لە زەینی مندا دیمەن و ناویان ماوە مام ئەحمەدی دادی کاك حسەڕەش وە قادری حاجی حسەین.

دوای حەوانەیەکی کورت و چاخواردنەوە، لاوان کەوتنە ڕێکخستنی شوێنی دانیشتن و سازکردنی خواردنی نیوەڕۆ. لە پڕ چەپڵەلێدان دەستی پێکرد، کۆڕ بەسترا و هەموان بە نیوە بازنەیەکی نیمچە داخراو خۆیان لەناو بازنەکەدا بینییەوە.

قسە و گوتار دەستی پێکرد.. هەر کە ناوی کاك "قادری حاجی حسێن" لەسەر زار کەوتە بەر گوێ، لەناو چەپڵە ڕێزاندا بە چڵێ گوڵی سوری گەشاوەوە بە دەستەوە. زۆر لەسەرخۆ هەنگاوی ڕووە و بۆشایی بازنەکە نا.. دەنگی بەسۆزی هەست ڕاکێشەری‌و وشەی پڕ لە مانای ئازادیی و ئاوازی پڕ لە سازی سرودی: گوڵی سەربەستی هۆش و گۆش هەموویانی ڕاکێشا بۆ لای خۆی

**گوڵی سەربەستی**<br>
**گوڵێك شیرینتر لە خونچەی بەهار**<br>
**نازکتر، جوانتر، لە شەوبۆی نازدار**<br>
**گەشتر لە دیدەی وەنەوشەی نزار**<br>
**گوڵێکە ناوی گوڵی سەربەستی**<br>
**مەردە ئەو گەلەی بکاتە دەستی**<br>
**گوڵی سەربەستی ئەی هێزی گیانم**<br>
**ڕۆشنکەرەوەی ڕێگەی ژیانم**<br>
**تۆ نەبێ! من خۆم بە هیچ نازانم**<br>
**تۆم نەبی هەرگز ناحەسێمەوە**<br>
**بێ بۆنی خۆشت نابوژێمەوە**

تێکەڵ بەو دیمەنە دڵفرێنەی ئەو بەهەشتەی کوردستان دەبوون و جۆرێ لە بەرزیی ژیانی ناو ساتە نیمچە ئازادییە کاتییە تێکەڵبووە بە جۆرێ لە ترسی پێزانین دەزگا داپڵۆسێنەرەکەی حکومەت.. لەسەر روخساری هاوبەشیان دەردەکەوت، لە دڵ و دەرونێکی هەژارەوە بە چەپڵە و گەشکەی پڕ لە شادیی گوێیان بۆ سرودەکە ڕاگرتبوو وە ناوبەناو هاواریان دەکرد: بیڵێرەوە.. بیڵێرەوە..

زۆر کەم لە دیمەنەکانی ئەو سەیرانە سیاسییەم لە یادماوە، یەکێکیان ئەو دەنگە پڕ لە سۆزە و سرەوودەکەی کاك قادری حاجی حسەینە.. من ئێستاش وا هەست دەکەم کە خاڵێکی ڕۆڵبینەرن چەکەرەکردنی هوشیاریی سیاسی و خۆشەویستیی نەتەوە، ئەو دەنگ و وشە و سرەوودەی کاك قادر بووە بە تایبەتی، کەم شانۆگەری و نواندنی هەبوو کە هونەرمەندانی سەر ڕێبازی کوردایەتی پێشکەشیان دەکرد، ئەم بەو سرودە هاوبەشی نەکردبێ..

لە نیوەی دووەمی حەفتاکاندا، ئەو ساڵانەی بۆ "رومادی" نەفی کرابوم و ناوبەناو بە مۆڵەت دەهاتمەوە سلێمانی، لە "نادیی پزیشکان لەگەڵ گەلێ برای وەك: هەردوو بەهەشتی د. خەسرەو خاڵ و عومەر عارف، مەحمود توفیق و فایەق تۆفیق و عومەری میرزا.. دادەنیشتین و ئاشنایەتیم لەگەڵ کاك قادر پەیدا کرد..

شەوێکیان پێم گوت: کاك قادر ئێوە بەو چالاکییەی ئەو سەردەمانەو بە خەبات و بە گوڵی سەربەستیی ناو دەست و و سەرزار. چەندین نەوەی وەك ئێمە ومانانتان لەو تەمەنە منداڵییەوە.. پەروەردە دەکرد.. خۆزگە بەشێوەیەك لەو شێوانە ئەو دیمەن و تابلۆیانە لەبیر نەدەکران.. لە وەڵامدا گوتی: ئێمە لە سەردەمی خۆماندا ڕۆڵی خۆمانمان بینی.. ئیتر نۆرەی ئێوە و نەوەکانی دوای ئێوەیە..

هاوینی 1997

[1] *ئەم چەند دێڕەی مامۆستا مەحمود مەلا عززەت لەسەر داوای کوڕەکانی هونەرمەند (قادری حاجی حسێن) نوسراوە بە مەبەستی دانانی لە کتێبێکدا کە لەلایەن ئەوانەوە بۆ ئەو مەبەستە ئامادە دەکرا، پێمان باشبوو لێرەدا وەك خۆی بڵاوبکەینەوە.

# زانكۆ و كۆمەڵگە

مەحمود مەلا عززەت

زۆر لە مێژە جیهانی زانكۆ وەك مەڵبەندێكی گرنگی شارستانی و پێشكەوتنی كۆمەڵ لە رووی زانستیی، كۆمەڵایەتی، ئایدیۆلۆجی، مێژویی، زمان و كولتور و ئەدەب، رۆڵی ئەكادیمیی و رووناكبیریی و كلتووری خۆی لە پێشكەوتن و گەشەكردنەكانیدا دەبینێت و بۆتە روخسارێكی گەشی كۆمەڵگە و هۆیەكی كاریگەری زیاتر بالاكردنی ژیانی مرۆڤ و كۆمەڵ و پێشكەوتنەكانی.

هەزاران ساڵ لەمەوبەر مەڵبەندە رووناكبیریی و فەلسەفی و ئاینییەكانی سەردەمانی بینای شارستانی لە میسۆپۆتامیا و میسر و هیندستان و گریك و رۆمان و رۆژگارەكانی دەوڵەتی ئیسلامی سەرەتای ئەو شارستانیەت و مەڵبەندە خوێندەواری و روناكبیریانە بوون و سەرەتای ئەو كاروانە پڕ لەسەركەوتن و پێشكەوتن و بەرەو پێش چوونە مەزنانە بوون كە لە لاپەڕەكانی مێژوودا دەیخوێننەوە و ئێستاش لەناو پلە بەرزە بالاكردووەكەیدا دەژین و بە چاوی خۆمان دەیبینین.

بەتایبەتی و لە سەدان ساڵ لەمەوبەرەوە مەڵبەندە روناكبیریی و فەلسەفی و ئاینییەكانی سەدەی ناوەڕاست لە ئەوروپا، سەرەتایەكی گرنگ بوون بۆ دامەزراندنی زانكۆو مەڵبەندە زانستییەكان، كە لە سەرەتاوە زیاتر لایەنی ئاینی رۆڵی كاریگەریان تێدا دەبینی، لای خۆشمان مزگەوت و خانەقا و حوجرە و مەلا و فەقێ و میرزا و شاعیر و زانا ئاینییەكان رۆڵیان دەبینی.

هەرچەندە وڵاتی ئێمەش بەردەوام داگیركراوو مێژوو شارستانی و كولتور شێوێنراوو ونكراو بووە، وە لەبەرئەوەی كە ئەو حاڵەتانە بوونە هۆی ئەوەی كە كورد نەتوانێت دەوڵەتی تایبەتی خۆی هەبێت، بۆیە نەیتوانی وەك گەلانی دراوسێی رۆڵی سیاسی و روناكبیریی لەو جۆرە لەو ئاستانەدا ببینێت، هەرچەندە رۆڵی زانا و پیاوانی ئاینی لە مێژووی ناوچەكەدا زۆر دیار و گەشاوە بووە، بێ ئەوەی بتوانرێت وەك گەلانی دراوسێی ئەو زەمینە خوڵقاوە تایبەتییەی خۆی هەبێت..

لەبەر ئەوانە،جیاوازییە گەورە و هەمەلایەنەكان بەرچاوبوون و تا ئێستاش ئەم حاڵە نائاسایی و نامۆیە، بە بەراورد، بەردەوامە.. بەڵام لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەوە جۆرێكی جیاوازتر لە رۆڵ و كار و بەرهەمی هەبوو، چ لە ناوەوە و چ لە دەرەوەی وڵات، بە تایبەتی دوای كردنەوەی زانكۆی سلێمانی (1968/10/24)، كە بوو بە مەڵبەندێكی كراوە و زیندووی ئەكادیمی و زانستیی و رووناكبیریی.بەڵام گەشانەوە و پێشكەوتن و هەنگاوی مێژوویی گرنگ دوای راپەڕین بوو، دوای خوڵقاندنی دەرفەتی ئازادی و حوكمی خۆماڵیی كوردستانی فیدراڵ و ئەو كەشەوهەوا ئازادییەیە كە رۆژ بە رۆژ گەشاوەتر دەبێت، بۆیە هەنگاو و فراوان بوونەكان گەورەتر دەبوون.لە زانكۆی سلێمانییەوە بۆ زانكۆی سەلاحەددین و زانكۆی دهۆك و ئینجا كردنەوەی دەیان پەیمانگە و سەنتەری رووناكبیریی تر و ئینجا خوێندنی بالا بووە مەڵبەندێكی بالاتر و رووناكتر كە بە،هەق بوونە برِبڕەی پشتی ژیانی زانستی و ئەكادیمی و روناكبیریی و وەرگرتنی چەندین نامەی ماستەر و دوكتۆراو ئینجا دەیان نوسەر و روناكبیر، چەندین باس و نوسین و لێكۆڵینەوە لەسەر زانكۆو گەشەكردن و پێشكەوتنەكانی و رێبازی زیاتر سەركەوتنی بلاو بكەنەوە.. چ وەك نامیلكە و چ لەسەر لاپەڕەكانی رۆژنامە و بلاوكراوە و گۆڤار.

ئەم بەرهەمەی كاكە سالار مەحمود كە 22 باس و ووتار لە خۆی دەگرێت هەندێكیان لە بۆنە جیاجیاكاندا بە وتار نوسیونی و بلاوی كردوونەتەوە هەمەلایەنەو جۆراوجۆرن، كۆی بابەتەكانی لەسەر زانكۆیە و هەر یەكەیان باس لە گۆشەیەكی ژیانی زانكۆیی و رۆڵ و رێباز و ئامانجەكانی،دەكات. كە بە گشتی پێشنیاری گونجاو و درشت و شێرانەنەن. ئاماژەكردن و روناكی خستنە سەر ئەو لایەنانە كە دەكرێت كاریان بۆ بكرێت و زانكۆیان پێ پێشخرێت، پێشنیاری باش،و ورد و وشیارانە لە خۆ دەگرن.. كە بە شێوەیەكی باش و گونجاو عەرزی كردوون و لێزانانە بابەت و ناوەڕۆكەكانی داڕشتوون، هەر لەو باسە سەرەتاییانەوە كە دەرگای زانكۆ دەكەنەوە، تا باسە زانستیی و ئەكادیمیەكان و مەرجەكانی خوێندن و پرۆسەی گەشەكردنی، چۆن دەبێتە ناوەندێكی رووناكبیریی، راگەیاندن و زانكۆ، زانكۆ وەك ناوەندێكی ئەكادیمی و وەك سەنگەری بەرگریی و ئامرازی هوشیاریی نەتەوەیی و رۆڵی لە مەسەلەی نیشتمانیدا.. خوێندكاران و گوتارەكانیان.. سەرجەمی ئەوانەش دەریدەخەن.كە سەركەوتووانە ئەو باس و بابەتانەی هەڵبژاردووە و لەسەری نوسیون.. لە رووی داڕشتن و زمانەوە بە زمانێكی پاراوو و پەتی عەرزی بابەتی نوسینەكانی كردووە.

بلاوكردنەوەی هەندێك لەو باسانەش لە رۆژنامە و گۆڤارەكاندا بایەخێكی تر بۆ سەنگی نوسینەكە زیاتر دەكات، چونكە بە كەوتنە بەر دیدی خوێنەران.. رەنگە جگە لە خوێندنەوەكە جۆرێ لە بیروكاری نرخاندنی لا خوڵقاندبن، كە لە هەردوو حاڵەتدا و لە حاڵەتی نەبوونیشیدا.. نووسەریان خستۆتە بەردەم سەرلەنوێ چاوخشاندنەوە بە باسەكانیدا و بەسەر لەنوێ تەتەڵەكردن و پوختكردنیان لە هەڵە و پەڵە.

نوسەر خۆی دەرچووی بەشی كوردی زانكۆی سلێمانییە، بۆیە لە نزیكەوە لەگەڵ رووداوو هەندێك لە باسەكانی ناو ئەم بەرهەمەیدا ژیاوە. وەك نوسەریش لە بواری رۆژنامەگەری بە ئەندامەتی دەستەی نوسەرانی گۆڤاری مرۆڤایەتی، بە نوسین لە رۆژنامەی كوردستانی نوێ و گۆڤار و رۆژنامەكانی تردا توانیوێتی لەو بوارەی كە حەزی پێدەكات مەبەستەكانی بگەینێتە خوێنەرانی..

یەكەم بەرهەمیشی لێكۆڵینەوەیەكە بە ناوی (ئەدەب لە رۆژنامەی كوردستانی نوێدا) كە لە دوا پلەی كۆلیجدا وەك نامەی دەرچون لێی وەرگیراوە و هەر بەهۆی ئەو چالاكییانەو رۆڵی وەك خوێندكارێك لە بواری روناكبیر و هەوڵەكانیدا بووە، كە ساڵی 1999 بڕوانامەی رێزلێنانی لەسەرۆكایەتی زانكۆكەوە پێدرا، ئەوەش بۆ خۆی سەلیقەی نوسەریی ناوبراو دەرئەخات و دەرگای جیهانێكی كراوە و نوێی بۆ دەكەنەوە.

دەستخۆشی لەكاكە سالار مەحمود دەكەم و هیوادارم، ئەوانە سەرەتای بەرهەمی زیاتر بن.

## تێبینی

ئەم نووسینە پێشەكییەكە بۆ كتێبی زانكۆو كۆمەڵگە كە 22 باس و وتار لەخۆدەگرێت، كۆمەڵەی خوێندكارانی كوردستان چاپ و بلاویان كردۆتەوە و كتێبەكە لە نووسینی (سالار مەحمود)ە.

# دیمانەو گفتوگۆیەکی هەمەلایەن لەگەڵ مامۆستا مەحمود مەلا عززەت

**سازدانی: پێشڕەو ئەحمەد**

*مامۆستا رۆژباش و ئەگەر قبوڵت بێ دەمانەوێت گفتوگۆیەکی هەمەلایەنەت لەگەڵ سازبکەین؟

-بەخێرهاتنێکی گەرمتان لێ دەکەمو جێی خۆشحاڵیە، هیوادارم لەم شێوە وتوێژو پەیڤینانە سودێك ببەخشین بەهەموو لایەك.

*بەتەنها مێژوو، لەگەڵ چەندین پێناسە رادەوەستێت، ئەوەش دیدوبۆچوونی ئەو بیریارو فەیلەسوفە دەریدەخات کە پێناسەی بۆ دەکات، لێرەدا مامۆستا مەحمود کامەیان پێشدەخات؟

-بەلای منەوە مێژوو: "تۆماری رەوت و کاروانی گۆڕان و رووداوەکانی رابردووی گەلە" وەکو پێناسەیەکی گشتی، لەناو ئەو پێناسە گشتیەشدا، ئەگەر بێینە سەر وردەکارییەکانی، ئەوا دەتوانرێ بگوترێ: تۆماری سەرجەم رووداوو خەباتی بەش و چینەکانی کۆمەڵە لەقۆناغە جیاجیاکانی مێژووی ژیانیدا، لەپێناو بەدیهێنانی سەرجەم مافە نەتەوایەتی و ئابووری و سیاسیەکان، بۆ گواستنەوەی بارو گوزەرانی کۆمەڵگە بۆ قۆناغێکی نوێ و پێشکەوتوتر، کەلەناویاندا رۆڵی گرنگ و هەستیاری سەرکردەش دەگرێتەوە. بەو پێیە مێژوو ئاوێنەی ژیانی کۆمەڵگەیە لەرابوردویدا، کە گەشەکردنە هەمەلایەنەکانی دەردەخات. دیارە هەر زاناو فەیلەسوفێك لەدیدو تێڕوانینی تایبەتیی خۆیەوە دەڕوانێتە مێژوو، هەریەکەشیان لەروانگەی خۆیەوە پێناسەی دەکات.

*وەرگرتنی میتۆدێکی زانستی لەنوسینی مێژوودا کارێکی پەسەندو بەبایەخە.. بۆ مێژووی کوردو گرتنەبەری میتۆدێکی زانستی چی دەڵێن؟

-لەراستیدا مێژوو وەك پێناسەمان کرد: تۆمارکردنی روداوەکانی رابوردوو، رابردوی نزیك و رابردووی دوور دەگرێتەوە... گرتنەبەری رێبازێکی زانستیانە بۆ مێژوو هەروەها نوسین و نوسینەوەی مێژو بەرەچاوکردنی گشت لایەنە پۆزەتیف و نێگەتیڤەکانەوە مەرجێکی بنچینەیی و سەرەکین بۆ دەرخستنی راستیی رووداوو گۆڕانەکان، خۆبەستنەوەی مێژوونوس بەپرنسیپەکانی مەنهەجی زانستانە لەلێکۆڵینەوە کۆمەڵاتیەکاندا سەنگی رادەو ئاستی زانستێتی نوسینەکە دەردەخات...

قسەکردن بەزمانی بەڵگەنامەو ئامارو سەرچاوەی رەسەن بایەخی زانستیانەی مێژووەکە سەنگینتر دەکات. نوسینەوەی زانستیانەی مێژوو واتە تۆمارکردنی ئەوەی روویداوە، نەك ئەوەی حەزو خواستی نوسەرەکەیەتی، رابوردوی نزیك سەرچاوەو کەرەستەکانی یارمەتیدەر بن بۆ نوسینەوەی زانستیانەی مێژوو، زیاتر لەبەردەستدابن و ئاسان بن، هەندێکیش لەخەڵکەکەی زیندوون، بۆ نمونە لەرووداوەکانی کۆماری دیموکراتی کوردستاندا هەتا ئێستاش خەڵکانێك هەن کەلەسەردەمەکەدا ژیاون و لەوتەمەنەدا بوون کەئێستا گەلێ رووداویان لەبیرماوە، بەتایبەتی بۆ ئەو بەشەی ناوی "مێژووی زارەکییە" کەتا ئێستا وەك بەرنامەیەکی زانستیانەی نوسینەوەی مێژوو، لای ئێمە نیەو کاری بۆ نەکراوە، ئەوە نەبێت کەتاك و تەك وەك کاك ئەمیر حەسەن پوور لەدەرەوەی ولات لەگەڵی خەریکە.. کە بتوانن رووداوەکە باسبکەن و ئێستا ببە سەرچاوە، لەگەڵ سەرجەم ئەو نوسین و بڵاوکراوەو بەڵگەنامانەی سەردەمەکە کە بۆمان بەجێماوە، یا توانراوە بپارێزرێن، وەك نموونەش ئەوانەی لەبەرگەکانی دەوڵەتی جمهوری کوردستاندا دەیبینین، لەگەڵ کۆمەڵێك لەو بروسکەو نامانەی کە لە نێوان دیپلۆماتەکانی



پێشڕەو ئەحمەد، مامۆستا مەحمود مەلا عززەت — سلێمانی 1998

سەفارەتی دەوڵەتانی پەیوەندیدار بەمەسەلەکەو وەزارەتی کاروباری دەرەوەدا ئاڵوگۆڕکران، لەوانە: ئەمریکا و ئینگلیزو سۆڤیەتی رووخاو و هەندێ لەکۆمارەکانی ئاسیای ناوەراست و ئێران.. لەبەرگی سێیەمی دەوڵەتی جمهوری کوردستاندا چەند لەو بروسکەو نامانە بڵاوکراونەتەوە... پاشان رۆژنامەکانی ئەو سەردەمە ((رۆژنامەکانی کوردستان.. گۆڤاری کوردستان، گۆڤاری نیشتمان(بڵاوکراوەی بیری کۆمەڵەی ژێ کاف) و گۆڤاری هەڵاڵەو

گۆڤاری گروگاڵی منداڵی کورد))، ئەمانە سەرچاوەیەکی دیکەی رەسەن بۆ ئەو بابەتە پێکدەهێنن.. ئیتر سەرچاوەی مێژوویی رێك بەو شێوەیە دابیندەکرێ‌و دەبێتە بنەمایەکی زانستی بۆمەنهەجی نوسینەوەی رووداوەکان.

بەڵام بۆ مێژووی کۆن "مێژووی سەدەکانی کۆن بۆ کورد" بەلای منەوە تێگەیشتن لەبارودوخەکە زۆر ئاڵۆزو دژوارە، ئەویش بۆ دوو هۆ دەگەڕێتەوە: یەکەم: ئێمە سەربەخۆ نەبووین‌و نەبوینەتە خاوەن دەوڵەتێکی کوردی، بەمەش نەمانتوانیوە سامانی کلتوری‌و نەتەوەیی خۆمان بپارێزین. دووەمیش: بەجۆرێك داگیرکراوین کەبەهەموو شێوەیەك ویستوویانە ناسنامەی کەسێتیی کوردی بسڕنەوەو سامانی مێژوویی ئێمە بشێوێنن‌و لەناویبەرن.

لەبەرئەوەی لەو رووداوە کۆنانەی مێژوومان‌دا بۆ نموونە: لەمیرنشینی بابان کە (مێژوویەکی نوێ‌و نزیکە ئەگەر بەراوردی بکەین بەمێژووی دێرینتر) ئەبوو سەرچاوەی زۆرمان هەبوایە، لەکاتێکدا ئەو میرنشینە لەناوچەی سلێمانی‌و دەوروبەریدا بووە یان لەوکاتەوە سلێمانی دروستکراو کرایە پایتەخت، دەبوایە سەرچاوەی زۆر هەبوونایە کەچی دەبینین دەگمەنترین‌و بەناوبانگترین‌و سەنگینترین سەرچاوەی مێژوویی ئەو سەردەمە ئەوەی "مستەر ریچ"ـە (مەبەستم گەشتەکەی کلۆدیۆس جیمس ریچە بۆ عێراق‌و کوردستان لەساڵی 1920)، بەواتا تا ئاوڕبدەینەوە لەدوورترو لەدواتر، ئەرکی نوسینەوەی مێژوو لەرێی زانستیەوە "کەئاشکرایە مەبەستم لەرێگەی زانستی پشت بەستن بەبەڵگەو دۆکۆمێنت‌و سەرچاوە رەسەنەکانە" دژوارو بەئەرك‌و زەحمەتتر دەبێ لەبەرئەوەی مێژوویەکی تارادەیەك زانستیانەتر دەبێ ئەگەر سەرچاوە لەبەردەستابن، ئەگەر بەڵگەنامەکانی سەردەمەکە لەئارادا بن، ئەگەر پرنسیپە زانستیەکان پەیڕەوبکرێن. تا سەرچاوە کەمتربێ، لایەنی زانستی لەنوسینەوەی مێژوودا لاوازتر ئەبێ.

*مامۆستا بێگومان لەکاتی نوسینەوەی مێژوودا کۆمەڵێك گرفت دێتە رێی مێژوونووس کە وای لێدەکات زۆربەی کات پەی بەئاکامی مەبەستەکانی نەبات. لای ئێوە ئەو گرفتانە چین‌و چۆن دەتوانرێت روبەڕوویان ببنەوە؟

-گرفتی بەردەم نوسینەوەی مێژوویی بۆهەر رووداوێك جیایە، یا گرفتەکانی لێکۆڵینەوە لەدیاردەکان جیان، بۆ نموونە گرفتی لێکۆڵینەوە لە شۆڕشی ئەیلوول بۆ هەرەس یان لەشۆڕشی نوێ بۆ کوردستانی فیدراڵ ئاسان دێتە بەردەست چونکە یەکێك لەگرفتە سەرەکییەکان، دواکەوتوویی‌و نەخوێندەوارییە کەنەبێتە هۆی نەبوونی سەرچاوە.

لەساڵی (1961)ـە وە لەناوکاروانی سیاسی کوردیدا ژیاوم، دەزانم خەڵکێك هەیە بایەخی داوە بەکۆکردنەوەی ئەو رۆژنامەو بڵاوکراوانەی لەوسەردەمەدا دەرچوون، خەڵکێك هەیە ئامادەی کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی سەرچاوەکانە، نووسەر هەیە ئامادەیە "هەرچەندە تائێستا زۆرکار نەکراوە" لەسەر ئەو رابوردووە بەچاوێکی رەخنەگرانەی واقیعی بنوسێ‌و هەڵەکان پێش چاو بخات، ئیتر ئەو هەڵانە هەر کەس‌و رێکخراوێك کردبێتی. بەگشتی گرفتەکان نەبونی سەرچاوەیە بەپلەی یەکەم.

دووەم: نەبوونی مەڵبەندی توێژینەوەی زانستیی، بەڵام بۆ ئەم سەردەمە ئەو شێوە مەڵبەندە هەیەو زەمینەیەکی زۆر باشە بۆ لێکۆڵینەوەی زانستیانەی لایەنە مێژووییەکان، ئەگەر بتوانین بیانکەینە مەڵبەندی ئازادو سەربەست... کەمی یا نەبونی ئەم جۆرە دامو دەزگایانە لە نەبوونی دامودەزگای روناکبیری، کەمی قوتابخانەو پەیمانگاو دانیشتگاو زانکۆوەیە، لەنەخوێندن‌و کەمی خوێندەوارییەوەیە.. تا گەشە بەخوێندن‌و خوێندەواریی بدەین، ئەو لایەنانە لەگەشەدا ئەبن‌و ئاستی زانستیی خەڵکانی روناکبیر لەکاروانی روناکبیریدا بەرزترو کاری نوسین باشترو زیاتر ئەبێ، دیدی بابەتیانەو هەڵویستی بێلایەنانە، خۆنەدانە بەردەم سۆزی خۆشەویستیی گەل‌و نیشتمان کەمرۆڤ لەلایەنە تاریك‌و کەموکورتی‌و هەڵەکان دووردەخاتەوەو وای لێدەکات چاویان لێ بپۆشێ‌و تەنیا لایەنە گەشەکان ببینێ، ئەوانە هەندێ کۆسپی تری سەرئەو رێبازەن. کەوا بوو:

-یەکێك لەگرفتە هەرەسەرەکیەکانی بەردەمی زانستیانەکردنی نوسینەوەی مێژوو، نامۆبوونمانە بەمێژووی کۆن، چونکە داگیرکەران چۆنیان گەرەك بووە وایان نوسیوەتەوە، خۆمان دەورمان نەبوە لەنوسینەوەیدا.

-گرفتێکی تری بەردەم ئەوکارە، دابڕانە لەمێژوو، نەبونی تۆمارێکی مێژوویی یەککگرتوی بەردەوامە، هەر وەك چۆن رووداوەکان، راپەرین‌و شۆڕشەکان، دامەزراندنی میرنشین‌و قەوارەکان ناوچەیی بوون، ئەم پارچەیە دابڕاو بووە لەپارچەکانی تر، بەو پێیەش مێژوەکەمان ناوێتەیان بووە...

-بوونی بۆشایی‌و دابڕان لەنێوان رووداوە مێژووییەکاندا، بەهۆی کارەسات‌و رووداوە کاروان وەرچەرخێنەرەکانەوە، بەهۆی هێرش‌و پەلاماری ئەم دوژمن‌و ئەو دوژمنەوە، بەهۆی لەناوچونی سەرچاوەو شوێنەوارە مێژووییەکانەوە.

-لاسەنگیی نێوان تێڕوانین‌و دیدی زانستیانە بەرامبەر بەسۆزو لایەنگیری، وەك دژە کرداری کاری داگیرکەران، دوورکەوتنەوە لەرەچاوکردنی زەمین‌و زەمانی رووداوەکە دەبنەهۆی دورکەوتنەوە لەواقیعی رووداوەکان..

*لەخەباتی رزگاریی کورددا بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی، زۆر جار بزوتنەوەیەکی خێڵەکی بۆتە دەسەڵاتدارو وەك رێبەری ئەو بزوتنەوەیە دەوری وەرگرتووە، دەبێ ئەم پەیوەندی‌و هاوبەشییەی نێوان جەماوەرو خێڵ‌و عەشیرەت یاخود دەستەیەکی بنەماڵە بەڕای ئێوە چۆن بێ تاسەرکەوتن بەرقەرار بێ‌و بزوتنەوەکەش راستەرێ وەربگرێ؟

–هاوبەشی کردن لەخەبات هەر لەکوردستاندا بەو شێوەیە نییە، بەڵکو لەزۆر ناوچەی دیکەدا ئەو دیاردەیە هەیە. ڕەنگە لەرۆژهەڵاتدا زیاتر پۆلێنکردن و لایەنگیری ببینن. کەئەو دیاردانە زیاتر دەرئەخات... ئەگەر نمونەیەکی بچوك بێنینەوە لەلایەنێکی خەبات، کەسیاسەتە، لەسوید بەرەچاوکردنی جیاوازییەکان زۆرکەس کەلەسیاسەت دەدوێن نەفرەتی لێ ئەکەن، چونکە ئەبینن بەڵێن زۆر ئەدرێ و لەئاکامدا ئەنجامنادرێ... وەك لەهەڵبژاردندا هەر حزبە دێتە ناو جەماوەری خەڵك و بەبەرنامەی سەدان خاڵییەوە بەڵێنی کاریان پێ ئەدەن کەچی کەپرۆسەکە تەواو ئەبێ ئەوانیش فایل دائەخەن و لەگەڵێ بەڵێن و پرۆژە بێ دەنگ رائەوەستن.

جا لەکوردستانی ئێمەدا هۆ زۆرە، لێرە هۆی ئەو دابەشبوون و دانیشتن و دابڕانەی خەڵك جیاوازە وەك لەو وڵاتەو وڵاتانی تر، بەپێی خەسڵەتە تایبەتیەکان.

بەرای من زۆرە، یەکێ لەوانە سەختیی خەبات لەکوردستاندا بەهۆی ئاڵۆزیی کێشەی کوردو دابەشکردنی کوردستان و پارچە پارچەکردنی فرە دوژمنییەوە، بەهۆی نابەرابەریی عەقڵی سیاسیی کوردو سەنگی کورد لەگەڵ داگیرکەراندا لەلایەك. لەلایەکی ترەوە بەهۆی ئەوەی ئەو شۆڕش و راپەرینانە لەسەر زەمینەی رەسیوی خۆیان بۆ رەخساندنی هەلومەرجی بەرپابونی شۆڕش، نەبووە. بۆ نمونە لەساڵی 1961 کەشۆڕشی ئەیلول بەرپابوو من بۆ خۆم لەپۆلی چواری زانکۆ بوم. وەکو راستییەکی ئەو سەردەمە مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان لەگەڵ بەرپابونی شۆڕشدا نەبوون.. ئێمە کەدەهاتینەوە بۆ سلێمانی وەك خوێندکاری زانکۆ دابەشئەبووین بەسەر رێکخراوەکاندا بۆکاری رۆشنبیری و پتەوکردنی رێکخستن و گەشەپێدانی هۆشیاریی نەتەوەیی و بەرزکردنەوەی.. بۆیە ئاگاداری هەندێ لەرووداوەکانی ئەوسەردەمە، ئاگاداری لایەکی نامەگۆڕینەوەو جۆری قسەکردنیانم... لەیەکێ لەونامانەی مەکتەبی سیاسی هەرچەندە چەند ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی راستەوخۆ لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشدابوون لەوانە مامجەلال و عومەر دەبابە، بەڵام ئەوانی تر لەدژی شەڕبون و راستەوخۆو ئاشکرا رایانگەیاند کەلەدژی شەڕن و بۆ لقی سلێمانی- یان نوسیبو ئەم شۆڕشە شۆرشی دەرەبەگەکانە زۆر لەناوی دەرەبەگەکان لەو نامەیەدا بەنوسینی پیتی یەکەمی ناوو ناوبەنگ ناوبرابون، لەوکاتەدا ئێمە کۆمەڵێك لاوی خوێن گەرم بووین، دوای تێشکانی هەردوو دەربەند دژی مەکتەبی سیاسی بوین و پێمان وابوو ئەوانە لەگەڵ شۆڕش نین و ئەبێ لابرێن... لەو روداوانە زۆرجار نەخوڵقاندنی هەلومەرجێکی شیاو بۆ بەرپابونی شۆڕشێك، خۆی لەخۆیدا سەرەتایەکی هەڵەیە و ئەنجامێکی باشی نابێت "مەبەستم ئەو ئەنجامەیە کەخۆت چاوەڕوانی دەکەیت جاری وا هەیە پێچەوانە دەبێتەوە.. بۆیە لە 1961 دا شۆڕش دەستی پێکرد لە 1963 دا گفتوگۆو لە 1964 دا ئینشیقاق و جیابونەوەو شەڕی ناوخۆی لێکەوتەوە، ئەوە سەرەنجامی هەڵەکە بوو.

هەروەها شکستی بەردەوام کاری لەناخی کەسایەتی کورد کردوە کەلەسەرەتاشەوە بەزەلیلی لەناو سەدەها ساڵەوە بەتێکشکاوی هاتووە ئەو کەسایەتییە تێکشکاوەش ئامادە نیە کە بەو هەموو کێشەو ئاڵۆزییەوە بەرامبەر بەو داگیرکەرە لاسەنگ و نابەرابەرانە بوەستێ و بەرگەبگرێ، ئیدی ئەبینین خەڵك کۆڵئەداو دائەنیشێ... لەلایەکی تر شۆڕشی چەکداری زەمینەکەی ناوچە شاخاوییەکان بووە، هەرچەندە خەڵکی شار دەستیان پێ کرد رێبەرو روناکبیر بوون، چونکە هەندێ لەهەلومەرجەکانی خەبات لەو ناوچانەدا بوون نەك لەشار هەندی جاریش توێژاڵێکی (خوێندەواری شار کەمتر بڕوایان بەشەڕی چەکدارییە، زیاتر هەڵگری ئالای خوێندن و روناکبیرین، مێژونووسی بەناوبانگ محەمەد ئەمین زەکی بەگ نمونەیەکی دیارە بۆ ئەم قسەیەمان..

*پێدەچێت ئەو مەسەلانەی باستکردن بەشێك بن، بۆمان دەربخات کە زۆربەی حاڵەتەکانی دروستبونی بزوتنەوەی کوردی، بەکەموکورت، یاخود لەبەردەم پرۆسەی کرداروو دژەکرداردا هەڵسورابێت، دەکرێت بڵێین: شۆڕشکردن پرۆسەیەك بووە هەمیشە بەئاڵۆزی و کەموکورتییەوە لەدایکبووە؟

–راستە، بۆچی دژە کردار بووە؟ هۆ زۆرە، هۆ سەرەکی و بنچینەییەکەی ئەوەیە کەدوژمن لەهیچ کات و شوێنێکدا هیچ دەرفەتێکی نەهێشتۆتەوە بۆ کورد جگە لەدەستدانە چەك نەبێت، مەبەستم ئەوەیە کە رێبازی دیموکراسی و دەرگای گفتوگۆی ئازادانە داخرابوون و داخراون... ئیتر جاری وا هەبووە دژە کردار بووە یا زۆربەی جارەکان دژە کردار بون، ئەگەر دژەکردار نەبووبێ ئەوا هەلومەرجەکان رەسیو کامڵ نەبون. گونجاو و سازنەبوون لەبەر ئەوە لەدایکبونێکی ناسروشتی بووە.

*هەست و هۆشی نەتەوایەتی زۆر لاواز بووە؟

–بەڵێ یەکێك لەو هۆیانە لەکۆن و ئێستاشدا لاوازیی هۆش و هەستی نەتەوایەتی بووە، واتە بنەماکانی دروستبونی نەتەوە سەقامگیر نین، هۆشیاریی سیاسی خەمڵیو وباڵاکردو نەبووە.

*پاشان شەڕەکان شەری بەرگری بوون و تەحەدایان تێدا نەبووە... تەنها حاڵەتی بەرگری کردن لەخود ستراتیژ بووە، هەلومەرجی گواستنەوەی شەڕ بۆ دەرەوەی کوردستان بۆناوچەی داگیرکەر لەئارادا نەبوەو کار بۆ رەخساندنی نەکراوە، بۆیە زیانەکان گەورەو قەبە بون؟

–بەڵێ ئەوە بەیەکێك لەهەڵەکانی ستراتیژی شۆڕشی کورد دائەنرێ کەخاڵێکی زۆر گرنگە... چونکە شۆڕش بۆ بەدیهێنان و پێکانی کۆمەڵێك ئامانج بەرپاکراوەو هەندێ بەرنامەی بۆ دانراوە. کەئەو ئامانجانە نەهاتونەتەدی ناچاربووە بەرگری لەخۆی بکا، نەیتوانیوە تەحەدا بکات... ئەگەر بڕوانینە مێژووی کورد دەبینین هەمیشە

شەڕەکەی بەرگری بووە، خۆ ئەگەر شەڕی بگواستایەتەوە بۆ دەرەوەی کوردستان ئەوکاتە قورسایی و زیانی شەڕ بۆ بەرامبەر دەردەکەوت و قازانجێکی باشی دەبو، ماڵوێرانی و کوشت و کوشتار لەکوردستان دور دەخرایەوە یان کەمتر دەبووەوە. قورسایی زیاتر دەخرایە سەر ناوچەی دوژمن و دەبووە فاکتەری گوشاری هەمەلایەنە.

*شەڕەکانیش شەڕێکی بەرەیی نەبوون یان لەسەرخاکی کوردستانیش بێت هەر شەڕی بچوک-ی بزۆزو پارتیزانیی بوون؟

-بەڵێ چونکە توانای نەبووە، تەنانەت ئێستاش هەلومەرجی شەڕی بەرەیی لەئارادا نیە.

*کاری بەزانستکردنی مێژووی کورد ئاسان نیە لەکاتێکدا ئەو هەموو کێشەیە هەیە بەرای بەرێزتان چ کاتێك ئەو ئەرکە بەجێ دەگەیەنرێ و گرفتەکانی لەچیدا دەبیننەوە؟

-وەك ئاشکرایە لەنوسینەوەی مێژوودا دووڕێبازی سەرەکی هەیە (ئایدیالیزم و ماتریالیزم) لەپێناسەی نوسینەوەی مێژوی ڕێبازی ئایدیالیزمدا جیاوازە لەبەرامبەرەکەی... ئەو ململانێیەی نێوان ئەو دوو ڕێبازە لەکۆنەوە تا ئەمرۆ بەردەوامە.

بۆ کورد لەبەر گەلێك هۆ، لەوانە: نەبوونی دەوڵەتی سەربەخۆ، گەشەکردنی لایەنەکانی کۆمەلایەتی لەمێژووی کوردا ئاسایی و سروشتی نەبووە، بۆیە لەناو ئەودوو ڕێبازەدا نوسینەوەی زانستیانەی مێژووی کورد گەشەی نەکردوە، ئەو دوو ڕێبازە لەناو میللەتانی تردا شوێنەواریان بەشێوەیەکی بەرچاوتر دیارە.

من پێم وایە ئەو کارە لەدوای دروستبوونی دەوڵەتی سەربەخۆو بلاوبوونەوەی دیموکراسی و ئازادیی وشە لەکوردستاندا بەبەرنامە دەستی پێ ئەکرێت. لەم ولاتەی ئێمەدا کەچەندین گرفت هەیە، هەموو دەزگایەك فشاری لەسەرە، توندڕەویی خەلکی لەبیرکردنەوەدا، تەواو ڕێگەنەدان بەخەلکی کەبەئازادانە بیربکاتەوەو بنوسێت، ئەگەر کەسانێك هەبن، یا تەنانەت ئەوانەی ئازادانە بیردەکەنەوەو زانستیانە ئەنووسن، زۆرجار لەزۆربواردا هەلوێستە دەکەن... با بۆ نمونە بلێین ئەمرۆ نووسەرێك ئەیەوێت لێکۆڵینەوە لەسەر ڕووداوێکی 30 ساڵ لەمەوبەر بکات، ئەو ناچار ئەبێ لەوململانێ زۆرەی لەم ولاتەدا هەیە هەلوێستە بکات و بیربکاتەوە لەوەی تاچەندێ ئەو نوسینە هەڕەشە نابێت بۆسەر ژیانی، ڕاستەخۆ نابێتە هۆی گیانلەدەستدانی یان نابێتە هۆی ئەوەی کەسبەینێ کارێکی تری لەوشێوەیەی کردو قسەی لەسەر مەسەلەکانی تر کرد، مەترسی لەسەر دروست نەبێ.

کەوابوو ڕێبازی زانستییانە تەواو لەژێر سایەو سێبەری دەوڵەتی سەربەخۆو دیموکرات و ئازاددا زەمینەی رەخسیوی خۆی بۆ دەخولقێ تا ئەوکاتە هەوڵی تاکەکەس هەیە لەمەوبەریش هەر هەبووە، محەمەد ئەمین زەکی و محەمەد عەلی عەونی و مامۆستا رەفیق حلیمی و د. کەمال مەزهەرو... چەندینی تر ئەمانە هەمووی کاری لەوشێوەیان ئەنجامداوە.

بۆیە بەگشتی رام وایە کەئەگەر کێشەو ترس نەبێت، ئەوا ڕەنگە زیاتر خەلك بنوسن.

*ئەمە لایەنێکەو گرفتی تر هەیە، نەبوونی دەزگایەکی تایبەت و تەرخان بۆ لێکۆڵینەوەو بەزانستیکردنی مێژوو؟

-بەلێ ئەگەر بروانین ئەمرۆ چەندین شێوە ڕێنوس بەکاردەهێنرێ لەبلاوکراوە کوردیەکاندا، سەرنج بدەن ئێستا لەشاری سلێمانی 31 گۆڤارو ڕۆژنامە دەرئەچێت و زیاتریش، ئەگەر لەنوسینەکان بروانی، چەندین جیاوازی لەنێوانیاندا هەیە، بۆ نموونە لەوشەیەکی ئاسایی لێکدراودا لەکۆنەوە دەیان ساڵە خەلکی ڕێکەوتووە لەسەر ئەوەی وشەی لێکدراو بەمانا لێکی ئەدەی و وشەی لێکنەدراو واتە بەجیا، فەرمون سەرنج بدەن لەهەر گۆڤارێکدا چەندین هەلەی لەم بارەو بابەتە هەیە. مەبەستم ئەوەیە ئەگەر دەزگایەکی زانستی هەبێ ئەم شێوازانە ناهێلێ و ئەبێتە سەرچاوە بۆدارشتنی زمانێکی یەکگرتوو. ئەمرۆ لەکوردستانی فیدراڵدا پێویستە دەزگایەکی زانستی بۆ ئەولایانانە دابمەزرێنرێ، سەیرم لێ دێ کە کار بۆ ئەوە نەکراوەو ناکرێ.

*دروشمی نەتەوەیی کورد واتە گوتاری سیاسی کورد بەردەوام لەدابەزین و هەستانەوەدا بووە، هۆکارەکانی دیارن، بەلام لەناوەراستی ئەم سەدەیەوە ڕاستەوخۆ لەدروشمی سەربەخۆییەوە چووە ئۆتۆنۆمی.

-لەراستیدا دروشمی نەتەوەیی لە بزوتنەوەی نەتەوایەتی و نیشتمانی کورددا بەردەوام لەگۆرانکاریدا نەبووە، بەلکو بەپێی پلەو قۆناغەکانی خەباتی کورد چەند شێوەیەکی بەخۆوە گرتووە، بۆ نموونە لەسەردەمی (شێخ عوبەیدوڵلای نەهری)دا، دروشمەکە دروشمی دامەزراندنی دەولەتی سەربەخۆ بووە، ئەگەر دوورتر بڕۆین، لەمیرنشینی باباندا لەسەردەمی هەندێ لەمیرەکان لەوانە ئەوڕەحمان پاشاو ئەحمەدپاشا بەئاشکرا بۆ سەربەخۆیی کاریانئەکردو هەولیانئەدا... لەسەردەمی شێخ مەحمود دا دیسان سەربەخۆیی ئامانج بووە. ئەگەر شێخ لەسەرەتاوە ملی بدایە بۆ نیمچە سەربەخۆیی ڕەنگە ئەمرۆ ئێمە خاوەنی مێژوویەکی دیکە بووینایە.

بەلام شێخ مەحمود لەسەرەتادا لەسەربەخۆیی کوردستان پاشەکشەی نەکردووە، دەیویست کوردستان بەکەرکوك و سەرچاوەکانی نەوتیشەوە بگرێتە ژێر دەسەلاتی خۆی... لەپلەی یەکەمی حوکمڕانیدا 1918- 1919 کەشەڕ دەستییێکرد ئەوە نەخشەی بووە، لەپلەی دووەمی حوکمڕانیدا (1922- 1923) دوای یەکەم مانگ لەحوکمدارەوە بوو بەمەلیکی کوردستان.

ئیتر پلەی سێیەمیشی لە (تەموزی 1923- 1924) بۆ ڕوخان... لەپلەی دووەمی حوکمڕانی شێخ مەحمودا پاش ئەوەی کەدلنیابوو ئینگلیزەکان نایەڵن کورد سەربەخۆ بێ، بووە بەبڕیار

کەباشووری کوردستان بەعێراقەوە ببەستنەوە، ئیتر بەنیمچە سەربەخۆیی ڕازی بووە، بەڵام ئەوەشیان بەکورد ڕەوا نەبینی.

دەمەوێت ئەوە بڵێم کەرازیبوونی شێخ، یەکەم: لەو واقیعەوە بوو کەبەسەریدا فەرزکرابوو، دووەم: دەیزانی کەئەوەش نابێت... ئەوە یەکێکە لەهۆی سەرەتاکانی ئەو پاشەکشێیە، کەبەتەواوی نەگونجا و دواتر لەکۆماری میللی مەهاباد-دا بەتەواوی گونجا. مەبەستم قایلبون بو بەدروشمێکی نوێ کەخودموختاری بوو. ئەویش بەو شێوەیەی کەئەوەندەیان پێ ڕەوا بینیوە بۆ کۆمارەکەی کورد لەمەهاباد.

تەنانەت سۆڤیەتییەکان دەیانویست بیکەنە ناوچەیەکی خودموختار لەناو خودموختاریەتی ئازەربایجاندا واتە ببێتە پاشکۆی پاشکۆ. لەبەرئەوە دەبینین بەکردار بەو شێوەیە بووە، خودموختار بوە، بەڵام لەڕوی بەڕێوەبردن و نوسینەوە، نیمچە سەربەخۆیی هەبووە لەبەرئەوەی بەرەسمیی ئیعلانی جیابوونەوەو دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ نەکرا، داوای دانانی بەو دەوڵەتەدا نەکرا، لێرەدا دەبێ ئاماژە بەخاڵێك بدەم، کاتێك ئینگلیز بیری دامەزراندنی حکومەتی شێخ مەحمودی بەستەوە بەحکومەتی بەغدا، ئیتر بیری ئۆتۆنۆمی چەکەرەی کرد، پاشتر بەدامەزراندنی حزبی دیموکراتی کوردستان "کەلەسەرەتاوە ئێرانی پێوەنەبوو دواتر پێوەی لکێنرا" پارتی دیموکراتی کورد- لەعێراق، ئەوان بوونە میراتگری ئۆتۆنۆمی لەکوردستان و هەتا ئێستاش ئەودوانە لەو ئەقلیەتەدا ئەژین. پارتی دیموکراتی کوردستان لەپاش ئەزمونی کوردستانی فیدراڵ و دوای هەڵگرتنی دروشمی فدراڵی و بڕواهێنانی بەفدراڵی، ئێستاش بڕوایان وایە کەچارەسەری مەسەلەی کورد هەر لەبەغدایە، لەکاتێکدا ڕژێمی بەغدا نەك بە فدراڵی و ئۆتۆنۆمیش ڕازی نیە، بگرە لەسەر نەخشەی لەناوبردنی کورد و سیاسەتی بەعەرەبکردنی کوردستان بەردەوامە، سەرنج بدەن و بزانن تا ئێستا و لەو وەزعەشیدا ڕژێم چ پرۆسەیەکی ترسناك لەکەرکوك و دەوروبەریدا ئەنجامئەدات. ئێستا لاوازبوونی تێندێنسی نەتەوەی کورد سەرچاوەکەی نەبوونی بەرەیەکی یەکگرتووی لێپرسراوە لەسەر ئاستی کوردستانی مەزن، نەبوونی ستراتیجێکی لێکۆڵراوە. تێکشکانی یەك لەدوای یەك و فرەدوژمنی و کۆمەك و هاوکاریان، ئەمانە هەمووی خەڵك وا لێ ئەکات بیر لەچارەسەرە ناوەندییەکە بکاتەوە کە تا دووبارە تووشی کارەسات نەبێتەوە. بەڵام ئەگەر بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد داوای سەربەخۆیی بکات، من بڕوام وایە 90٪ بۆ 95٪ خەڵکی کورد لەگەڵ ئەو دروشمەدایە و ئامادەیە خەباتی بۆ بکات، ئەگەر هەلومەرجەکان لەباربن، ئەویش ئەگەر ئەو بەرەی کوردستانیە دابمەزرێ بەو ستراتیجەوە کەشیاوی جڵەو گرتنە دەستی ئەو ڕێبازە بێ.

*جا حزبی کوردی خەیاڵ و بەرنامەی دەوڵەتی کوردیی لەبیردایە، یاخود بڕوایان وایە بەبچووکی بمێننەوە؟

-من پێم وایە زۆربەی حزبەکان گەیشتونەتە ئەو قەناعەتەی کەسەربەخۆیی بۆ ئەم سەردەمە دەستنادات، ئەویش زیاتر لە لێکدانەوەی هەلومەرجی ئیقلیمی و نێونەتەوەییدایە، بەڵام مەسەلەی سەربەخۆیی کەشیا و نیەو دەستنادات بۆ ئەم سەردەمە شتێکەو دروشم هەڵگرتن شتێکی ترە...

منیش لام خراپە ئەمڕۆ باس لەهەنگاونان بۆ سەربەخۆیی ئەم فدراڵە بکەین چونکە مەترسی لەدەستچوونی بۆ دروستدەبێ، بەڵام بەرزکردنەوەی دروشم و کارکردن بۆی ئەرکێکی مێژوویی و نەتەوەییە.

هەڵەی گەورە لەم مەسەلەیەدا هەر لەحزبی کوردیدا نییە، بەڕای من، بەڵکو لەڕوناکبیران دایە بەپلەی یەکەم، دواتر لەخەڵکیدایە... چونکە ڕۆشنبیری کورد حزبی و ناحزبی، ڕێی داوە بەو هەڵانە تێپەڕبین، پێویستە ڕۆشنبیران بێنە پێشەوەو ڕەخنە بگرن، هەرچەندە دەبێ باجەکەش بدەن، ڕەنگە قسەیان پێ بگوترێت و بخرێنە خانەی ناحەزەوەو لێبدرێن، من بۆ خۆم لە (1964، 1966، 1983، 1984، 1991) دا هەڵوێستم لەهەڵە قەبەو بەزیانەکان هەبووە، بەڵام باجەکەیم داوەو بڕیاریشم داوە هەربەو شێوەیە بم، بۆیە پێم وایە ئەگەر ڕۆشنبیر بەهەڵە بڵێ هەڵەو بەخیانەت بڵێ خیانەت، ئەوا تەواو ئەرکی خۆی بەجێ هێناوە، هەروەها ئەگەر ڕۆشنبیران ئەو ڕێگە دروستەیان گرتەبەرو ئەوەیان نوسی، جەماوەریش لێیان تێ دەگەن... ئاوهەوایەکی باش بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵە، بۆ ڕێگە نەدان بەتێپەڕکردنی هەڵە دێتە ئاراوە.

*مامۆستا بەوسیفەتەی بەڕێزتان پسپۆڕی مێژووی کۆماری میللی مەهابادن و خاوەنی لێکۆڵینەوەی تایبەت و سێ بەرگ لەبەڵگەنامە ئەرشیفییەکانی ئەو کۆمارەن، وەك ئاشکراشە کۆماری میللی مەهاباد هەڵگری کۆمەڵێك خسڵەتی نوێ و جیاوازە لەپێش خۆی بەتایبەتی و لەپاش خۆشی، پرسیارەکەمان لەچۆنیەتی وەرگرتنی ئەو خەسڵەتانەیە ؟ کەئەوانیش:

1-سیستەمی کۆماری کەبۆ یەکەم جارە لەمێژووی کورددا کاروبارەکانی کورد خۆی لەسیستەمی کۆماریدا ڕێك بخرێ!

2-گواستنەوەی خەباتی ڕزگاریخوازی کوردی لەبزوتنەوەی خێڵەکی و پەرتەوازەی چەکداری شەڕی خێڵەکان بۆ ناوحزب و ڕێکخستنیان لەهەرەمی حزبدا.

3-گۆڕانی دروشمی نەتەوەیی بۆ ئۆتۆنۆمی، وەك باسمانکرد.

-دیارە ئەزموونی کۆمارەکەی مەهاباد چ وەك دامەزراندنی کۆمار لە 2ڕێبەندان (22ی ژانویەی) 1946 و چ وەك ئەزمونێکی مێژوو پێش ئەوسەردەمە ئەتوانم بڵێم لە (1942)ـەوە دەوامی هەبووە تا دامەزراندنی کۆمار و پاشان لەدامەزراندنەوە تا هەڵوەشاندن، چونکە دوای هاتنی لەشکری سوور بۆ هەندێ ناوچەی ئێران و کوردستان بەهاتنی ئەو لەشکرە ڕۆشنبیرانی کورد کەوتنە جووڵە لەپەیوەندیکردن و هەوڵدان بۆ دامەزراندنی

ڕێکخراوێك، باشووری کوردستان ڕۆڵی کاریگەری بینی بۆ پێگەیاندنی هەلومەرج لەدامەزراندنی کۆمەڵەی (ژ. ك)دا، کورد لەوسەردەمەوە جۆرێك لەئۆتۆنۆمی خۆی هەبووە. جۆرێك لەئیدارەی خۆی هەبووە لەو بەشەی کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا.

*مەبەستت ئەوەیە لەئەنجامی دروستبوونی ئەوبۆشاییە ئیدارییەی کەلەکشانەوەی مەئمورانی دەوڵەتی ئێران لەوناوچانەدا دروست بوو، ئەو ئیدارانە دروستبوون؟

-بەڵێ بەزمانی کوردی کەوتنە چاپەمەنی بڵاوکردنەوە، لەوانە ڕۆژنامەی کوردستان کەپێش دامەزراندنی کۆماری کوردستان، ژمارەی یەکەمی لە10-1-1946 (واتە دوازدە ڕۆژ پێش دامەزراندنی کۆمار) دەرچووە. گۆڤاری کوردستان، هەڵاڵە، گروگاڵی منداڵانی کورد... ئەم ئەزموونە کۆمەڵێك گۆڕانی تازەی هێنایە کایەوە، بۆ نموونە دامەزراندنی ژێکاف (1942)، کە ڕێکخراوێکی نوێ بوو لەبزوتنەوەی نیشتمانیی کورددا ڕێکخراوێکی سیاسی دروشمێکی گەورەی نەتەوایەتی (دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەکگرتوو سەربەخۆ بوو بۆ کورد) بەرزکردبۆوە کەبۆ ئەوسەردەمە بەتایبەتی لەڕۆژهەڵاتی کوردستاندا دەستپێشخەرییەکی دیار بوو. ئەو جۆرە دیاردە نوێیانەی کەئاماژەت پێدان (لەسیستەمی کۆمارییەوەو دامەزراندنی حزبێك کە حزبی دیموکراتی کوردستانە لەسەرجەستەی (ژێ کاف) کەئەوەش لەڕواڵەتدا، گواستنەوەی جۆری پێکهاتەو دروشمی جوڵانەوەکە بوو لەشتێکی نوێدا. بەڵام واقیعەکە واقیعی کۆمەڵایەتی و چینایەتی وەك خۆی مابۆوە، ئەم جۆرە گۆڕانانە، پرۆسەیەکی دوورودرێژی گەشەکردنە هەمەلایەنەکانن لەمێژووی نەتەوەدا. پاشان دانانی ئاڵا نەك گۆڕانی ئاڵا واتە دانانی ئاڵایەکی نوێ بۆ کورد، پاشان یەکێك لەو تایبەتمەندییانەی هەبوو کە بە پاشەکشێ دائەنرێ لەبزوتنەوەی کورددا هەڵگرتنی دروشمی خودموختاری بوو کەمن پێم وایە ئەوکاتە سۆڤیەت هەر هێندەی بە ڕەوا دەبینی. ئەم جۆرە دیاردە نوێیانە لەبزوتنەوەی نیشتمانی کوردیدا چەند هۆو یارمەتیدەرێك بوون بەرێخۆشکەری لەدایکبوونیان، یەکێك لەوانە هۆو دیاردە نێو دەوڵەتیەکە بوو، جەنگی دووەم کۆتایی هات، ململانێ لەسەر ئێران دەستی پێکرد، و هەر لەسەرەتاوە لەساڵی 1941 کەهێزەکانی سۆڤیەت و ئینگلیز لەباکورو باشوری ئێرانەوە هێرشیانکردە سەری.

ئەم دیاردانە خۆی لەخۆیدا یارمەتیدەرێکی گەورەبوون بۆ ڕەخساندن، پاشان بوونی کۆمەڵەی ژێکاف وەکو دیاردە تایبەتیەکەو دامەزراندنی حزبی دیموکرات لەسەر داروپەردوی ڕێکخراوی (ژێکاف)، وەکو ڕێکخراوێکی سیاسی تازە کەدروشمی واقعی هەڵبگرێت، هۆیەکی گرنگ بوو، دواتر پێشەوا وەك سەرکردەیەکی لێهاتوی ڕۆشنبیرو کۆمەڵایەتی و وەك ڕابەرێکی ئاینیی لەکایەدا بوو، سەرەك عەشیرەتەکان ئامادەبوون لەژێر فەرمانڕەوایی ئەودا دابنیشن و خەباتبکەن.

لەمەهابادا هاندەری هەرەسەرەکی، مانۆڕێکی سیاسی ئامانج ئابووری بوو... یەکێتی سۆڤیەت هەر لەسەرەتاوە کەهاتە ناوەوە ئامانجێکی ئابووریی هەبوو، وای ئەویست لەئێراندا بمێنێتەوە بەڵام بەستراببۆوە بەکۆمەڵێك ڕێکەوتننامەوە، لەوانە وا بڕیاربوو کە شەش مانگ دوای شەڕ، هێزەکان لەخاکی ئێران بکشێنەوەو یەکێتی خاك و سەروەریی دەوڵەتی ئێران بپارێزن. لەبەرئەوە سۆڤیەت پێویستی بەوەبوو کەدوای ئەو فشارەی کەخرایە سەری، بڕیاری پاشەکشێ بدات... ئیتر ئەبێ چی بکات بۆئەوەی بەرژەوەندی بمێنێ و ئیمتیازی نەوتی پێ ببەخشرێ ئەوەبوو (کۆماری ئازەربایجان)ی دامەزراندو لەدوای ئەویش ئیعلانی کۆماری دیموکراتی کوردستانیان کرد! (لێرەدا حەزدەکەم تێبینیەك بدەم ئەویش ئەوەیە کەوشەی کۆمار تازەیە ئێمە وەرمانگرتووە، ئەگینا لەوکاتەدا ئەو وشەیە بەکارنەهاتووە، زیاتر بەجمهوریەتی کوردستان ناودەبرا، دوای ئەوە بەچەندین ساڵ وشەکە هاتۆتە ناو قاموسی سیاسیی جمهوریەتەکەوە).

هەرلەو سەردەمەدا زۆر ناوی تری هەبوو لەوانە: کۆماری میللی مەهاباد، جمهوریەتی کوردستان حکومەتی میللی کوردستان، دەوڵەتی خودموختاری کوردستان، دەوڵەتی جمهوری کوردستان...تاد. بەڕاستی تا ئێستا من هیچ بەڵگەنامەو بڕیارێکی ڕەسمیم نەکەوتۆتە بەرچاو بۆ ناونانی کۆمارەکە.

بۆ ئاڵا.. ئازەریەکان ئاڵایان هەبوو ئیتر کوردەکانیش پێویست بوو ئاڵایان هەبێت... هەرچەندە ئاڵا پێش کۆمار هاتۆتە ئاراوە، من لام وایە ئەو ئاڵایە ئاڵاکەی ئێرانەو سەرەوخوار کراوە هەرچەندە هەندێك لەڕۆشنبیرانی کوردستانی ئێران زۆریان پێ ناخۆشە. جگە لەوە بڕوام وایە ئارمەکەش، وەك لەیەك دووشوێن باسم کردوە، ئەویش هەر جۆرێکی لەوەرگرتن و خواستن تیا هەبێ، چونکە کۆمارەکانی ناوسنوورو ژێردەستی یەکێتی سۆڤیەت هەموویان لەو شێوە ئارمەیان هەبووە، بەکەمێ ئاڵوگۆڕ لەوردەکاریدا، ئەگینا کڵێشەی سەرەکیەکە وەك یەکن.

ئیتر بۆ گۆڕانی دروشم: بارودۆخی ئەوسەردەمە.. یەکێتی سۆڤیەت، ئازەربایجان خۆی فشاری گەورەبوو لەسەر کورد کەدروشمەکەی بگۆڕێ... بەگشتی سێ دروشمی زۆر ناقولاو نەشیاو بەسەرکوردا سەپێنراو... کەبۆ کورد سێ ستراتیجی هەڵبوون:

1-ئۆتۆنۆمی (خودموختاری).

2-بەرگریکردن لەخۆو نەچونە پێشەوە، بۆیە شەڕەکانیش شەڕی بەرگری بوون بەناچاری.

3-خۆبەستنەوە بەگفتوگۆی بێ ئەنجام کەتاران بڕواشی پێ نەبووە.

*یارمەتینەدانی خەڵکانی شیعە مەزهەب لەوانە خەڵکی کرماشان بۆ کۆماری میللی مەهاباد رۆڵێکی دیکەی بینی لەوەستانی ئەزمونی کۆمار لەناوچەی موکریاندا، بەهۆی جیاوازیی مەزهەبی ئاینییەوە، کەهیچ هاوکارییەکیان نەکرد؟

-بەڵێ کرماشان زۆر دوور بوو لەکۆمارەکەوە ئەگەر لەنەخشەی کۆمارەکە بڕوانیت، دەبینی تەنانەت سەقز کەزۆر لەکۆمارەوە نزیکە، کرابووە زەمینەی لەشکرکێشی و پیلان لەدژی کۆمار، واتە لەنێوان شیعەکان و کۆماری میللیدا ناوچەیەکی بەرفراوان و سونە مەزهەب هەبوون. بەڵام لێرەدا چوار هۆ هەیە بۆ دابڕانیان لەکۆمار ئەوانیش:

1-ئینگلیزەکان لەوناوچەیەدا بون و نەیاندەهێشت پەرەبسێنێ.

2-جۆرێك لەرێککەوتن- ی "جەنتلمان" هەبووە لەنێوان سۆڤیەت و ئینگلیزدا کەهیچ لایەکیان زیاتر نەبەنە پێشەوە و نەچنە ژێر دەسەلاتی یەکترییەوە... واتە ئەو سنورانەی نێوان هێزەکانیان بپارێزرێ.

3-ئەو ناوچانە زیاتر ناوچەی عەشایەرو خێڵەکی بون و زیاتر لەگەڵ دەوڵەتدا هاوکاربوون نەك لەگەڵ جوڵانەوەی نیشتمانی کوردیدا.

4-کۆمار خۆیشی سیاسەتی فراوانکردنی ناوچەکانی تری نەبوو تاسود لەزەوی و خەڵکی ئەو ناوچانە وەربگرێ.

*سەرکردایەتی سیاسیی کوردی بەلاوازیی چۆتە ناو گفتوگۆو دانیشتنەکانەوە لەوانە نمونەی کۆماری مەهاباد، ئەوەتا قازیی نەمر لەیەکەم سەردانیدا بۆ باکۆ دەڵێ:"میللەتانی زۆرلێکراوو بێ دەرەتان ئەو دەستە ئەگوشن کەبە مەبەستی یارمەتیدان بۆیان درێژ دەکرێت، ئێمە نەك ئەو دەستە ئەگوشین بەڵکە ماچیشی دەکەین؟" لەمەدا ئەگەر لەدڵسۆزیشەوە بێت، پێم وایە لای بەرامبەرەکان بەلاوازیی ئەژمێردرێ؟

-لای من قازی محەمەد پیاوێکی زۆر ئازابوو، ئەگەر ملی بدایە بۆ سۆڤیەت یا بۆ تەورێز ئەوا روداوەکان بەجۆرێکی تر گوزەریان دەکرد، بەڵام قازی محەمەد دەرکی بەوە ئەکرد کەئەو جمهوریەتە بەبێ سۆڤیەت و بەبێ ئازەربایجان ناژێ... فیرقەی دیموکراتی ئازربایجان"حزبی کۆمۆنیستی ئازەری" وەکو "تودە" وابوو، حزبێکی دیموکرات نەبووە وەك حزبی دیموکراتی کوردستان، قازی محەمەد ئەو دەستماچکردنەی لەپێناو کۆماردا باسکردووە، چاتەو دەستماچکردنەش بۆ ئەوەیە کەکورد ئەو قەوارەیەی بمێنێتەوە نەك لەزەعیفییەوە، چونکە ئەگەر ئەو دەستماچکردنە بۆ کات و سەردەمی داڕوخان بووایە، ئەوا ئەوە دەبووە هەڵەو لەکەی مێژوویی.

*هیچ دەنگی شەڕی ئازەری- کوردی نییە لەوکاتانەدا، گەر هاتبێتە بەر گوێ یادەستت لەبەڵگەنامەیەکدا؟

-لەوکاتەدا ململانێ لەسەر ناوچە سنورییەکان هەبوو. تادواییش مایەوە، ئەو ناوچە سنورییانە بووبونە جێی مشتومڕ، ئازەرییەکان ئەیانویست کۆمارەکە بەرەسمی لەژێر دەستی خۆیاندا بێت، کەئەوە نەبوو، ئینجا ئەیانویست بەرەبەرە لەناوچە سنوریەکان بچنە پێشەوە، زۆرجار ئەو ململانێیە کەوتۆتەڕوو. قازی محەمەد لەیەکێ لەسەفەرەکانیدا بۆ تەورێز کە ئەگەڕێتەوە باسی ئەوە ئەکات کەچۆن فشاریان خستۆتە سەری کەدەبێت کورد لەناو ئازربایجاندا بێ. لەسەفەرێکی تردا باسی ئەوە ئەکات چۆن ئەو خەڵکانەی ئەو ناوچە سنورییانە لەخۆی، سەڵماس، میاندوواو، ورمێ ئاڵای کوردستانیان هەڵکردووە، پاش ئەوەی رێککەوتنەکەی تاران- تەورێز ئیمزاکراو بڵاوکرایەوە کەلە 13بەند رێککەوتن باسی مافی کوردی تیا نەبوو، لەیەك بەندا نەبێت کەئەڵێت: کورد بۆی هەیە قازانج لەم رێککەوتنە وەربگرێ و تاپۆلی چواری سەرەتایی بەزمانی کوردی بخوێنێت...

ئازەرییەکان هەوڵیانئەدا سوود لەو وەزعە وەربگرن و ئاڵای کوردستان لەو شوێنانە دابگرن، لەبەرئەوەی کورد لاواز بوو بوو، مەرکەزیەتی ئازەربایجان بەهێزبوو، بەڵام خەڵك نایەڵێت و بەڵێننەدەدەن تادوا دڵۆپی خوێنیان ئەو ئاڵایە شەکاوە بێت... کەوابوو ململانێ پێش کۆماریش هەبووە دوای ئەوەش بەردەوام بوو، وەلەزۆر کۆنەوە بەردەوامە، فارسەکان ئەوکارە بەئازەرییەکان دەکەن، لەبەرئەوەی ئازەرییەکان ململانێی ئێرانچێتیان لا بەهێزترە لەکورد، هەرچەندە کورد لەو سەردەمەدا زۆر لاوازبووە چونکە نەخوێندەواری زۆربووە لێرەدا ئامارێ بەنموونە دەهێنمەوە کەلەساڵی 1956 دوای 10 ساڵ لەروخانی کۆمار ئامادەکراوە دەڵێ: 95٪ی کوردستانی ئێران و 80٪ی کوردستانی عێراق و 90٪ی کوردستانی تورکیا نەخوێندەوارن.

رەنگە ئەو 95٪ ە لە 98٪ یش بێت لەهەندێ ناوچەدا.

*رەنگە لەدێ یەکی 300ماڵیدا تەنیا مەلاکەی خوێندەوار بووبێ؟

-بەڵێ ئەمە کاریگەری و رۆڵی هەبووە لەهەندێ حاڵەتا لەبێدەنگبوونی کورد لەسنوورداریی داگیرکەران و وردە وردە هاتنەپێشەوەیان لەدوای روخاندنی کۆمار.

*لەمەڕ ئاسایشی سەردەمی کۆمار لەیەك سەرچاوەدا خوێندومەتەوە، ئەویش پێم وایە بیرەوەرییەکانی قەوامو سەڵتەنەیە باس لەوەدەکات کەتەنها یەك کاری تیرۆر لەو سەردەمەدا کراوە ئەویش رێتێناچێت هۆیەکی سیاسی لەپشتەوە بووبێت، ئێوە بۆ مەسەلەی ئاسایش لەو سەردەمەدا چی دەڵێن؟

-بەگشتی کاری کوشتن هەبووە بەڵام وەك تیرۆری سیاسی نەبووە ئەوەی کەباسی دەکەی" غەفوری مەحمودیان" ئەوە بەسیاسی لەقەڵەم دراوە، پێم وایە پەیوەندیی هەبوو لەگەڵ

ئینگلیزەکانداو سۆڤیەت دەستی لەوکارەدا هەبووە... ئەمیش بازرگان بووە.

بەڵام بۆخەڵکی تر (گرتن و کوشتن) لەرادەیەکی زۆرکەمدا هەبووە، بۆنموونە گرتن لەسەر مەسەلەی بازاڕ کوشتنی جوتیار لەلایەن ئاغاوە حاڵەتێکی وا لەبەڵگەنامەکانی دەوڵەتی جمهوری کوردستاندا دەبینرێ و لەسەر ژن و ڕەدوکەوتن هەبووە... بەهەشتی میرزا مەنگوڕی لەکتێبەکەیدا (بەسەرهاتی کورد) لای منەو کۆمپیوتەر کراوە، ڕەنگە لەگەڕانەوەمدا ئامادەبێ بۆ چاپکردن، باسی خۆی دەکات کەبەهۆی ڕۆیشتنی حەمەرەشید خانەوە (16) ڕۆژ ئەگیرێت، دیسان باسی چەند کەسێکی تریش دەکات کەگیراون هاوکات لەگەڵ ئەودا کەژمارەیان (50) کەس بووەو سەید پیرە لێپرسراوی بەندیخانەکە ئەبێت.

*وەك ئاشکرایە کۆمەڵێك لەخێڵەکانی دەوروبەری کۆمار لەو بڕیارە پاشگەزبوونەوە کەدابویان بۆ مانەوە لەگەڵ قازی محەمەد لەکاتێکدا بینیان مەترسی لەسەر کۆمارەکە هەیەو بەپەلە خۆیان گەیاندە لای ئەرتەشی ئێران لەوانە (هەرکی و شوکاك) رای بەرێزتان لەم بارەیەوە چییە؟

-راستە گەڵێ سەرەك خێڵ و هۆز ئەو هەڵوێستەیان گرت... بەڵام کۆمەڵێك خێڵی تر لەکاتی ڕوخان و دوای ڕوخانی کۆماردا، کەوتنە یارمەتیدانی ئەرتەش، عومەر خانی شکاك، سەرداری ئێڵەکە، دانیشتبوون دووره پەرێزبوو، قازی محەمەدیش لەبەرچاوی بووە کەئەگەر ئەو هەنگاوەی نەنایە چۆن خێڵەکان مەهابادیان تاڵاندەکرد... دەگوترێ ئەمەش هۆیەکی ترە کەوای لەپێشەوا کردووە خۆی بەدەستەوە بدات.

بەنیسبەت ئازربایجانەوە شەڕی گەورەی تیابوو، جەماوەر بەرەنگاری ئەرتەش بووبووەوە، بەڵام سەرکردایەتیەکەی هەر زوو پێش ڕووخان رایکرد. لام وایە یەکێتی سۆڤیەت پێی ڕاگەیاندن کەبەرەو ئەوێ رابکەن.

*بەڵێن درابوو بەقازی محەمەد کەگیانی پارێزراو دەبێت؟

-ئەڵێن گوایە بەڵێنێکی لەوبابەت و شێوەیە لەلایەن سەرتیپ همایونی سەرلەشکری 4ی کوردستان بەقازی محەمەد دراوە دیسان دەگوترێ قەواموسەڵتەنە، جۆرە بەڵێنێکی بەسەدری قازی دابوو.

*ئەو گفتوگۆیانەی دەسەڵاتی کۆمار و حکومەتی ناوەندی بەجیاو سۆڤیەت بەجیا هیچ تروسکاییەکی باش، یا هەوڵێکی پۆزەتیڤی تیابەدیکراوە؟

-نەخێر وەك رەسمیات هیچ دۆکۆمێنتێك لە ئارادا نیەو هیچ باسێکی باشە نەکراوە لەسەر کورد، لەوانە، جارێك سەیفی قازی لەگەڵ وەفدێکی تەورێزیدا ئەچێت بۆ تاران، کە دەگەڕێتەوە باسی هەڵوێستی تاران ئەکاو دەڵێ: کەهیچ نادەن بەکورد... میرزا مەنگوڕی-ش لەکتێبەکەیدا باسی ئەوە ئەکا. لام وایە هیچ کاتێك نەلەو سەردەمەو نەلەدواییشدا، کورد هەلومەرج و زەمینەو کاتی لەباری بۆ پرۆسەی گفتوگۆ هەڵنەبژاردوە، بۆیە هەمیشە بەزیان و زەرەرەوە لێیدەرچووە.

*قسەیەك هەیە گوایە قازی محەمەد لەدواجاردا کەبارزانی گەڕاوەتەوە بۆلای، قەناعەتی پێکردوە تا بڕوات لەگەڵیاندا بۆ سۆڤیەت، ئەمە تا چەند ڕاستە؟

-نەخێر قازی محەمەد هیچ کاتێك پەشیمان نەبۆتەوە لەو بڕیارەی دابوی بۆمانەوە لەگەڵ خەڵکەکەو جێنەهێشتنی پایتەختی دەوڵەتی جمهوریی کوردستان، لەمزگەوتی عەباسئاغا پێش ئەوەی بڕیاری کۆتایی بدات، دوای ڕوخانی ئازربایجان لەوێ سەرانی کۆمارو حزب کۆدەبنەوە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری "چی بکەن؟". سەرەنجام ئەو خەڵکانەی لەگەڵ بەرگری و بەردەوامی خەبات دەبن، زۆرتر ئەبن، هەربۆیە بڕیارئەدەن بەرگری بکەن. مانەوەی قازی محەمەدیش لەوکاتەدا ئەوەبوو کە بەرگری بکەن لەکۆمار، بەڵام مەرەکەبی سەر کاغەزەکە وشکنابێتەوە، هەرلەناو کۆبوونەوەکەدا کەسانێك دەچنەدەرەوە دەیکەن بەپڕوپاگەندە کە ئێمە شەڕی تارانمان پێ ناکرێ، شەڕی ئەرتەشمان پێ ناکرێ. لەبەرئەوە تەسلیمبین باشترە، ئەو کەسانە ئەندامی بەرزیان تیا ئەبێ لەناویاندا: مەلا عەبدوڵڵای مودەرسی، مەلا حسێنی مەجدی، میرزا ڕەحمەتی شافیعی، شێخ حەسەن شەمسی بورهان، عەلی ئاغای ئەمیر... ئەوەبوو کەعەشایەری ئەمانە یەکسەر تەسلیم بوون.

دوای ئەوەی قازی محەمەد بڕیاری نەگۆڕو چەسپیوی خۆی دا، ڕۆژێ پێش کارەساتەکە مەلا مستەفا چووبووە لای و پێی گوتبوو: چاك وایە لەگەڵمان بێیت...

بەڵام قازی محەمەد ملی نەدابوو، چونکە مەلامستەفا کارێکی ڕەسمی لەمەهاباد پێنەسپێردرابوو، تەنها نازناوی جەنەراڵیەتەکەی پێدرابوو، هەندێ جاریش لەگەڵ سەیفی قازی-دا ئەچوو بۆ بەرەکانی شەڕ، ئەگینا نەئەوو نەهیچ کوردێکی عێراقی، هیچ پۆستێکی ڕەسمیی دەوڵەتیان پێ نەدرابوو... بۆیە ئاسانئەبوو پێشەوا مل بۆ کارێکی وابدات، ئەگەر بیریشی لەجێهێشتنی مەهاباد بکردایەتەوە.

*دەچینە نێو مەلەڤ دیپلۆماسێتی لەفەرهەنگ و مامەڵەی کوردایەتیدا، لەکوێوە دەست پێبکەین و خاڵەکانی لاوازی و کەمتەرخەمی لەم بوارەدا کامانەن؟

-بەلای منەوە دیبلۆماسێتی وەك زانست و وەك هونەر لەهەوڵی سیاسی و پیادەکردنی لەواو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نێودەوڵەتیی هەرێمەکان یان کێشەکانی نەتەوەیەك یاکۆمەڵێك لەگەڵ دژەکانیاندا، ئەوە لای کورد بەمجۆرە وەك هونەری مامەڵەی سیاسی و کاری دیبلۆماسی نەبووە، بایەخ و گرنگیی خۆی پێ نەدراوە، لێکۆڵینەوەی لەبارەوە نەکراوە، بۆیە دیبلۆماسێتی کوردی هەرلەکۆنەوە تائێستاش لاواز بووە بەشێوەیەك لەکۆندا زۆر لاوازو لەمرۆشدا گەلێك بۆشایی تیا ماوەتەوە.

هۆی سەرەکی لەلاوازیدا، مەسەلەی ئاستی گەشەکردنی عەقڵی کورد خۆی و روناکبیری، لەگەڵ ئاستی گەشەکردنی کۆمەڵگەی کوردەواری کەرۆڵی خۆیان بینیوە لەنابەرابەریی عەقڵی سیاسیی کوردیدا لەگەڵ بەرامبەرەکانیدا.. کورد کەمتر دەرکی بەو بوارانە کردوە، زیاتر لەناو بیرو کاری چەکداری و سنورەکانیدا ژیاوە.

*بەڵێ... ناوەکەیم نایەتەوە یاد کام سەرەك خێڵ لەگفتوگۆدا کورسیەکەی هەڵدەگرێ و بەو شێوەیە باسی کێشەی سیاسی کورد دەکات؟

-ئەوە زیرۆبەگ دەبێ کەکاتێ لەسەر شاری ورمێ، لەکۆنسوڵخانەی سۆڤیەت، مشتومڕدەکرێت، لەسەر بیروڕای ئازەرەکان ئەو دەمەی (ورمێ)یان بەشارێکی ئازەربایجان دادەنا، ئەویش کورسیەکە دەخاتە ناوڕاستی ژوورەکەوەو دەڵێ: جەنابی ماشمۆف ئێستاکە ئەم ژوورە هی تۆیە دەکرێ ئەم کورسیە لەناوەڕاستی ئەم ژوورە بەم جۆرە دابنێم و بڵێم ژوورەکە هی منە؟

مەبەستی ئەوەبوو کەورمێ لەناوەڕاستی کوردستاندایە دەوروبەری هەموو کوردن بۆیە ناکرێ بەبەشێك لەئازەربایجان دابنرێ. ئەوە نمونەیەکی ساکارە بۆ مامەڵەی ساکار لەگەڵ بەرامبەردا.

ئیتر بەردەوام عەقڵی سەربازی زاڵ بووە بەسەر لایەن و بڕیاری سیاسیدا، نەك هەر لەبەر ئەوەی شوێنەواری تایفەگەری لەکۆمەڵدا ماوەتەوەو زاڵبووە، بەڵکو لەبەر ئەوەش کەکورد خۆی عاشقی تفەنگ و چەکە، کەتفەنگەکەش بەخۆیەوە دەبینێتەوە دڵشاددەبێ و دەگۆڕێ، گیانی سەربازی و یاخیبوون زاڵدەبێ. لەبەرئەوە بەردەوام لۆژیکی سەربازی و پێشمەرگایەتی و چەك زاڵبووە بەسەر لایەنی سیاسیدا، تەنانەت لەو کاتانەشدا کەسەرکردایەتیی سیاسی دەسەڵاتی تەواوی هەبووە بەسەر هێزی پێشمەرگەدا.

پێم وایە ئێمە لایەنی سیاسی و عەقڵی سیاسیمان لاوازە جا کەئەو لایەنەشمان بەوجۆرە بوو ئیتر دەرکی چارەسەکردنی کێشەکانمان لاواز دەبێ، بۆ نمونە سەیربکە لەم کوردستانی فیدراڵەدا، کەبەلای منەوە گەورەترین دەسکەوتە بۆ کورد، من رام وایە ئەگەر یەکێتیەکەی نێوان هەردوو بەشەکەش نەکرێ و روونەداوەتەوە، بەڵام شەڕو ناکۆکی لابەلابکرێ، بەم جۆرەش بمێنێتەوە هەرباشە، بەڵام بەمەرجێ مافی مرۆڤ پارێزراو بێت و ئازادانەو سەربەستانە بژی و شارستانیانە هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵك بکرێ، هەمیشە یاسا دەسەڵات بێ، باململانێی ئاشتییانەو شارستانییانە بخولقێ، ئەو وەختە یەکێتی ئەڵێ من جیام لەگەڵ پارتی و ئەویش هەروەها...

سەرنج بدەن، دەبوایە پارچەکانی تر ببوونایە بەقەڵا بۆ ئەم ئەزمونە، لەکاتێکدا حزبەکان لەناو خۆیاندا شەڕیانە شەڕەکەیان نامەشروع نییە لەسەر دەسەڵاتە. لای من زۆر غەریبە خەڵك بەنامەشروعی لەقەڵەم ئەدات، شەڕی دەسەڵاتە، شەڕی دەسەڵات لەهەموو دنیادا هەیە... شەڕی زەعامەت نامۆ نیە. بەڵام نامۆ ئەوەیە کەئەو دەسەڵاتە جارێ دەسەڵات نیە! نامۆ ئەوەیە کەئەتوانن دەسکەوت و دەسەڵات لەنێوان یەکتردا دابەشبکەن و سوودی لێ وەربگرن و شەڕی لەسەرنەکەن! سەرنج بدەن چۆن هێزەکانی پارچەکانی تر هەندێکیان نە لەجیۆپۆلیتێکی کوردستان، نەلەبایەخی ئەم ئەزمونە تێدەگەن، ئەرێزیشی لێ دەگرن، نەئامادەشن بەئەزمونەکەی مەهابادا بچنەوەو سودی لێ وەربگرن، مەبەستم ئەوەیە سەرکردەی ئەم حزبانە ئەگەر دەرك بەچاکەو خراپەکان بکەن و لەهەڵسەنگاندندا لێکی بدەنەوە کەکورد تا ئێستا نەگیشتۆتە ئەم قۆناغەی ئەمڕۆ تیایدا ئەژی، ئەبێ هەموو لایەك یارمەتیی بداو هاوکاریی بکات بۆ مانەوەی... لەلایەکی ترەوە دڵنیاین کەرژێمەکەی صەدام هەر صەدام حسێنەکەی جارانەو هەرگیز ناگۆڕێ، ئەگەر بۆیەك چرکە وازی لێبهێنرێ ئەوا کارەساتی هەڵەبجەو ئەنفال دووبارە ئەکاتەوە.

بۆیە دەبێت بڵێین کەدیبلۆماسیی کوردی زۆر لاوازانە مامەڵەدەکات و مەسەلەکان دەبینێ، ئەبوایە ئەم کوردستانی فدراڵە کە لە 1992دا پەرلەمان و حکومەت دامەزرا، تائێستا هەنگاوی گەورەو زۆر باشی بنایە. ئەم دیفاکتەیەی ئەمرۆ سیمایەکی یاسایی نێودەولەتی پێوە دیارە، لەڕوی تیوری و پراکتیکەوە... بەڵام دیبلوماسیەتی کورد لەئاستی گەورەیی مەسەلەکەو مامەڵەی واقیعەکەدا نەبووە. ئەگەر بپرسین بۆچی؟ ئەوا دەبێ بڵێین عەقڵیەتی سیاسیمان نییە، چونکە هۆش و هەستی نەتەوایەتیمان لاوازەو دەرك بەبەرژەوەندییە باڵاکانی نەتەوە ناکەین و حزبایەتی تەسك و بەزیان ئەکەین، بەمەش بەرژەوەندیی گەورەی نەتەوەمان لەبەرچاو نیە، لەبەرئەوە لایەنی دیبلۆماسیمان زۆر لاوازە، ئەگەر ئەم حزبانە بکەونە مامەڵەی جدی ئەبێ گرنگی یەکی زۆر زیاترو فراوانتر بەلایەنی دیبلۆماسی بدەن.

*هەر لەرووی دیبلۆماسیەتی کوردییەوە ناوی شەریف پاشای خەندان هەیە، کەتوانی ببێتە نوێنەری کورد... بەرای ئێوە ئەو هەولانەی شەریف پاشا بەکاری دیبلۆماتی دەژمێردرێ؟

-شەریف پاشا خۆی بەهۆشیاری سیاسیی خۆیەوە هاتە مەیدانەکەو کاری گەورەی ئەنجامداو کوردی بەکۆنگرەی ئاشتی لەپاریس ناساند، برایەتی و ئاشتیی لەگەڵ ئەرمەندا رەخساندو پێکەوە یاداشتیان پێشکەشکرد، کشانەوەی ئەو بەو هۆیەوە بوو کەچەند مەزبەتەیەکیان ناردبوو، گوتبویان تۆ نوێنەری ئێمە نیت بەتایبەت لەشێخ عەبدولقادری نەهرییەوە ئیتر لەداخا دوورکەوتەوە، بەڵام دوای ئەوەش هەر وازی نەهێنا لەپاریس بەردەوام تا ساڵی 1945و کۆچیدوایی داوای مافی کوردی دەکرد.

نموونەی ئەو جۆرە عاجزبوونە لەلای هەندێ میللەت بووە، بۆ نموونە لەسوید پیاوێکی زۆر ناوداریان هەبوو بەناوی (گۆستاف ڤاسای یەکەم) ئەو بڕیاری دا شۆڕش هەڵگیرسێنێ و سوید ڕزگاربکا، لەساڵی (1521)دا دەستنەکا بەگەڕان بەناوچە جوتیارییەکانداو زۆربەی زۆریان ئاوڕی لێ نادەنەوە، ئەویش زۆر عاجز ئەبێ، ئیتر سەر هەڵئەگرێ و بە"جوتداری خلیسکێنە" ئەگەڕێتەوە بۆ شوێنەکەی خۆی... لەپاش ماوەیەك خەڵکی

وشیارو شارەزا لەناو جوتیارەکاندا بیر لەوە دەکەنەوە کەهەڵەیان کردوە لەعاجزکردنیدا ئیتر وادەکەن هەموو پێکەوە بەهەمان شێوەی رۆیشتنی سەربەفر ئەچن بۆ لای و بەڵێنئەدەن لەژێر سەرکردایەتیی ئەودا بن ئەوەبوو لەساڵی 1523دا سوید ڕزگاری ئەبێ. ئەویادە تائێستاش هەیە. یەکەم یەکشەممەی یەکەم هەفتەی مانگی سێ، ئەو بە جووتداری خلیسکێنەیە ساڵانە زیاتر لە دە، پانزدە هەزار کەس لەرێڕەوێکی دەیان کیلۆمەتری‌دا ئەو رۆژە دەبرێتە سەر. سەرچاوەی ئەم نمایش و وەرزشەش ئەو رووداوەیە... جا مەبەستم ئەوەیە بڵێم کەئەو حاڵەتی عاجزبوونە لەهەموو دنیادا هەیە.

دیارە ئەویش چاوەڕوانی ئەوەی کردوە تا کورد باشەی بڵێ و سوپاسی بکات و بیکاتە پاشای خۆی نەك دژایەتی بکات.

*وەك لەپێشەکی "کورتەی مێژووی فەلسەفە" دا ئاماژەتان پێکردووە کەلەبواری فەلسەفەدا لێکۆڵینەوەتان بەدەستەوەیە، لەوێدا لەمەڕ رێبازە فەلسەفیەکانی کوردستان ئەدوێن، ئەو لێکۆڵینەوەیە بەکوێ گەیشتووە؟

–ڕاستە لەو پێشەکیەی بۆ "کورتەی مێژووی فەلسەفە" بەرگی یەکەمم نووسی، ئەو ئاماژەیەم کردوە، بەڵام تا ئێستا لەناو پرۆژەی نوسینەکانمدا سەرەی نەگەیشتۆتێ، سەرقاڵی و کار بۆ ژیان و تەنگوچەڵەمەکان، بواری ئەوەشیان نەداوە بگەڕێمەوە سەربەرگی دووەم کەلەکاتی خۆیدا لەگەڵ ئەوبەرگی یەکەمە ڕەشنووسەکەیم تەواوکرد، ئەو سەردەمەش لەبەردەستکورتی نەمتوانی ئەو کارە بەتەواوی ئەنجامبدەم.

*با بگەڕێینەوە، یەکەم ئەزموونی نوسینت بەچی دەستی پێکرد؟

–ئەزمونەکان و سەرەتای نوسین و نووسەریم بەنوسینی بەیانی سیاسی و ئامۆژگاری و کاری رۆشنبیرکردنی ریزەکانی رێکخستن دەستیان پێکرد، هەرچەندە وردە نوسینم لەڕۆژنامەی "دەنگی کوردو خەبات"دا لەرۆژگارێکی پێشتردا بڵاوکردبۆوە... بۆخۆم ئەوەی لەسەرەتای نوسین و ژیانی نووسەری دادەنێنم زنجیرەی باسەکانی لەمەڕ جمهوریەتی کوردستان بوو، کەبەچەند ئەڵقەیەك لەگۆڤاری "رزگاری (1969– 1970"دا بڵاوکرایەوە ، لەگەڵ گەلێ نوسینی تر بەبێ ناو یان لەژێر ناوی تردا... یەکەم کتێبیش "دیبلۆماسیەتی بزوتنەوەی کوردایەتی" بوو لەساڵی 1973دا بەچاپگەیشت، هەرچەندە پێش ئەم "کۆماری میللی مەهاباد" م نوسیبوو بەڵام ئەمیان دەرفەتی لەچاپدانی بۆ نەخولقا تا ساڵی 1984.

*ئەی یەکەم کاری وەرگێرانت؟

–یەکەم کاری وەرگێران "دەروێشەکان بەدوای راستیدا ئەگەڕێن" بوو، لەنوسینی "مستەفا حەللاج" ئەو ساڵە (ساڵی چاپکردنی دەقە کوردییەکە) هونەرمەندو روناکبیر کاك تەها باراوی لەسەردانێکیدا ئەو چیرۆکەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، باسی ئەوەی کرد ئەگەر بەوەرگێرانی هەستم، ئەوا ئەوان دەیخەنە سەرشانۆ، لەشاری ستۆکهۆڵم، بەتایبەتی لەوەوبەر سەرکەتووانە چەند شانۆگەرییەکیان پێشکەشکردبوو.

کاتێ شانۆگەرییەکەم خوێندەوە، دیمەنەکانی زیندانی هەیئەی خاصەی کەرکوکی دەهێنایەوە یادم، لایەنێکی کارەساتەکانی ئەو دۆزەخەی رژێمی بەعس بۆ کوردی بەگەڕخستبوو، رەنگپێدەدایەوە.

کارەکەم بۆ تەواوکرد، بەڵام دەرفەتی خستنە سەر شانۆی نەڕەخسا، چونکە شانۆگەرییەکە، جگە لەکەسایەتی دەروێش، دووکەسایەتی تری ژن، دوو لێکۆڵەر، یەك حاکمی زۆر بەتوانای گەرەك بوو.. سەرەنجام وازی لەبیرەکە هێنا... منیش بەخەتی خۆم نوسیمەوە، پاشان پێشەکییەکم بۆ نوسی و دام بە کۆمیتەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەسوید تا بۆ خۆیان چاپ و بڵاویبکەنەوە...

چاپکرا... بەڵام تا ئێستاش دوای 15ساڵ، کەشانۆگەرییەکە دەکەوێتەوە بەردەستم و سەیریدەکەمەوە، بەجۆرێ رام دەکێشێتەوە ناو خوێندنەوەی، هەروەك یەکەم و دووەم جار بێت، ئیتر لەدەستم نابێتەوە تا سەرلەنوێ تەواوی نەکەم.

*پرۆژەکانی ترتان کەبەنیازن لەئایندەدا بیخەنە بەرچاو چین، و تاچەند کارت بۆ کردون تا زوترو گونجاوتر دەربچن؟

پرۆژەکانی ئایندە... ئەوانەی کاریان لەسەر دەکەم:

–کورد لەناو مەتەڵی سیاسی بەریتانیادا.

–ئەزمونی زیندانی لە "هەیئەی تەحقیقی خاصە لەکەرکوك و ئەمنی عامە لەبەغدا".

–کورد.. ململانێی دیبلۆماسی، ئەم لێکۆڵینەوەیە لەساڵی 1974–1975 لەشاخ تەواومکردوە، ڕەشنووسەکەی بەگەلێ زیادکردنەوە تائێستا وەك خۆی ماوەتەوە، ئەگەر تەمەن باقی بێتو تەنگوچەڵەمەی ژیان یەخەمان نەگرێ، رەنگە بەپێی ئەم زنجیرەیە، سەرەی بگاتێ.

–جوڵانەوەی نیشتمانی کوردستان 1961–1981 کەتایبەتە بەشۆڕشی کوردستانی عێراق لەڕووە سیاسیەکانیەوە بەتایبەتی گفتوگۆی کورد– رژێمەکان، لەگەڵ ستراتیجی سەربازی و شەڕی پارتیزانی.

*خۆشترین ساتەکانی ژیانت؟...

–لەو رۆژەدابوو کەلەزیندانەکانی ڕژێمی بەعس سەرفراز بووم 1981/6/18. لەگەڵ ڕۆژانی ڕاپەرینە مەزنەکەی کۆتایی زستانی 1991 کەدامودەزگاکانی بەعس لەکوردستان، لەڕەگ و ریشە هەڵکەنران و باشووری کوردستانی تیا ئازادکرا. واتە دوو رزگاربوونی ناو زیندانە بچووك و زیندانە گەورەکە، لەچنگ گەورەو سەرەکیترین دوژمنێك کەتا ئێستا مێژووی کورد بینیبێتی... بۆ من چاوەڕواننەکراوبوو، سەرفرازی خۆم و رزگاری باشووری کوردستان بەو ڕاپەرینە مەزنە، هەرگیز لەبیرمناچنەوە.

*ئەی ناخۆشترین ساتی ژیانت؟...

-لەژیانی سیاسیمدا زۆر ساتی ناخۆش و پڕ لەئازارم بینیووە، (ئەگەر هەڕەشەی مردن و مەینەتییەکانی زیندانەکانی بەعس، بخەمەلاوە) ئەوا ناخۆشترین ساتێك کەتارماییەکەی لەبەرچاوم ئاوا نابێ ئەودیمەنانە بوون کە لەدوای بۆمبابارانی هەڵەبجە بەچەکی کیمیایی و گازی ژەهراوی و دیمەنەکانی رەوەکەی بەهاری 1991 هاتە بەرچاو. ئەوساتانە لەبەردەم شاشەی تەلەفزیۆندا بارانی فرمێسك و قوڵپی گریان وەستانەوەیان بۆ نەبوو... رەنگە ئەو زامە سایکۆلۆجییەی بەرهەمی ئەو دیمەنانە بوو، رۆڵی گەورەی بینیبێ لەو دژەکردارو هەڵوێستەم دژ بەو وتووێژەی راستەخۆ لەناو ئەوکارەساتەی رەوەکەدا کرا... تیایدا نەفرەتم لەو رۆژە دەکرد کەکورد ئاوا دەکەوێتە ناو هەڵەی گەورەوەو بەوجۆرەش سیاسەتی دوژمنی لەبیر دەچێتەوە.

*چۆن پێناسەی ئەم زاراوانە دەکەن؟...

-رەخنە و هەڵسەنگاندن: (لەرێگە بابەتی و زانستییەکەیان)، دیاردەی زیندووی ناو گەشەکردنی رۆشنبیری کاملبوونی کەسایەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی مرۆڤن... بەڵام بەداخەوە تا دێت پەروباڵیان دەکرێ و کەروڵاڵی جێگەیان دەگرێتەوە.

-کۆتایی: سەرئەنجام پێچەوانەکەیەتی و یەکتری تەواو دەکەن.

-تاراوگە: دیاردەی هاوسەری بێ هیوای مرۆڤە.

-کوردستانی فیدراڵ: دواهەڵی مێژووی سەدەی بیستەمە، خەڵاتیان کردووین، کەچی خۆمان زیندەبەچاڵی دەکەین.

-زیندان: بۆ لایەنە سیاسیەکەی: ئامرازی دەستی دیکتاتۆرو تاریکستانی سەربڕی وشەی ئازادە.

سێ پرسیاری هاوپێچ سەبارەت بەسلێمانی

*مامۆستا پێمان باشە چەند پرسیارێك سەبارەت بەسلێمانی وەك شار بکەین. سلێمانی شارێکی شارستانییە، بەو مانایەی شارێك بووە هەر لە سەرەتاوە بۆ پایتەخت دروستکراوە، ئێستای ئەو شارە وەك پایتەخت؛ کەموکورتییەکانی لە چیدا دەبیننەوە؟

-ئەبێ لە پێشەوە ئەوە بڵێم کە هەر شارە، لە کوردستان بێت یان لە هەر وڵاتێکی تر، تایبەتێتی خۆی هەیە، خەسڵەت و سیمای تایبەتی و رابردووی خاوەن مۆرکێکی پێناسراوی خۆی هەیە. جگە لەوە بیروبۆچوون و راکان لەسەر سلێمانی تەنها بە بەراورد لەگەڵ شارەکانی کوردستانی عێراقدایە نەك هەرێمەکەی رۆژهەڵاتی ناوەراست و جیهان.

لە سەرنجدان لە شاری سلێمانی وەك شار و وەك پایتەخت، لەگەڕان بەدوای لایەنە گەش و شارستانی و بۆ دەستنیشانکردنی کەم و کورتییەکانی، ئەبێت تازەیی ئەم شارە، داگیرکردن و مەینەتییەکانی، شەڕەنگێزی دوژمنی داگیرکەر بەرامبەر بەم شارە کە بەردەوام سەرەڕمی کوردایەتی بووەو بە تەعبیری ئەوان سەری مارەکە، ئەو هەموو کارەساتانەی بەسەریاندا هێناوە؛ جگە لە کاری سروشت لە لافاوو ئاگر.. لە بەراوردی سەردەمی دروستکردنی لەسەردەستی ئیبراهیم پاشای بابان (1784 تا رووخانی میرایەتی بابان 1851) کە پێناسەکانی (کلۆدیۆس جێمس ریچ – 1820) بۆمانی دەردەخات، تا سەردەمی حوکمداریی و مەلیکایەتییەکەی شێخ مەحمودی نەمر و رۆژگاری بەزۆر پێوەلکاندنی باشوری کوردستان بە میسیۆپۆتامیاوەو دامەزراندنی دەوڵەت و وڵاتی عێراق بەشێوە نەگونجاوەکەی تا ئەم سەردەمە مێژوییە نوێیەی کوردستان کەوا زیاتر لە 10 ساڵ لە تەمەنی تێپەڕ ئەکات، دەبێت ئەوانە لەبەرچاو بگیرێن.

سەرەڕای ئەوانەی سەرەوە ئەم شارە پلە و قۆناغ بە پلە و قۆناغ گەشەی کردووە، چ وەك شار و پایتەخت، چ وەك دانیشتوان و کۆمەڵگەکەی. جا بۆ ئەوەی کەموکورتییەکان دەستنیشان بکرێن، بەمەبەستی لابەلاکردن و نەهێشتنیان یا بە واتایەکی گونجاوتر، بۆ ئەوەی ئەم شارە گەشاوەو شارستانی و جوان و پازاوەو دڵگیرتر بێت بۆ دانیشتوان و بۆ میوانانی، پێم باشە ئەم کارانە بکرێنە پرۆژەی پلە بە پلەی جێبەجێکردنیان:

1-لە خاڵە هەرە گرنگەکانی رێکخستنی ئەم شارە نەخشەی نوێ و گونجاو و سەردەمانەیە کە دەمێکە باسی دەکرێت و ئیتر کاتی ئەوە هاتووە بە باشی وەکو پێویست بهێنرێتە بەردەم و برگەکانی جێبەجێبکرێ..

2-باخچە و باخ دیمەنێکی هەمیشە جوان و شارستانی دەبەخشێت، ئەو بایەخدانەی ئێستا هەیە بە باخچە و باخچۆڵکەی گەڕەکەکان کە دیاردەیەکی نوێی ئەم سەردەمەی ئەقڵی گەشاوەی کارمەندانی ئەم بوارەیە، سلێمانی پێویستی بە زیاتر سنور فراوانکردنیانە، زیاتر بایەخدان بە جوانکردن و پەروەردەکردنیانە، بەرفراوانتر گردۆڵکە و گرد و چیاکانی دەوری شار بکرێن بە دارستان..

3-وەرزش و بایەخدان پێی و پێشکەوتنی، خواست و ویستێکی گەورەی منداڵ و گەنج و لاوەکانمانە، بۆیە روو کردنە دروستکردنی شوێنی یاری و یاریگا لە هەموو گەڕەکەکاندا، بەتایبەتی یاری فتبۆڵ و باسکێت و ڤالی بۆڵ، پێداویستییەکی هەنوکەییە کە دەبێت لەوە زیاتر دوانەخرێت.

4-یەکێك لە ئەرکە هەرە گرنگەکانی رێکخراوو یەکێتی و دامودەزگا حکومەتییەکان، بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی کۆمەڵایەتی و سیاسی و نەتەوەیی و نیشتمانپەروەرییە، بۆ ئەوەش کردنەوەی کتێبخانەیەك لەهەر گەڕەکێکدا بەتەرخانکردنی هۆڵی تایبەتی خوێندنەوەو کۆمپیوتەرو هەموو پێداویستییەکانی تر.. هتد.

5-کردنەوەی بینا و هۆڵی تایبەتی بۆ هەر گەڕەکێك تا لە بۆنە تایبەتییەکانی جەژن و شایی و خۆشی، سوودی لێوەربگیرێت و ببێتە مەڵبەندێکی حەوانەوە.

6-دانانی نەخشەی هاوکاریکردنی شارەوانی و دانیشتوانی گەڕەك لە جوان کردن و پاکو تەمیزی ڕاگرتن و گوڵو گوڵزار چاندن و فێرکردن و ڕاهێنانی خەڵك لەسەر ئەوە، ئیتر کاتی ئەوە هاتووە کە بکرێتە بەرنامە و کاری لەسەر بکرێت.

7-پەلە کردن لە جێبەجێکردنی بەنداوی چەقچەق کە بڕیارە ڕێکخراوی (قەندیل) پێی هەستێت، چونکە نەك هەر بۆ کشتوکاڵی ناوچەکانی خوار سەرچنار پێویستە بەڵکو بەو کارە ئەو ناوچەیە دەبێتە درێژەبووەوەی سەیرانگای سەرچنار و ڕازاندنەوەی شارەکە.

8-سستمی تەوالێت و ئاو لە ماڵ و شوێنە گشتییەکاندا تەواو کۆن و بە زیان ماوەتەوە، هەقە شارەوانی ڕۆڵی خۆی لە نەهێشتنی ئەوەدا ببینێ بە چەند ڕێگەو شوێنێك بۆ نمونە: مەرجدانان بۆ هەموو خانوو بینایەك کە لەسەر شێوەی نوێ ڕەچاوی خاڵی لای سەرەوە بکات. بە هەمان شێوە بۆ قوتابخانە و دایەرە حکومەتی و چایخانە و چێشتخانە و شوێنە گشتی و سەیرانگاکان پێویستە مەرجی دانانی تەوالێتی هاوچەرخ دابنرێت، هەقە ئەم دیاردەیە سەیرانگاکانی نزیك سلێمانیش بگرێتەوە.

9-نەخشەی پەیکەری پێشمەرگەی وونبوو لە شێوەو شوێنی باش و گونجاودا، ئەرکێکی تری سەر شانی شارەوانییە تا ببێتە ڕەمزی هەموو شەهیدانی کوردستان و مەزارگە بۆ زیندوو ڕاگرتنی بیرەوەرییەکانیان و یادکردنەوەیان.

10-لەبەرئەوەی تا ئێستا دامەزراندن و بونی بانك کە ژیانی ئابووری، بازرگانی و کەسابەت ڕێکدەخات، پێویستییەکی زۆر گرنگ.. هتد ببوژێنێتەوە، جائەگەر داهات و دەرامەتی شارەوانی لەو ئاستەدایە کە بەکارێکی وا هەستێت، ئەوا هەقە شارەوانی لەوەدا پێشەنگ بێ.

*لە چەند نووسینێکتداو بە تایبەت لە کاروانی بێ کۆتاییدا بۆ وەسف کردنی سلێمانی زاراوەو دەستەواژەی شاری شاران-ت بەکارهێناوە بۆ سلێمانی، ئەمە لە کوێوە گەلاڵە بووە، ئایا سلێمانی ئەو بنەمایانەی شاری شارانی تێدایە؟

-وەکو لە پێشەوە گوتم هەر شارەو تایبەتێتی خۆی هەیە مێژوو و کاروانی پێشکەوتن و گەشەکردنی خۆی هەیە، ئەهلەکەش کارەکتەرێکی جیاواز و تایبەتی هەیە، ڕەنگە بۆ سلێمانی لە چاو تازەییدا ئەوانە زۆر گرنگ و هەمیشەیش بووبن، زیاتر لەوانە ئەو تایبەتێتی و ڕووداو کارەسات و ڕەوتە ئاسایی و نائاساییەی دارشتەی سلێمانی وەك شار و وەك دانیشتوانی تیا خوڵقا، جیاوازییەکی بەرچاوتری هێنابێتە ئاراوە چونکە:

1-زەمەن و زەمینی دامەزراندنی سلێمانی مەبەستەکان لێی هەروا کارێکی ئاسایی و سەرپێیی نەبوو، بەڵکو بۆ خوڵقاندنی پایتەختێکی شارستانی و شوێنی جوگرافی و تایبەتی ژیانی ئابووری و بازرگانیی گونجاو لەگەڵ پایتەختێکی دەوڵەتییدا بوو، واتە سلێمانی بە پایتەختی لەدایکبوو، ئەو پێشەنگی پایتەختییە بوو بە ڕەمز و هیواو خەباتی بەردەوامیی دانیشتوانەکەی، بۆیە هەر لە سەروەختی دروستکردنیەوە (1784) تا ئێستا پایتەختی دەوڵەتو حکومەت بووە. لە هەموو سەردەمەکانی میرایەتی بابان تا حوکمداری و مەلیکایەتییەکەی شێخی گەورە تا ئەم سەردەمە زیندووەی ژیانی سیاسی و حکومەتی ناوچەکە، ئەم تایبەتیانەیە هیچ شارێکی کوردستان لەو ئاست و جۆر و بەردەوامییەدا، بەخۆیەوە نەیدیووە.

2-لە سەردەمە جیاجیاکانی داگیرکردن و زەوتکردنی ڕۆڵی پایتەختیدا ئەم شارە، ڕۆڵی پێشەنگی کاروانی سیاسی و ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتی و ئاینی و تەریقەتە جیاجیاکانی مەزهەبی سوننەی بینیوە.

3-لەناو خەبات و هەوڵی چەسپاندنی پێناسەی نەتەوەی کورد و بەدەستهێنانی مافە بنچینەییەکان، پێشەنگی کاروانی جەماوەریی و چەکداری بوە، تا ئەو ئاستەی کە شەڕی شاخ و ڕاپەڕینی شار پێکەوە گرێ بدات. ڕاپەڕینەکەی 6ی سوری گەشی ئەیلولی دوای زنجیرە شۆڕشەکانی شێخ مەحموود سەرەتای ئەو گۆڕانە چارەنوسسازە بووە، کە دواجار، ڕاپەڕین و ڕابوون و سەرکەوتنە مەزنەکەی ساڵی 1991ی لێ وەبەرهات.

لەگەڵ ئەوانەشدا بەردەوام ئەم شارە شاری شاعیر و نووسەر و زانا و مێژوونوس و ڕوناکبیرانی گەورە و ڕۆڵبینەر بووە. خوڵقێنەری شانۆ و تیپی مۆسیقا و کاری هونەریی بووە، بەردەوام لانەی خەڵکانی قسە خۆش و نوکتەزان بووە. تەنانەت شێتەکانی شار هەندێ جار فەیلەسوفانە قسەیان کردووە، بۆ نموونە من بۆ خۆم کە لە کتێبخانەی سلێمانی دەبووم، لە سەردەمی لوتکەی زوڵمی داگیرکەردا کە مەلا فایەق دەهات دەستی دەکرد بە گۆرانی؛ لەوانە: داینێ تۆ داینێ کلاشینکۆفەکەت، کە دەگەیشتە سەر وشەی کلاشینکۆفەکەت، ئاوڕی بۆ دەرەوە دەدایەوە و ئینجا ڕووی تێدەکردینەوە و بە ئەسپایی دانی بە وشەی کلاشینکۆفەکەدا دەنا بێ ئەوەی کەس پرسیاری لێبکات هەر خۆشی وەك وەڵامی پرسیار دەیوت ئەی چۆن تا دوو سێ پیاو چاك فریا دەکەون و دەڵێن. شێتەو لێی مەگرن، من لە سێدارە دراوم. یان دەیگوت سەیرە ئەمانە ئەیانەوێت دارخورما بگوێزنەوە بۆ شاخ و دارگوێز لەبیابان بچێنن، ئاخر چۆن ئەمە ئەکرێت.!

4-یەکەم شار بووە بە فڕۆکەی سەربازی بەریتانیا بۆمبارانکراوە، بانگی حوکمی سەربەخۆیی تیا دراوە.

5-یەکەم شار بووە مەدرەسەی ڕوشدییەی عەسکەری لە سەردەمی عوسمانییەکاندا تیادامەزراوە.

6-ئەم شارە، شاری برایەتی، شاری گونجاوسازانی ئایینە جیاجیاکانی ئیسلام و مەسیحی و جولەکە بووە.

7–سەرچاوەی بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی سیاسی و دامەزراندنی کۆمەڵ و ڕێکخراوی نیشتمانی بووە و پێشەنگی ئەو کارەش بووە بۆ هەندێ شاری پارچەکانی تری کوردستان.

8–کوردستانی جنوبی مەڵبەندی دەرچوواندنی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی بووە لە مێژووی ڕۆژنامە نووسی کوردییدا، کە ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) بووە و لەسەر دەستی مێجەرسۆن هێنرایە ئاراوە.

لەناو کاروانی خەباتی سەرفرازیدا، کە دووچاری بۆمباران و تاقیکردنەوەی چەکی نوێو وێرانکاری و کارەسات و جەنگی سایکۆلۆجی و تۆقاندندا بووە، هەر زوو لە کەمترین ماوە و گونجاوترین هەلدا لەژێر داروپەردووباندا هەستاوەتەوەو ژیانێکی ئاسایی و بەردەوامییەکی بێ پشوودانی خەباتی دەست پێکردۆتەوە. جا ئەگەر هەر شارێك لە شارەکانی کوردستان بە چەند خەسڵەتێك مۆرکی تایبەتی خۆیان خوڵقاندبێت، ئەوا ئەم شارە هەموو ئەو خەسڵەتانەی سەرجەمی شارەکانی تیا کۆبۆتەوە، بۆیە بەهەق بۆتە (شاری شاران) نەك هەر بە ناو، هەر لەبەر ئەوەشە کە نازناوی شاری هەڵمەت و قوربانیشی وەرگرتووە.

*سلێمانیی ئایندە چۆن دەبین و پێشنیارتان بۆی چییە؟

–سلێمانی ئایندە و ئایندەی شاری شاران بەستراوەی ئەو دەست ڕەنگینانەیە کە بە پرۆژە و نەخشەی لێکۆڵراوە ستراتیج بۆ ئەو ئایندەیە دادەڕێژن. ئەم شارە لانکەی ڕۆڵەکانی بووە لە سەرەتای هاتنە بوونیەوە. ئینجا لە ئامێزی گەرم و گوڕ و پڕ لە راز و نیازیدا، گەورە بوون. بۆیە ئەم دڵەی کوردستان پێشەنگ و سەرکاروانی کوردایەتی بووە.

ئەرکی سەرشانی هەمووانە کە بەوەفا بن بۆ ئەم دایکە.. دڵسۆز و بە ئەمەك بن بۆ ئەم پێشەنگە درێغی نەکەن لە خزمەتکردنی تا لەو بوارانەی پێشەوە ئامازەم بۆ کردن، بەردەوام گەشاوە و گەشاوەتر بێت، و ڕۆڵی پایتەختیش لە کیس نەدات.

خەوی من بۆ ئەو ڕۆڵ و ئایندەیەی شارەکەم، سپاردنی ئەو ئەمانەتەیە بەو دەستە پاك و بە ئەمەکانەی دەتوانن چالاك و دڵسۆزانە چییان لە دەست دێت کەمتەرخەمی نەکەن. ڕەنگە ئەوەش بە ئەنجومەنێکی شارەوانیی هەڵبژاردەی بەهێز و نوێنەری دانیشتوان کە هەموو ئەو دەسەڵاتانەی لە دەستدا بێت، کە بتوانێت لایەنە جۆربەجۆرەکانی خزمەتگوزاری بە ئەنجام بگەیەنێت، وەك شارەوانییەکانی وڵاتانی ئەوروپا کە لە نوێنەرانی سەرجەم حیزبە سەرکەوتووەکانی ناو پرۆسەی هەڵبژاردن بە پێی نیسبەتی کەم و زۆری و مسۆگەر کردنی ژمارەی کورسییەکان هاوبەشن تێیدا، ناشڵێم تەواو وەك ئەوان، چونکە جارێ کاتی ئەوە نەهاتووە.. بەڵام هەموو ئەو لایەنانەی پێ بسپێردرێت کە لە سنوری دەسەڵاتی خۆیدایە بە گەڵ لەو لابەنانەی کە ئێستا لە سنوری دەسەڵاتی ئەم وەزارەت و ئەو وەزارەت دایە..



هەڤپەیڤین

# گەشەکردنی باری ڕۆشنبیری و بوژاندنەوەی مێژوو پابەندی دامەزراندن و بوونی دەوڵەتی نەتەوەییە



دیمانە: کازیوە سالح

بەڕێز مەحمود مەلا عزەت ڕوناکبیر و سیاسەتمەدار و نووسەرێکی کوردی دیار و ناسراوە و، خاوەنی بڕوانامەی بەکالۆریۆسی مێژووە، کە ساڵی 1962 لە کۆلیجی پەروەردە لە زانکۆی بەغداد وەری گرتووە. خاوەنی چەندین بەرهەمی بڵاوکراوە و ئامادەیە.

لە بەرهەمە بڵاوکراوەکانی، نووسین و دانراو:

-دیبلۆماسێتی بزوتنەوەی کوردایەتی-1973، خەباتی کرێکاران-1973، کۆماری میللی مەهاباد-1984-1986، ڕەگ و ڕیشەی مێژووی تەقەلای بە عێراقی کردنی کورد و مەسەلەی کوردستان-1987، کورد و ململانێ و ستراتیجی ئاسایشی نەتەوە-1988.

دەوڵەت جمهوریەتی کوردستان بەرگی یەکەم 1992، بەرگی سێیەم 1997.

ئەو بەرهەمانەی وەری گێڕاون:

-شانۆنامەی دەروێشەکان بە دوای ڕاستیدا ئەگەڕێت-1983، جووڵانەوەی ڕزگاریخوازانەی کورد لە خەباتیدا بۆ سەربەخۆیی و نەتەوایەتی و سیاسی-1985-1986، کورتەی مێژووی فەلسەفە بەرگی یەکەم-1986-1988، لەگەڵ دەیان نووسین و لێکۆڵینەوەی بڵاوکراوەی (قازی محەممەد لە ناو بڵاوکراوەی مێژوودا) یەکێکیانە... کە لەگەڵ ئەم دیدەنییەدا بڵاو دەکرێتەوە.

**کازیوە: نامەوێ لە سەرەتاوە دەست پێ بکەم کە کۆتاییەکانیش بۆ خۆیان سەرەتایی دیکەن، بۆ مێژوو بەڵگەنامە مێژوویەکانت هەڵبژارد و ژانرێکی ڕووناکبیری دیت هەڵنەبژارد؟**

محمود م.ع: چیرۆکی دەستکەوتن و بڵاوکردنەوەی ئەو بەڵگەنامانەی سەردەمی جەمهوریەتی کوردستان، لە سێ بەرگی (دەوڵەتی جمهوری کوردستان)دا 1992، 1995، 1997-دور و درێژە.

پوختەکەی لە هەردوو چاپەکەی (کۆماری میللی مهاباد) 1984، 1986، و پێشەکی و نووسینەکانی ناو ئەو سێ بەرگەی د.ج.ك و هەندێ دیدەنیدا بڵاوکراوەتەوە... ئەم کۆتاییەی بەرهەمەکانم بەو سێ بەرگەی کە سەرەتاکەی لە ئازاری 1973دا سەری هەڵدا دەبوو ڕاستەوخۆ دوای ئەو سەرەتایە بووایە و ڕووناکی ببینێ... ژیانی سیاسی خۆم، باروودۆخی وڵات، ئاوارەیی و دابڕان لە نووسین و ئەو بەڵگەنامانە، ئاڵۆزیی

ڕوداوەکان، خوڵقێنەری ئەو جێ گۆڕکێیەی نێوان ئەو سەرەتا و کۆتاییە بوون.. بۆیە سەرەتاکان بە لێکۆڵینەوەی سیاسی هەمان بابەت. بە باسەکانی لەمەڕ دیپلۆماسێتی سەرکردایەتی کورد و شیکردنەوەی لایەنی چینایەتی و کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری بوون. دواتریش بۆ ئەو بابەت و باسانەی کە لە بەرهەمەکانمدا دەبینرێن.

**کازیوە: ئەوەندەی من ئاگادارم، بەرهەمەکانی بەڕێزتان زیاتر لەسەر پێشەوای نەمر و دەوڵەتی جمهوری کوردستانن کە لە سێ بەرگدا خستووتانەتە ڕوو واتە زیاتر لەسەر کۆماری مهاباد دەدوێن، ئایا زیاتر مەبەستتان ئەوەیە بڵێن ئەو مهابادەی 52ساڵە لەناو چووە و بمانەوێ و نەمانەوێ سەربوردەیەکی گەورەی کوردە، یا ڕایەکی دیتان هەیە لەسەری؟**

مەحمود.م.ع: ئەندامانی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (ڕزگاری 1969–1970 و نووسینی زنجیرەیەك باس لەسەر ج.ك) یەکەم سەرەتای نووسینەکانم بوو لەسەر ئەو ئەزموونە. (ك.م.م)یش درێژەپێدانی ئەو باسانە بوو.. لە دواییشدا زیاتر لەوەی خۆم بیرم لێ دەکردەوە و دەمویست ئەو هەڵە مێژوویە کات و کارەکانمی بۆ خۆی زەوت دەکرد، لەبەر گەلێ هۆ کە هەرە گرنگەکەیان هەستیاری و گەورەیی و پڕ لە دەرس و پەندی ئەزموونەکە بوو...

جۆری خولقاندنی ئەو هەڵە مێژووییە، ژیانی سیاسی و سەربازیی و دیپلۆماسی، ئەدەبی و ڕۆژنامەگەریی و، لایەنی کۆمەڵایەتی و زاڵ بوونی هۆز و ئەقڵی خێڵەکی، ڕۆڵی زلهێزەکان و مانۆڤرە سیاسییەکان، ڕۆڵی جیۆپۆلیتیك لە ئاراستەکردنی ڕووداوەکان... هۆ و فاکتەرە ڕووخێنەرەکان.. تاد چوونە ناو قووڵایی ئەوانە و هەڵهێنجانی دەرس و پەندەکان، بۆ سوود وەرگرتن لێیان، ئەو تاقیکردنەوە و دیاردانە و گەلێ خاڵ و ڕووداوی لەیەك چوو لەگەڵ ئەزموونێکی پێشووی تر (حوکمداری و مەلیکایەتیەکەی شێخ مەحمودی نەمر) و ئەم ئەزموونەی کوردستانی فیدراڵ، ئەوانە گیانگەی لێکۆڵینەوە و باسەکانم بوون... چەند لەم ئەزموونە بکۆڵرێتەوە، هێندە پەندی لێ هەڵدەهێنجرێ و سوود بەم تاقیکردنەوەیەی ئێستامان دەبەخشێ...

**کازیوە: ڕاتان چی‌یە بەرامبەر کتێبەکەی ولیەم ئگلیتن کۆماری کورد 1946، کە لە لایەن (سەید محەمەد سەمەدی)یەوە وەرگێڕاوە؟**

محمود.م.ع: ئەو کتێبەی ئیگلتن کە لە ساڵی 1963دا چاپکرا.. تا ئێستاش یەکێکە لەو سەرچاوە سەنگینانەی کە بایەخی مێژوویی خۆی پاراستووە.. ئەگەر هەندێ وردە هەڵە و ناوگۆڕین نەبێ کە لە سەلیقەی شارەزایان بەدەر نییە، ئەوا ئەو ڕەخنانەشی ئاراستە نەدەکرا... ئەو نووسەرە لە ناو ژیانی ناو ڕوداوەکان و دیدەنیی زۆر لە لێپرسراوانی کۆمارەکە لە سەردەمی دوا هەرەسدا، ئەو کتێبەی داناوە، نووسەر تا ئێستاش بەردەوامە لەسەر وەرگرتنی زانیاریەکانی لەمەڕ ئەو تاقیکردنەوەیە. کە بەرگی یەکەمی د.ج.ك–م بۆ نارد لە سوپاسنامەیەکدا ئەوپەڕی خۆشحاڵی خۆی بۆ ئەو کارە مێژووییە دەربڕی... هەروەك لە نامە بڵاوکراوەکەیدا لە ب3–ی–د.ج.ك دا دەردەکەوێ. لێرەدا دەبێ بڵێم کە ئەو وەرگێڕانەی سەمەدی کەموکورتی زۆری تێدایە و چاپەکەشی جوان نییە، وەرگێڕانەکەی کاك جەرجیس فەتحوڵا بۆ سەر زمانی عەرەبی سەرکەوتوو پڕ سوودە.

**کازیوە: وەکو دەزانین ئەرشیفی دەوڵەتان (30–40)ساڵ جارێك دەکرێتەوە، وەکو ئەوەی ئەرشیفی بەریتانی کرایەوە و بیستمان کە مەڵبەندی کوردی لە لەندەن، نزیکەی حەوت هەزار دیکۆمێنتی کۆپی کردووە و هەر لە بەریتانیا سێ کتێبی (محمد رسول هاوار) دەرچووە کە دوو بەرگیان لەسەر شێخ مەحمود و ئەوەی دیشیان لەسەر (سمکۆی شکاك)ە، وە ئێستا جالیەی کورد لە ئەوروپا زۆرە، هەندێکیان ئاستی ئەکادیمیان باشە و زمان دەزانن لەوانەیە بیانەوێ ئەو دۆکۆمێنتانەی ئەوێ کۆپی بکەنەوە– یا پێشەکی بۆ بنووسن وەکو ئەوەی گەردە لێسکی لە سەدەی نۆزدەدا لەسەر کورد نوسیویەتی و (د.کمال مەزهەر) فۆتۆکۆپی کردووە، هەروەها (ئیرلی پیتەر لیف) سێ بەرگی نووسیوە و (د.جەمشید حەیدەری) پێشەکی و لێکۆڵینەوەی لەسەر نووسیوە. جا نازانم وەزعی ئێستای کورد لەوێ ڕێگای پێ دەدات بە ئەرکی کۆپی کردن و لەسەرنووسین و کۆکردنەوەی دیکۆمێنتەکان هەستن؟**

محمود.م.ع: سامانی مێژوویی و کولتوریی کورد لە ناو ئەرشیفی دەوڵەتانی: بەریتانیا و، فەرەنسا و، ئەڵمانیا، و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئێران، تورکیا، عێراق، سوریا، کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست، چاوێنی و تاڕادەیەك زۆرە، ئەمڕۆ زۆر لە بەڵگەنامە و دۆکۆمێنتەکانی هاوپەیوەند بە کوردەوە ئاسان دەست دەیانگاتێ، نموونەی ئەوانە لە د.ج.ك بەرگی 3دا دەبینرێ، ئەگەر ئەم حاڵەتی دابەش بوون و خۆپەرستی و لە یەك دابڕانەی نووسەر و ڕۆشنبیران لە هەندەران نەمێنێ، دەتوانرێ کاری گرنگ لەو بوارەدا ئەنجام بدرێ، گەورە و گرنگتر لەو کارانەی کە هەندێ نووسەر و ڕۆشنبیر پێی هەستاون ئەو سێ بەرهەمەی مامۆستا محەمەد ڕەسول هاوار، بایەخێکی گەورەیان هەیە سەبارەت بەو دۆکۆمێنتانەی تیایاندا بڵاوکراونەتەوە، ئەگەر ئەو لایەنی سستی و کەمتەرخەمیە نەبێ ئەوا ئەو بەڵگانە جێگەیان لە دەیان دانراوی لەو بابەتانەدا نابێتەوە... بەمەش دەتوانین مێژووی نەتەوەکەمان وەك بووە بە گەڕانەوە بۆ بەڵگەنامەی ڕەسەن بنووسینەوە.

**کازیوە: بۆ زیاتر بایەخ دان بەو لایەنانەی پێتان وانی‌یە پێویستە کورد مەڵبەندێکی هەبێت، بۆ پاراستنی بەڵگەنامەکان، یا بڵێم لەم زروفەی ئێستادا پێویستی بە دوو مەڵبەند یان چەند مەڵبەندێك هەیە بۆ پاراستنیان لە کوردستان و لە دەرەوەی کوردستان؟**

محمود م.ع: وەك دەزانن پار، ساڵی لە دایکبوونی ئەو ئەرشیفە بوو کە دەمێك بوو بیرۆکەکەی لە مێشکمدا گەڵاڵە ببوو و یەکێك لە ئاواتەکانم ئەوە بوو کە لە کوردستاندا ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان دابمەزرێنرێ ئەوە بوو بە یارمەتی دڵسۆزانەی مام جەلال و کاك کۆسرەت و هاوکاریی گەلێ ڕۆشنبیر و

وەزارەتی رۆشنبیری ئەو پرۆژە مێژوویی و شارستانییە بۆ یەکەم جار لە مێژووی کورددا لە شاری سلێمانیدا لەدایك بوو... ئەوەی پێویست بێت لە رووی یاسایی و سترەکتور و پرنسیپەکانی رێکخستنی ئەرشیف و پۆلێن و دۆسیە و ئەرشیف کردنی بابەتە جۆربەجۆرەکانی، لە ناو ئەزموونی ئەو لایەنانەدا لەو ئەرشیفەی کاری تێدا دەکەم بە یارمەتی و رێنمایی ئەرشیفکار و پسپۆڕانی ئەوێ بەدرێژیی خستمە بەردەستی لێپرسراوان لەم کارە، هەوڵ ئەدەم ئەمساڵیش زیاتر رووناکی بخرێتە سەر لایەنە نادیارەکان لەو دامەزراندنەدا کردنەوەی مەڵبەندێ یان چەند مەڵبەندێکی تر لە هەندەران، کارێکی زۆر گرنگ و تەواوکەری ئەو پرۆژەیەیە. هەم بۆ پارێزگاری کردنی ئەو دۆکۆمێنت و بەڵگەنامانە تیایاندا کۆدەکرێتەوە، و هەم بۆ رەخساندنی سەنتەرێکی رۆشنبیری کە لێکۆڵینەوەی بابەتی و زانستیانەی ئازادی تێدا ئەنجام بدرێ. جگە لەوەی کە دەشبێتە سەرچاوەی گەشەکردنی سامانی مێژوویی و رەخساندنی کەشێکی دیموکراسی بۆ وشەی ئازاد..

**کازیوە: بە حوکمی ئەوەی بەرێزتان زۆر ولاتان گەڕاون، باری رۆشنبیری ئەو میللەتانەت لە سایەی حکومەتەکانیاندا بینیوە. باری رۆشنبیری کورد لە سایەی ئەم دەسەڵاتەدا چۆن دەبینی؟**

محمود. م.ع: گەشەکردنی باری رۆشنبیری و بوژاندنەوەی مێژوو و سامانی کولتوری نەتەوە، تا رادەیەکی زۆر و دوور بەستراوە و پابەندی دامەزراندن و بوونی دەوڵەتی نەتەوەییە، کاریگەری دەوڵەت دەگاتە ئەو ئاستەی کە بڕیاردەری چارەنووسسازێ لە سەقامگیرکردنی بنەماکانی دروستبوونی نەتەوە و کامڵبوونیان، لە خولقاندنی زمانی یەکگرتووی نەتەوە، لە جێگیرکردنی هەیە و پێناسە و بوونی یاسایی و نێو نەتەوەیی و سیاسی میللەت، کاریگەریی بوونی دەوڵەتی نەتەوەیی، ئەگەر ئازاد و دیموکرات و شارستانی بێت، نەتەوە دەخاتە بەردەم ئەو گۆڕان و پێشکەوتن و گەشەکردنە هەمەلایەنانەی کە سیما و رووخسار و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و رەوتی ژیان دەخاتە سەر رێگەی ئاسایی و مێژووییەکەی.

رابوردووی ژیانی ئەم بەشەی کوردستان و هی ئەمڕۆی بەشەکانی تر ئاوێنەی بێگەردی ئەو بۆچوونەن.. بۆیە لە سایەی ئەم نیمچە ئازادییەی کوردستان لەم قەوارە فیدراڵییەی کە تا ئێستا لە پێناسەی یاسایی و ناوچەیی و هەرێمی نێودەوڵەتی بێبەشکراوە، وە لەگەڵ ئەو هەموو گرفتە قەبە و کۆسپە گەورانەی بەردەمی و سەرەڕای نائارامی و شەڕی ناوخۆ و ژیان و گوزەرانی سەختی رۆژانە... ئەمڕۆ لە ژێر سایە و سێبەری ئەم ئەزموونە بەردەوامیی بوونی ناوچەی ئارام وپاراستنی ناوچەکە لە هەڕەشەی رژێم و نەخشەی ناحەزان، بێ لەو هەڕەشە و لەشکرکێشیەی تورکیا کە ناهەق و زاڵمانە چاوی لێ دەپۆشرێ.. باری رۆشنبیریی ئازادیی وشە و بڵاوکردنەوە و رادەربڕین گەشەیان کردووە و بەرەو ئەوە دەچن کە زیاتر چوارچێوەی یاساییان بۆ برەخسێنرێ. ئەمڕۆ زەمینەیەکی کەمێ لەبار و ئاووهەوایەکی تارادەیەك سازاو بۆ مشتومڕی ئازاد و دیالۆگی سەربەست، لە ئارادان دەیان گۆڤار و رۆژنامە و بڵاوکراوە، تەلەفزیۆن و رادیۆ... بۆ چەندین لایەن و گرووپی سیاسی رۆڵی خۆیان دەبینن و تەعبیر لە را و بۆچوون و هەڵوێستە جیاجیاکانی خۆیان دەکەن..

لەگەڵ ئەوانەشدا دەتوانرێ ئەوانە بەرفراوان و ئازادانەتر بکرێن، لە سنووری تەسکی هەندێ دیاردەی بە زیانی وەك: بەربەرەکانی نائاسایی، ئیستیغلالی قەڵەمی نووسەر، تەنگ هەڵچنین بە هەندێ قەڵەمی پێگەیشتوو، زۆر و بۆریی هەندێ بڵاوکراوە، سەپاندنی بیروڕای نائاسایی پشت بەستوو بە هەندێ ناوەندی دەسەڵات و خۆسەپاندن و خۆپەرستی... دەربهێنرێن و بخرێتە سەر رێبازی ئاسایی شەڕە نەعلەتیە سەپاوەی ناوخۆ لابەلابکرێ و دروستی خۆیان... ئەگەر ئەم کارەکان لەوە گەورەتر دەکرێن... بەراوردێکی ئەم سەردەم و سەردەمە رەشەکانی حوکمی رژێمی بەغدا، جیاوازییەکی گەورە دەهێنێتە بەرچاو، ئەوەی رۆشنبیر و خەڵکی خوێندەوار چاوەڕوانی دەکەن، بۆ پێشەوەچوون و گەشەپێکردنە، سوود وەرگرتنە لە هەموو تواناکان. هەرچەندە حاڵەتی وەستاو، یان جووڵەی کەم سوود، لەو دامودەزگایانەدا دەبینرێ کە لەو بوارانە بەرپرسیارن لام وایە هۆی ئەوانە شارراوە نین و کاتی ئەوە هاتووە ئاوڕیان لێ بدرێتەوە...

**کازیوە: جەنابتان لە دیدارێکدا، باس لە عەقڵیەتی سیاسی کورد دەکەن، پێتان وایە عەقڵیەتی سیاسی کورد، توانیویەتی لە بەرامبەرەکەی بگات و مامەڵەی لەگەڵدا بکات؟**

محمود.م.ع: نەخێر، بەپێچەوانەوە، چونکە لە هیچ یەکێك لە پلە و سەردەمە جیاجیاکانی مێژووی سیاسی و هەلەمێژووییەکاندا، دیاردەی تێنەگەیشتن لە بەرامبەرەکە، مەبەستم لەوە، زیاتر گەورە هێز و دەوڵەتی بڕیار بەدەستە، تێنەگەیشتن لەو نەخشە و سیاسەت و دیپلۆماسیەتە ناوەندییە کە راستەوخۆ ئایندەی کێشەکەی کوردی پێوە بەستراوە بووە، لە ئارادا بووە، ئەقڵی سیاسی کورد پەی بە رۆڵی چارەنووسساز و مانۆڤرە سیاسیەکانی زلهێزەکان نەبردووە و نەگەیشتبوونە ئەو ئاستەی کە بتوانن خۆیان لەگەڵ هەلومەرجە سازاوەکاندا بگونجێنن، لەو ئاستەدا نەبوون کە بەرامبەر دیپلۆماسێتی سەردەمەکە، نەخشە و کاری دیپلۆماسییانەی خۆیان هەبێ بۆ سوود وەرگرتن لە دۆخە رەخساوەکە و سەرچاوەکەی، بۆ خۆ لادان لە بەڵای ناکۆکییە سەرەکییەکە و سڕکردنی لامە و ناکۆکییە ناسەرەکییەکان و ئاراستەکردنی تواناکان رووبەڕووی دوژمنی سەرەکی و بۆ دۆزینەوەی ئەڵقەی بۆش یان ئەڵقە بۆشەکانی دەوری کێشەکە لەسەر شانۆی سیاسی نێونەتەوەیی، دیارە لەوانەدا مەبەستم لایەنە سەرەکی و ناوەندەکانە، نەك سیاسەتە

ئاشکراکان... با لە هەر یەك لەو سێ هەلە مێژووییەی لەم سەدەیەدا بۆ کورد ڕەخسا سەر و نموونەش بخەمە پێش چاو:

–لە سەردەمی حوکمداری و مەلیکایەتییەکەی شێخ مەحمودی نەمردا 1918–1924 کە بە سێ پلەدا تێپەڕی... ئەقڵی سیاسیی کورد نەیتوانی لەم دیاردە ناوەند چارەنووسسازانە بگات:

یەکەم: ستراتیج و نەخشە و سیاسەتی ئیمپراتۆریەتی بریتانیا بەرامبەر بە کورد و لە سەرەتادا، وەك بڕیار و بەرنامە بۆ کار لەسەرکردن لە ئارادا نەبووە، بەڵکو ئەفسەرە سیاسییەکان کە کارەکانیان درابووە دەست سەرچاوەی بڕیار و هەڵوێست وەرگرتن بوون، ئەوانەش لە سێ گروپی سەرەکیدا خۆیان دەنواند:

گرووپی یەکەم: لەگەڵ بەستنەوەی باشووری کوردستاندا بوون بە میسیۆپۆتامیاوە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سوننە مەزهەبی عەرەبی ڕەگەز.

گرووپی دووەم: لەگەڵ ئەوەدا بوون کە نابێ پێش لێکۆڵینەوە لە کورد و لە کێشەکان، هەڵوێستێکی سەقامگیر وەربگیرێ، بەڵکو ئەمە دوا بخرێ بۆ ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانە.

وە گرووپی سێیەم: لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەت بوون بۆ کورد...

لە دواییدا، سەبارەت بە گەڵێ هۆ کە یەکێکیان ئەم دیاردەیەیە کە قسەی لەسەر دەکەم، یەکەم گروپ سەردەکەوێ، ڕا و هەڵوێست و بۆچوونەکانی دەبنە زەمینە بۆ سیاسەت و نەخشەی ئینگلیز لە دژی کورد و بۆ ڕووخاندنی دەوڵەتەکەی کوردستان...

دیسان ئەقڵی سیاسی کورد مامەڵەی لەگەڵ ئەو واقیعە کرد کە پەیوەندی بە سیاسەتی بەریتانیاوە هەیە لە دژی تورکەکان، هیچ لێپرسراو و ئەفسەرێکی سیاسی ئینگلیز چاوی لە مامەڵە کردن لەگەڵ تورکدا نەدەپۆشی و ڕاستەوخۆ لە دژی دەوەستا، هەروەك چۆن چاویان لە جۆری بەربەست کردنی هەڕەشەی کۆمۆنیزم نەدەپۆشی.

ئەو تێنەگەیشتنە بۆ ئەو دیاردە مێژووییە، لە ناو نووسەر و ڕۆشنبیراندا یان لە ناو زۆربەیان، تا ئێستاش بەردەوامە...

دووەم: لە سەردەمی جمهوریەتی کوردستان –1946– و ئەزمونەکەی مهابادا 1941–1946، ئەقڵی سیاسی کورد مامەڵەی واقیعی ڕا و بۆچوون و نەخشە و هەڵوێستەکانی یەکێتی سۆڤیەتی نەدەکرد، لە مانۆڕە سیاسییەکان لە پێناوی نەوت و سەپاندنی نفوزدا، نەدەگەیشت، تەنانەت نەیدەتوانی لە بەلاو کاری بە زیانی تاکە دۆستە ستراتیجیەکەشی (ئازەربایجان) خۆی لابدات، بۆیە لەگەڵ ئازربایجاندا بە ئاسانی لە ناو ئەو داوەی بۆیان سازکرابوو خنکێنران..

سێیەم: ئەم کوردستانە فیدراڵییەی ئێستایە: ئەگەر ورد سەرنج لەو دەرفەت و مامەڵە و هەل و مەرج و دیاردانە بدەین کە دەوری ئەم فیدراڵە و ناوچەی ئارامی داوە، وا دوو دیاردەی زەق دەکەونە بەرچاو، دوو دیاردەی دژ بەیەك، یا نەگونجاو نەسازاو لەگەڵ یەك: ئەم وەزعەی ئێستای کوردستانی عێراق لە ناو ناوچەی ئارامدا وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ یان نیمچە سەربەخۆ وجوودی هەیە و مامەڵەی هەرێمی نێونەتەوەیی لەگەڵ دەکرێ. بە شێوەیەکی ڕەسمی نیمچە ڕەسمی و ناڕەسمی لەبەر گەڵێ هۆ، لەوانە: بوونی پەرلەمان و حکومەت بە هەڵبژاردنێکی ئازاد، مامەڵەی دەوڵەتانی خۆرئاوا بە تایبەتی ئەمریکا و بەریتانیا و فەرەنسا و... سەردان و کۆبوونەوە یارمەتی و پاراستنی.. تاد، ئەمانە بۆ ئەم قەوارەیە پێناسەیەکی ناڕاستەوخۆ و هەندێ جار ڕاستەوخۆیە، زەمینەیەکی تەواو لە بارە بۆ ئەو بۆچوونە کە کورد لەسەر ڕێبازی خۆی بۆ ئامانجە دوورەکەی هەنگاو دەنێ یا هەنگاوی پێدەنرێ... ئەگەر بە مەزنە و خەیاڵیش بێ..

کەچی وەك لە هەمان کاتدا نەبوونی پێناسەی یاسایی و سیاسی دیپلۆماسی، چ هی ناو سنووری جوگرافی عێراق و چی لە هەرێمەکەدا وەچی بۆ ئەو دەوڵەتانەی ئەو مامەڵانەی لەگەڵدا ئەکەن کە گەورەترین کۆسپی بەردەمێتی و تەم و مژیشی خستۆتە سەر پاشەڕۆژی ئەزموونەکە.

بەڵام ئەمەیان بۆ ئەو واقیعەی تر کەوا زیاتر لە شەش ساڵە دەوامی هەیە، نەبۆتە هەڕەشەی ڕاستەوخۆ ئەگەر ئەقڵی سیاسی کورد بزانێ و بتوانێ واقیعبینانە لەگەڵ ڕووداوەکاندا بجووڵێتەوە کە، و نەیەڵێ لەوە زیاتر لە بایەخی ئەزموونەکە کەم بکرێتەوە، زیاتر جێگەی پێ لەق بکرێ.

جا لە ناو ئەو بارودۆخەدا، بەلاخستنی مێژووی پڕ لە کارەسات و ئەنفال و چەکی کیمیاوی و جینۆسایدی کورد، بادانەوە بۆ لای بەغدا، بەبێ بوونی چەترێکی نێودەوڵەتی، بڕوا بوون بەوە کە چارەسەر هەر لە بەغدایە، ئەو واقیعە پێنەگەیشتووەی ئەقڵی سیاسی کورد دەردەخات... ئەمڕۆ لە هەموو کات زیاتر پێویستمان بە تێگەیشتنی بارودۆخەکان، بەسوود وەرگرتن لە ئەزموونەکانی پێشوو، بەر لە خۆ و لە دەوروپشت و لە سەرچاوەی بڕیار تێگەیشتنە.. تا بتوانین ژیرانە مامەڵەیان بکەین و ئەم ئەزموونە بپارێزین و گەشەی پێبدەین.

**کازیوە: وەکو دەزانین پەیمانی سیڤەر بەندەکانی 62، 63، 64 لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی و مافەکانی کوردا بوو، بۆچی هەندێ نەتەوە کە نەبوون کران بە دەوڵەت و کورد نەبوو بە دەوڵەت؟**

محمود.م.ع: دانامەزراندنی دەوڵەت یان ڕوخاندنی دەوڵەتەکەی باشوور، جێبەجێ نەکردنی بەندەکانی سیڤەر کە کوردی بەرەو دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی دەبرد، ئەگەر کاریان لەسەر بکرایە، ئەوانە پەیوەندییان بە گەڵێ هۆ و فاکتەری خۆیی، هەرێمی نێودەوڵەتییەوە هەبوو، کە بۆ ئەو کاتە و تا ئێستاش ڕۆڵی دەرئەنجامی گەورە بڕیار بە

دەستەکان چی بۆ دامەزراندنی دەوڵەت بۆ ئەو گەلانەی کە نەگەیشتبوونە ئاستی بە نەتەوە دانا، وە چی بۆ دانەمەزراندنی دەوڵەت بۆ ئەو گەلانەی کە بە نەتەوە دادەنران، چارەنووسساز و بڕێنراوە بووە، فاکتەری خۆیی لایەنە کۆمەڵایەتی و ئایینی و ئابووری و ڕۆشنبیری و ئەقڵی سیاسی سەرکردایەتییەکانی کورد هۆی سەرەکیی خۆیی بوو بۆ ئەو دیاردەیە... زیرەکی مستەفا کەمال ئەتاتورک، جەربەزەیی و دیپلۆماسییەتە سەرکەوتوانەکەی، کە تورکیای لە ناو ڕوخاندن هەستانەوە، ناکۆکییەکانی بۆ بەرژەوەندیی خۆی لابەلا و چارەسەر کرد، توانی یەکێتی سۆڤیەت بکات بە دۆست و یارمەتیدەری ستراتیجی خۆی، گرفتەکان لەگەڵ دەوڵەتە گەورەکاندا لابەلا بکات... وەستانی بەرامبەر ئەنجامدانی بەندەکانی سیڤەر و سادەترین مافی کورد، ئەم هۆیە هەرێمیەش کاریگەرانە ڕۆڵی خۆی لە پرۆسەی دانەمەزراندنی دەوڵەت بۆ کورددا بینی...

**کازیوە: ئێوە پێتان وایە شێخ مەحمود لەسەر بنەمای مەزهەبی بوو حوکمڕانی نەکرد، یان لەسەر ئەو بنەما و پرۆگرامەی کە (ئارنولد وڵسن) (سیر پرسی کوکس) بۆیان دانابوو حوکمڕانی بکات؟**

محمود.م.ع: لە ڕاستیدا شێخ مەحمود لەسەر هیچ یەکێك لەو بنەما و بەرنامەیە حوکمی نەدەکرد، ڕاستە پرنسیپەکانی ئایینی ئیسلام بۆ شێخ وەك قوتبێکی گەورەی ناوچەکە سەرچاوەی بڕیار و فرمان و سزابوون، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو قسانەی کە بۆی دروست کراوە، گوایە بە فەقیانەکەی تەوقەی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا کردووە، ئەسڵی نییە، ئەوانە چاو لەو ڕاستیە دەپۆشن کە وەزیری ئابوری (کەریم عەلەکە) مەسیحی بووە، وە کە ئامانجی سەرەکی ئەو دامەزراندنی دەوڵەت بووە بۆ کورد.

ئەوەی ئاشکرایە حکومەتی مەلیکایەتیەکەی شێخ مەحمود بەرنامەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی بڕیار لەسەر دراو بە مانا سەردەمەکەی نەبووە.

ڕەنگە ململانێ و هەڕەشەی ڕاستەوخۆی بەردەوام ڕۆڵی لەوەدا بینیبێ... ئەو وەرچەرخاندنانەش لە سیاسەتەکەیدا بەرەو تورك، هەر لە بێ هیوایی و لە دژە کرداری ئەو ئینگلیزانە بوو کە لە دژی شێخ کاریان دەکرد، بەتایبەتی کردەوەکانی ئارنولد ولسن، پرسی کۆکس، مێجەرسۆن و گروپەکەیان کە هەموو هەوڵێکیان بۆ دامەزراندنی ولات و دەوڵەتی عێراق بوو بە باشووری کوردستانیشەوە کە لەوەدا شێخ ئەحمودیان بە کۆسپ و هەڕەشەی گەورە دادەنا...

**کازیوە: بابێینەوە سەر حکومەتی ئێستا و بپرسین ئەو چەند واقعەی دوای ڕاپەڕین بەسەر کوردستاندا هاتووە وەکو بەرەو دابەش کردن و حکومەتی ئیئتلافی و وەزعی ئێستای کورد ئەمانە لای جەنابتان تا چەند دڵخۆشکەرن؟**

محمود.م.ع: ڕاپەڕین، یەك ڕووداوی جەماوەریی چەکداریی و شۆڕشگێڕانەی ناو ژیانی سیاسی و خەباتی دوورودرێژی نەتەوەی کوردبوو.. بۆ یەکەم جار بوو لە مێژووی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستاندا جەماوەر بەو فراوانی و حەماسە سەبارەت بە گەڵێ هۆ و ڕووداو و بتوانێ خەباتی چەکداری لە شاخەوە بۆ شار بگوێزێتەوە، لە ماوەیەکی کورت و چاوەڕوان نەکراودا بۆ تار و مارکردن و لە ڕیشە هەڵکەندنی بوونی ڕژێم، هەروەك ئەو جەماوەرە بیەوێ لە چەند ڕۆژێکدا تۆڵەی بەرودوا لەو هەموو زوڵم و زۆر و کۆمەڵ کوژیی و چەکی کیمیاوی و کارەساتەکانی ئەنفال و جینۆسایدی کورد بکاتەوە کە نزیکەی یەك چارەکسەدە درێژەی هەبوو...

ئەم ڕووداوە، گەرداوی دەریای تۆڵەی پەنگەوە خواردووی ناو سینە و دەروون و مێشکی جەماوەر بوو کە لەگەڵ هەڵەبجەدا ئەو هەژانە گەورەیەیان لەناو کورددا خولقاند، هەروەك چۆن کارەساتەکانی خوڵقێنەری بوون، خۆشی بوو بە هۆی لەدایك بوونی دیاردەی مەزنی ڕابوونە چەند ملیۆنییەکە کە وەك بورکان تەقییەوە و دنیای هەژاند، لەگەڵ خۆشیدا ناوچەی ئارامی بەوەلەدەهێنا، لە میشەوە بۆ هەڵبژاردن و ئینجا بۆ پەرلەمان و حکومەتی فیدراڵی کوردستان.. دوای ناچارکردنی جەیش و دامودەزگاکانی ڕژێم کە بەشێکی گەورەی کوردستان چۆڵ بکەن بۆ خەڵکی کوردستان.

ئەوانە بۆ خۆیان مێژوویەکن، خوڵقێنەری مێژوویەکی نوێن، ئەم واقیعە نوێیە سەپێنراوە بووە ئەزمونێکی گەشاوە، ئەم ئەزموونەی کە سەرەڕای ئەو گرفتە گەورە خۆیی و هەرێمی و نێودەوڵەتیانە، لەگەڵ ئەو هەڕەشە گەورانەی دەوری و هەڵەی سەرەتا.. وە سەبارەت بەو هۆیانەی کە بە سەلیقەی خوێنەر ئاشنان... تا ئێستاش گەورەترین دەستکەوتی نەتەوەی کوردە ئەگەر شەڕ و ئاژاوەی ناوخۆ بیەڵێت، ئەوا ئەو پاشەڕۆژەی لێ چاوەڕوان دەکرێ کە لەمەوبەر ئاماژەم بۆ کرد.

**کازیوە: بۆ دروست کردنی گوتارێکی ڕۆشنبیری کوردی کە تایبەتمەندی کوردی هەڵگرتبێ، چی بکەین، کە ئێمە تا ئێستا نەمانتوانیوە گوتارێکی ڕۆشنبیری تایبەت بە کورد بێنینە ئاکام؟**

محمود.م.ع: خولقاندنی خوتابێکی ڕۆشنبیریی، وتارێکی ڕووناکبیری تایبەت بە کورد پێویستی بە ڕەخساندنی مەرج و بنەمای ڕۆشنبیریی ڕەسەنە کە لە سەرەنجامی بەهێز بوونی هۆش و هەست و نەستی نەتەوایەتی و هۆشیاری سیاسی لەدایك دەبێ.

لەسەر ئەم زەمینەیەش ڕووناکبیران یەك دەگرن و لەبەر تیشکی بەرژەوەندییەکانی نەتەوەکەیان ئەو وتارە دادەڕێژن و دەبێتە سەرمەشقی ژیانی ڕۆشنبیریی و سیاسی ناو جوولانەوەی نیشتمانی و ڕزگاریخوازی نەتەوە.. کە ئەوانە تا ئێستا بە داخەوە بوونیان هەست پێ ناکەم... هۆیەکانیشی ناگێڕمەوە تەنها بۆ لایەنە کلاسیکییە باسکراوەکان، بۆ پارچە پارچەیی نیشتمان و هێز و توانای کورد، بۆ دوژمن و ئیمپریالیزم و دەستی ناحەز. بەڵکو لەمەدا دەیگێڕمەوە بۆ کورد خۆشی: بۆ ئەو نووسەر و ڕووناکبیرانەی تا ئێستا خۆپەرستی و گۆشەگیریی و چاوپۆشینی لە هەق و خۆ کەمکردن لە ئاست ناهەقدا بۆتە پرنسیپی ڕۆشنبیرییان...

بۆ ئەو مەلبەندی دەسەڵاتەی دەیەوێ ئازادیی قەڵەم وشەی ڕەسەن دابڕێکات یان بە پارە دەوریبدا و هەر ڕۆژە بڵاوکراوەیەك بۆ

مەبەستی تایبەت، قوت دەکاتەوە.. بۆ ئەو ڕوناکبیر و نووسەرانەی بە ناوی بێلایەنییەوە. لە خراپترین شێوەی بەدناوی بەلایەنی‌دا، ئاژاوەی بیرۆکاریان خولقاندووە...

زەمینەی خیتابی ڕوناکبیری، لەسەر ڕێبازی لابەلاکردنی ئەو دیاردە ناقۆڵا و بەزیانانە دەهێنرێتە ئاراوە...

**کازیوە: بە بۆچوونی بەڕێزتان ڕاپەڕین چەند کاریگەری هەبووە لەسەر ڕۆشنبیری کورد لە ڕووی سایکۆلۆژی و داهێنانەوە؟**

ڕاپەڕین بۆخۆی، مێژوویەکە دوو سەردەمی تەواو دژ بەیەک-ی لێک ترازاند، سەردەمی داگیر کردن و تراجیدیای جینۆسایدی کورد.. لە سەردەمی پاکسازی داگیرکەر و ناوچەی ئارام و ئازادییەکی چاوێنی لە ناو قەوارەیەکی دیفاکتەری تەمەن نزیک بە حەوت ساڵ.. ئەم جیهانە نوێیە هاوتەریب بە خێرایی ڕوداوە وەرچەرخێنەرەکان، کاری لەسەر ناخ و دەروونی کورد و ڕووناکبیرانی کورد کرد، پرۆسەیەکی کاریگەر بوو لە چارەسەرکردنی هەندێ نەخۆشی کۆمەڵایەتی و سیاسی و سایکۆلۆجی ئەگەر بنەڕەتیش نەبووبێ..

سەرچاوەیەک بوو بۆ داهێنانێکی نوێی نزیک بە شارستانی و جیاواز لە داهێنانەکانی شاخ، بەپێی جیاوازیی پلە و قۆناغی خەبات.

ئەگەر شەڕی ناوخۆ و ئەو هەموو نەهامەتییە سیاسی و ئابووری و گوزەرانە خراپانەی تەکی نەبوونایە، ئەوا ئەو وەرچەرخانە بەرفراوان و قوڵ و کاریگەرتر دەبوو... ئەگەر ئەو دیاردە نامۆ و خراپانەی تر، کە ئاماژەم بۆ کردن، نەبوونایە ئەوا ئەو کارە نائاساییانەی پەککخەری هەندێ قەڵەم و کۆڵکردنی هەندێکی ترن، نەدەهاتنە ئاراوە... حاڵەتە دیکتاتۆری و کۆیلەیەتییەکانی دەگۆڕی و باشتر و لەبارتر پێچەوانەکانمان سەریان دەردەهێنا، داهێنانەکان لە ئاست گەورەیی ڕووداوەکاندا دەبوون... لە ناو ئەوانەشدا شەڕی ناوخۆ جۆرێکی تر لە داهێنانی خولقاند... نکۆڵی کردن لە هەموو بوونێک ڕیسوا کردنی ئەوەی دەم و نوکی قەڵەمی ئەو داهێنەرانە دەیانگەنێ کە نامۆ و ناڕەسەنن بە گەل و لەگەڵ...

**کازیوە: جگە لە مێژوو و سیاسەت چ خولیایەکی دیکەتان هەیە؟**

محمود.م.ع: بوارەکانی فەلسەفە، دیپلۆماسیی ناو باری ئاڵۆزی جیۆپۆلیتیکی کوردستان، لە ناو وەرگێڕان و نووسین و لێکۆڵینەوەکانمدا جێگەی تایبەتی خۆیان گرتووە.

**کازیوە: دەربارەی بارودۆخی ئاینده چی دەڵێن؟**

محمود.م.ع: گرفت لە کێشەی سیاسی و نەتەوایەتی کورد چی لە ناوخۆ و چی لەسەر شانۆی نێودەوڵەتاندا، سەرەڕای ئەو هەموو گرفت و ئاژاوە و شەڕ و بۆشاییانەی دەبینرێن.

ئەمڕۆ لە هەموو سەردەمێکی تر زیاتر گەشەی کردووە، هەنگاوی گەورەی ناوە بەتایبەتی لە باشووری کوردستان بە پلەی یەکەم و لە باکوری کوردستان بە پلەی دووەم. ئەم ئەزموونی کوردستانی فیدراڵە، تا ئێستاش گەشاوە و بە ئومێدترین هەڵی ئەم سەدەیەیە کە بۆ کورد ڕەخساوە.

سەرجەمی دیاردەکان، ئەو بایەخ و گرنگی پێدانەی دەوڵەتە گەورە بڕیار بەدەستەکان ئەوە دەگەیەنن کە ئەم دیفاکتەیە دەکرێتە دیرۆڕێکی حەتمی، ئیتر بە هێشتنەوەی ئەم بارودۆخەبێ، لە ناو وەزعێکی یاسایی نوێی عێراقدا، وەک لایەنە کەمەکەی مافی سیاسی و دیموکراسی و مرۆڤی یان، وەزعێکی گەشەکردووتر.. ئەگەر ئاژاوەی ناوخۆ ئەزموونەکە زیاتر بەرەو هەڵدێر نەبات و سنوور بۆ دەست تێوەردانی دەوڵەتانی هەرێم دابنرێ، بەڕێکخستنی کاروباری ناوخۆ و یەکێتی ڕیزەکانی کورد و وە بە ئاشتی چارەسەرکردنی کێشەکان لەسەر مێزی گفتوگۆ بە دیالۆگی دیموکرات و ئازادانە..

**کازیوە: دوا پرۆژەت بە چییەوە سەرقاڵیت؟**

محمود.م.ع: گەلێک پرۆژەی ترم بەدەستەوەن ئەوانەی کاریان لەسەر دەکەم وەک ساڵی پار ئاماژەم بۆ کردون:

-کورد لە ناو مەتەڵی سیاسەتی بەریتانیادا، کە تەرخانم کردووە بۆ لێکۆڵینەوەی بارودۆخی سیاسی و سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر بە کورد لە دوای یەکەم جەنگی جیهان، وەک لەمەوبەر قسەم لەسەر کرد.

-ئەزموونی زیندانیم لە هەیئەی تەحقیقی خاصە لە کەرکوک و ئەمنی عامە لە بەغداد 1980-1981.

-کورد و ململانێی دیپلۆماسی.

**کازیوە: نیازت وایە لێرە جێگیر بیت و نەگەڕێیتەوە گەر بەڵێ، حەز دەکەیت لێرە بۆ کورد چ پرۆژەیەک ئەنجام بدەن؟**

محمود.م.ع: بێگومان دەمێکیشە لەگەڵ ڕێکخستنی کاروبارەکانم خەریکم بۆ گەڕانەوەم، هەموو ئومێدێکم ئەوەیە کە ماوەی تەمەنم لە شارەکەمدا بیبەمەسەر، گەڵێ پرۆژە و کارو پێشنیارو بیرۆکەم لەمێشکدایە ئەگەر تەمەن باقی بێ و کۆسپ نەیەتە ڕێی هیواکانم.

## سەرچاوە

گۆڤاری نڤار ژمارە (2) هاوینی (1998).

سەلاحوددینی موهتەدی

خاقانی یەکێك لەهەرە شاعیرە بەناوبانگەکانی ئێران و کۆڵەکەیەکی بەهێزی زمانی فارسی‌یە لە سەدەی شەشەمی هیجریدا، برادەرێکی خۆشەویستی خۆی لەدوای مەرگی بەم شیعرە دەیلاوێنێتەوە:

(همی گفتم که خاقانی دریغا گوی من باشد    دریغا که شدستم من دریغا گوی خاقانی)

تەرجەمەکەی بە کوردی

بەتەما بووم خاقانی شیوەنم بۆبگێڕێ    بەداخەوە وامنم شینی لەسەرئەکەم

لەراستیدا من لەوانە بووم و کەمیش نەبووین ژمارەی هاودەم و هاورێکانی مامۆستا مەحموود کە ئارەزوومەند و ئاواتەخوازبووین قەڵەمی بە برشتی لەدوا هەوارا فرمێسکی ماڵاوایی‌یمان بۆ هەڵرێژێ بەڵام ئێستامنم پێیدا هەڵدەڵێم و شینی لەسەر دەگێڕم!

ئێستا ئێمەین لەبەردەم رەفیقە خۆشەویستەکەمان وەستاوین بە کۆڵێك پرس وترسەوە:

چم بەسەردێ کەنەمام ومردم؟    پەڕی بەربایەك و خوڵی وردم!
تۆبڵێی پاش نەمان ژینی‌بێ؟    بۆ لەشی ساردەوبوو تینی‌بێ؟
تۆبڵێی ئەوخەوە هەستانی بێ؟    یانەئەو قافڵەوەستانی بێ؟
داخم ئەورازە لەبن سەرپۆشە    سەفەری نابەڵەدی ناخۆشە!

ئەهەڵۆ تیژباڵ وبەرزەفڕەکەی "پۆشکین" و "خانلەری" و "هەژار" و "سوارە" کە هاوتاو هاوسانی مامۆستابوو، ئەپیرەمەردە حەکیم و هۆشمەندەکەی "ئەیشاپوور" کە مامۆستا هێندەی ئیرادەت هەبوو لە خزمەتیا، ئەخواوەندی شانۆ نامە شکسپیری مەزن کە رستە ساکار بەڵام بێ وەڵامەکەی: "هەبوون یانەبوون" ئێستاش لە گوێی ئادەمیزادا دەزرنگێتەوە/ هیچیان رچەشکێن و رێنوێن نین و کەس نییە لەشەوە زەنگی گومان پەلکێشمان بکا بۆ کازیوەی حەقیقەت.

ئێمەین ومامۆستا و دەریایەك دوو دڵی و سەرسووڕمان. بە گوترە لەو ئەنگوستە چاوەی جیهانا پەل ئەکوتین و پائەنێین وپەی پێ نابەین. لەناو گێژەڵووکەی ژیان گێژین ولافی زانست وزیرەکی لێ ئەدەین. سەرخۆش وبێهۆشین و خۆمان بەهۆشیار و ئەغیار ئەزانین.

مامۆستا لە جیهانی روونا فێرکردن و پەروەردەی پێ سپێردرابوو نەتەنیا خوێندکارانی گەنج بەڵکوو ئێمەی ریش سپی چاویلکە لە چاویش دەستمان بەداوێنی گرتبوو راز و رەمزی حەیاتی لێ فێردەبووین، بەڵام ئێستا " ئاگاتە دامەنی دەستی دوعا" !

لەو رۆژەوە کەلە سەیوان و لەناو "ئەنجومی قبوور"دا بەجێمان هێشت پە یوەندمان پساوە، رێگەمان براوە و دەرگای ئامۆژگاریمان لێداخراوە. ئاخ خۆزگە بۆ پەیوەندێك، پەیامێك، کەلامێك، دەربڕینی رایەك، رانانی راستی‌یەك!

کام راستی؟ تەمەنمان تەرخان کرد بۆ دۆزینەوەی مانای ژیان سەرەنجام دەست بەتاڵ و مایە پووچ دەرچووین. دەرکەوت هەموو رامانێك دەگاتە دامانێك! کەچی ئێمە دڵخۆش و دەست خەرۆی تەنکاوی عەقڵی تەسك بینین!

خۆزگە، مامۆستا ئەبوو بە نوێنەری عەقڵی ئێمەو لەوێ چاوی دەگێڕا و گوێی‌دەگرت و کۆمەڵێك راستی روت، حەقیقەتی بزری دەخستە ناوهەگبەی قووڵ و هەراوی هۆشی‌بێ هاوتای و هەندوئارام-وەك هەمیشە-دەگەڕاوە بۆ ناومان، سەری بەماڵی هەمووماندا دەکرد و خەرمان بەرەکەت هەرکەس چەندی هەڵدەگرت، بەشی خۆی وەردەگرت!

ئەگەرجارێکی دیکە دەنگ و دەستمان پێگەیشتبایە من جگە لەو هەموو پرسە ئەزەل و ئەبەدییە، داوێنم دەگرت و بەرم ئەدەدا هەتا هەموو مێژووی جمهووری کوردستانم پێ تەواونەکردبایە. بە بەڵگە نامەو گێڕانەوە و لێکدانەوەکانیشەوە. دەستنووسەکانی پێشەوام پێ کۆدەکردەوە، سەرەهەودای ئەم گلۆلە ئاڵۆزەم پێ ئەدۆزیەوە، گرێ کوێرەکانی مێژووم پێ رەهادەکرد و دەقێکی پڕلە دڵنیاییم ئامادەدەکرد کە لەمەکتەب وخوێندنگاو زانکۆ بەمناڵەکانمانی بڵێینەوە.

بەڵام هەرئێستا و بەبێ ئەوەی ئەم بەختەمان هەبێ یا ئەو خەونەمان وەدی بێت هەرئێستا ئاوێنەیەکی بۆ راگرتووین کە رابوردووی تێدا ببینین و ئایندەی تێدا بەدی بکەین.

کۆمەڵە نووسراوەکانی مامۆستا مەحموودی مەلا عیزەت لەسەر جومهووری کوردستان زیاتر لەوەکە مێژوونووسی بێت، مێژوو ناسی‌یە.

سەرکردەکانمان، دیپلوماتەکانمان، سیاسەتمەدا رانمان، ژنەراڵەکانمان پێویستە بیخوێننەوەو جارێك وەدیان جار پێیدابچنەوە. گەنجەکان بە دەرس بیخوێنن و ئامۆژگاری لێوەربگرن. لێکۆڵەرو مامۆستاکان شێوەی لێکدانەوە و هەڵسەنگاندن و بەراوردی لێ فێربن و نووسەرەکانی مێژووی ئێمە چاوێکی پێدابخشێنن و

وشەرم بیان گرێ و حەقیقەت نە فرۆشن، بزانن و بوێرن تا لەسەر خۆشەویست ترین و پیرۆزترین کەسانی نیشتمان راستی‌یەکان بدرکێنن و رەخنەبگرن و رێنوێنی بدەن بە نەسلی نوێ.

پەردەپۆشی و حاشاکردن، پاکانە وپینەوپەرۆی بە درو بۆ رابردووی خۆمان، مەحکوممان دەکا بەوەی کە هەڵە و هەڵدێرەکانی مێژوو دووپات بکەینەوە.

لە هەمانکاتدا دەرخستنی فیداکاری و دڵسۆزی، پیاوچاکی ودڵپاکی سەرکردەو قارەمانەکانی رابوردوو، هەقێکەو قەرزێکە لە ئەستۆی ئێمە شانازی و سەربەرزی و ورەمان پێدەبەخشێ.

مامۆستا مەحموود بەچاوی وردبین وسینەی فراوان و ئینسافی مێژوونووسی‌یەوە هەردوو ئەرکەکەی دەرك کرد و بەئەمانەت وشەرەفەوە بەجێی گەیاند.

2005/6/3

# لە یادی هاوڕێیم، مەحمود مەلا عززەت

جەمال عەبدول

بەهۆی خۆشباوەڕی و دڵپاکی و بێ چاووڕاوی و بێتەڵەکەیی و بێ فروفێڵی و هەست و دڵناسکیی نائاسایی بێ سنوورمەوە، کە نە ئازایەتی و نەگوناهی خۆشمی تێدایە و وا دروست بووم، گەشت و خەوی ژیانم لەو بابەتانەبوو، کەستەمە بتوانم هیچ شتێکی بیرخۆم بەرمەوە و بەهرەی فەرامۆشی، پەردەی کاڵبوونەوە و ئارامی بدەن بەسەر گەورە و بچووکی ڕووداوەکانیداو، ئەمەیش هۆی سەراپا نائاسوودەیی و خەمناکیی ژیان و هەست و ناخم بوو...!

زۆرجار، ژانەکانی رابوردوو، ئەبنەهۆی بارسووکی و ئارامیی ئێستامان، بە تایبەتی ئەگەر کوێرەوەری و چەرمەسەرییەکانی ژیان، چۆکیان بەورە و خۆڕاگری و خەبات و هەوڵ و کردە و کۆشە و باوەڕمان دانەدا، ئەوا هەر کارەساتێکمان بەو ژانەگشتییانە پێواو بەراوردکرد، ئاسایی و بچووك ئەنوێنن...!

گرنگ و کاریگەرترین پەند کە لەو گەشتە پرمەینەتییەی ژیان فێربووم، ئەوەبوو کە(راستی) گران و سەخت و تاڵترین باجی هەیە، بەڵام گەورە و خۆش و ئارامیهێنترین بەرهەمیشی هەیە، کە دەستەبەرکردنی باوەڕو دڵنیایی دوژمن و ناحەزە، پێش دۆست و، ئاسوودەیی لیپ و تاسەری ناخ و دەروونە...!

چل و حەوت ساڵ لەمەوبەر، لە یەکەم ساڵی خوێندنی زانکۆدا، لە ریزەکانی یەکێتیی قوتابییانی کوردستان و لاوانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستاندا، مەحموی مەلا عیززەتم ناسی، کە هەر زوو سەرنجی راکێشام و ئەوەندە مرۆڤێکی کراوە و سەر و زمان و ڕووخۆش و چوست و چالاك و بزێو بوو، وام ئەزانی زۆر دەمێکە ئەیناسم و هۆگری یەکتربووین و بیروبۆچوونەکانمان گەلێکی لێك نزیك و پێکەوە گونجاوبوون و هەموویشمان، بێبەشی و چەوساوەیی و ماف زەوت وپێشێلکراویی نەتەوە کۆی ئەکردینەوە...!

زۆری کاروبارە حیزبی و ڕێکخراوەییەکانی ئەو سەردەمەمان پێکەوە رائەپەڕاند، کەیەك دوو ساڵێکی خوێندنمان، بەر سەرەتاکانی شۆڕشی ئەیلوول کەوت...

من هەر لە قوناغی سەرەتایی و ناوەندییەوە، ئەوەندەی پێویست بەهرەی وێنە کێشان و خۆشنووسیم هەبوو، بۆیە

لە پێشەوەی پاسەکە: مامۆستا مەحمود مەلا عززەت، جەمال عەبدول بە پێوە، جەلال فەرەداغی دانیشتوو، ئەحۆل بە پێوە، دواکەس بە پێوە لای ڕاستك خەسرەوخاڵ

هەرزوو وەك نەریتی ناچاری و باوی ڕێکخستنەکانی ئەو سەردەمە بە یاننامە و شتیان پێئەنووسیمەوە و لەوێش، زۆری ئەو ئەرکانە لەکاتی ناساز و پەککەوتندا بەمن ئەسپێردرا، شەوەها پێکەوە ئەچووین بۆ لانەیەکی نهێنیی قوتابییان لە(راغیبەخاتوون)، کە شەهید مەئمون دەبباغ و چەند برادەرێکی تری سەرکردایەتیی قوتابیانی ئەوکاتە خۆیان لێ حەشارئەداو، تا بەرەبەیان خەریکی بەدەست ستێنسڵ نووسینەوە و ئەوجۆرە ئیشانەبووم و جارەهایش بە هاوکاریی ئەو و چەند کەسێکی تری وەك خۆمان شەوەهامان ڕۆژئەکردەوە بەدروشم نووسین، لە کاتی ڕێپێوان و بۆنەو یادە نەتەوەییەکاندا لە بارەگای ئەوکاتەی پارتی لە سەعدون، نزیك ستودیۆ پاك و، شەوەهایش لەگەڵ قوتابیانی تری هەموو کۆلیجەکانی زانکۆی ئەوسای بەغا، بەیاننامەکانی ڕێکخستن و چالاکی و هەواڵنامەکانی شۆڕش و پێشمەرگەمان بڵاوئەکردەوە و ئەمبرد بۆ باڵێۆزخانەکان یان ئەمان گەیاندە ماڵە بەرپرسەکان و تووشی جۆرەها ڕووداوی خۆش و ناخۆش ئەبووین و، یان هەڵمان ئەواسین بە وێستگەکانی پاس و پایە و شەقام و مەیان و شوێنە بەرچاوەکانی ئەوسای بەغادا.

دواتر، لە(1963، 1964)ەوە تا1970، دیسان لە ریزەکانی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان، کە سکرتارییەتی ئەوسا، لە ڕێی شەهید (عومەر تۆفیق)ەوە داوایان لێکردم بەرپرسیی لیژنەی شارو لقی سلێمانی و لیژنەی بەرزی کچانی قوتابیان بگرمە ئەستۆ، ئەوەبوو تاچەند ساڵێك بە مامۆستاییش ئیشی قوتابیانم ئەکرد، لەدووەم کۆنگرەی یەکێتیی مامۆستایانی کوردستاندا، کە لە ڕۆژانی10-1965/2/11دا بەسترا لەماڵی کاك جەلال عومەر کە بەرانبەر ئامادەیی سلێمانیی



لە چەپەوە: جەمال عەبدول، ئەحمەد محەمەد مستەفا، بەهزاد ساڵح عەلی، مەحمود مەلا عززەت

کچان بوو نزیك گردی سەیوان، لەگەڵ مامۆستایان حەمەنوری تۆفیق و کەمال میرزا غەفوور و حەمەی مەلا حسەین و ئەکرەم فەوزی، هەڵبژێردراین بۆ سکرتارییەت و هەردووکمان و کاك حەمەنوری و کاك فوئاد قەرەداغی بووینە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری ئامانج، دواتریش هەر بەو جۆرە دوای سێیەم کۆنگرەی (ی.م.ك) کە لە 19-20/تەمووزی 1968دا لە سلێمانی و لە ماڵی عەبدولرەحمان مەلا عومەری برای شەهید عەبدولقادر مەلا عومەر، کە لە ماڵەکەی خوالێخۆشبوو (مامۆستا ساڵح عەلی)دا بوو لە گەڕەکی قەزازەکان بەسترا، تا 1970، هەر بەو پێیەش، لە کۆنفرانسی ناوچەی سلێمانی پارتیدا ساڵی 1968، هەڵبژێردرا ین بۆ لیژنەی ناوچە و دواتریش بۆ کارگێڕی لقی1 (لقی سلێمانی)ی ئەو کاتە، لە 11ی ئازاری 1970وە بە بڕیارێکی سەرکردایەتی پارتی، بەرپرسی لق و ناوچەی پارتی و ڕێکخراوەکانیشم پێ سپێردرا، لقێکی نهێنیم لە خۆم و هەڤاڵان جەباری مەلا محەممەد و دکتۆر محەممەد مەمەندی دانساز و ناوچەی نهێنیش لە خۆم و هەڤاڵان محەممەد سابیر و جەمال تایەر و کەمال خۆشناو و دوو برادەری تر پێکهێنا، تا 1971/2/10، کە کۆنگرەی حەوتەمی پارتی، لە بەغا گیرا، دووەم دانیشتن لە ماڵی مامۆستا برایم ئەحمەد بوو، ناوی ئەوانە خوێندرایەوە کە بۆ تێکەڵبوونەوە لە لایەن (م.س)ەوە دیاری کرابوون، هەڤاڵان جەمال تایەر و محەممەد سابیر و عەبدوڵڵای حاجی سەعی بۆ ناوچەی سلێمانی و کەمال خۆشناو و مەحموی مەلا عیززەت و فوئاد قەرەداغی و حەمەچاوشین و ڕەفعەتی مەلا بۆ لقی (4)، ئەوەبوو یەکسەر جەمال تایەر و محەممەد سابیر هەڵسان و کردیان بە هەرا و ناڕەزایی دەربڕین، وتیان بۆچی ناوی ئەوی تیا نییە، لە کاتێکدا لەو بارودۆخەدا کە کەس نەیئەوێرا بجوڵێتەوە و ناوی هیچ بهێنێت، ئەو هەموو بەرپرسییەکی لق و ناوچەی نهێنی حیزب و هەموو ڕێکخراوەکانیشی گرتە ئەستۆ و جارەها کەوتە بەر مەترسیی کوشتن و چاودێریی بەردەوام و ماڵ پشکنین و زۆر کێشە و گۆبەنگی تر کەچی ئێستا هیچ بەرپرسییەکی حیزبیی پێ نەسپێردراوە و.... تاد!!!،

لەگەڵ چەند مامۆستایەکی تردا منیشیان دانابوو بۆ لیژنەی تەنفیزیی ی.م.ك، ئەوەبوو دوای تێکەڵبوونەوەیش و تا چوونە دەرەوەی 1974یش، زۆربەی کێشەکانی تێکەڵبوونەوە و برادەرانی ڕێکخستنەکانی سلێمانی و گێچەڵ و چاودێریی بەردەوامی خۆم و ماڵ و پشکنین و زۆر گۆبەنگی تریش هەر بەرۆکی منی ئەگرتەوە و یەخەگیری من ئەبوو..، ئەو برادەرانەی ناوم بردن (کە لە ناوچە و لقدا تێکەڵ بووبوونەوە)، ئاگاداری هەندێکی ئەو کێشانەبوون.

دوا مەنزڵ کە پێکیەوە کۆکردینەوە لە ساڵی 1996دا، مەڵبەندی کوردۆلۆجی بو، کە بە داخەوە ناکۆکی و ناتەبایی و پێکەوە نەگونجان و هەڵنەکردنی ئەزەلیی نێوان پسپۆڕ و پرۆفیسۆرە چارەی یەکنەویستەکانی کورد، ئەو مەڵبەندەی سڕکرد و نەیهێشت بکەوێتە سەرپێ و گەشەبکات و بخەملێ و ئەرکە زانستی و ئەکادیمی و نەتەوەییەکانی جێبەجێ بکات.

ئەبێ لە کۆتایی ئەم چەند وشەیەدا بڵێم، کاکە مەحمود، مرۆڤێکی کوردپەروەر و پابەندی ڕێبازی پیرۆزی کوردایەتی و کاری ڕێکخراوەیی و مامۆستایەکی دڵسۆز و نووسەر و ڕۆژنامەنووسێکی توانا و لێهاتوو بە بڕشت و مێژوونووسێکی بە سەلیقە و شەیدایەکی بەڵگەنامە و تۆژیارێکی خەمخۆری ئەو بوارە کەمڕێبوارە و خاوەن هەڵوێست و ڕاوبۆچوونی تایبەتی خۆی و لە کۆنگرە و کۆبوونەوە گشتی و کۆڕ و سیمینارەکاندا بەشدارێکی وریا و قسەکەرێکی هۆشیار و کارساز و نەخشەکێشی پێشنیاز و پرۆژە و بڕیاری دروست و گونجاو و ژیرانە بوو...، لەو پێناوەیشدا تووش و دووچاری زیندان و دوورخرانەوە و دەربەدەری و ئاوارەیی و زۆر مەینەتی هات و لە هەموو سات و قۆناغەکانی ژیانیدا، هەمیشە لایەنە گشتی و نەتەوایەتییەکەی زاڵ بوو بەسەر هەموو شتێکی تریدا و کۆچی پڕداخ و ناوادەی زیانێکی گەورە بوو لە کورد و فەرهەنگی کورد و لەدەستچوونی خەمخۆرێکی کەموێنەی خواست و ئامانجە نیشتمانی و نەتەوایەتییەکانی بوو...

تێبینی: ئەم وێنانە ڕۆژی هەینی (1959/3/6)، لە سەیرانێکی لاوانی دیموکراتی کوردستاندا بۆ سەدی هندیە گیراوە.

# ڕۆیشتنی ئەمجارەیانت وەک هیچ جارێکی تر نەبوو

سالح محەمەد ئەمین

نامەی ئەو جارەیانت وەک هیچ جارێکی دی نەبوو.. لە نێوان وشەکانیدا فرمێسکی غوربەت نەدەباری، بۆن و بەرامەی خاکی لێنەدەهات، بە کۆڵانە تەسک و باریکەکانی قەزازەکاندا نەیدەبردم، باسی گورزە نامەکانی شۆڕشەکەی جەمهورییەتی کوردستانی تیا نەبوو، ئەو نامانەی پێتوابوو، دەیان کوپەڵە زێڕن و لە ماڵی حەمە ڕشیدخانی سەرکردەیەکی ئەو شۆڕشەدا دیوتنەتەوە، هەمیشە خۆت بە قەرداریاری ئەو هەڵوێستەی بنەماڵەکەیان دەزانی و، ئەوانیش تۆیان بە ئەندامێکی خۆیان دادەنا، چونکە توانیت مێژووی کۆماریان بەبەڵگەنامەوە بۆ بگێڕیتەوە.. دوانامەت بیرەوەرییە لە یادنەچووەکانتی بۆ نەدەگێڕامەوە، باسی شەوی هەڵکوتانە سەر ماڵتانی تیادانەبوو، نوکتە پڕ کاکڵەکانیی لەخۆ نەگرتبوو.. باری وڵات وای لێکردبوویت هەموومانت لە خۆتدا دیبۆوە، پێتوابوو سەرجەم برادەرەکانت دەبێ بەیەک مێشک بیرکەنەوەو ئەویش مێشکی خۆت بێت.. هەر ئەوکاتە زانیم نەهامەتی نەتەوە کلۆڵەکەت چی بەسەر هێناوی... نەهامەتییەک کە ئەوەتەی کورد هەیە وەک نەخۆشییە کوشندەکەی تۆ، پێوەی لکاوەو لێشی نابێتەوە، نەهامەتییەک نەک تۆی مێژوونووس و گەڕۆک بە دوای کەلێنەکانیدا، بەڵکو سەرجەم ئەو کەسانەشی سەرسامکردووە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان بیریان لە نووسینەوەی بەشێک یان هەموو مێژووی کورد کردبێتەوە...

سەردانەکەی دواجارت وەک هیچ جارێکی دی نەبوو.. دوای حەوت ساڵ دابڕان، دوای تەلەفۆنەکەی بەختیار و گەڕان بەدوای شوێنی دابەزینمدا، زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕێم دەکردی.. بە گەیشتنیشت هەنسکی شادی بەیەکگەیشتنەوە قوڕگی گرتم و ئەو حەوت ساڵەی پێچایەوەو تووڕی دایە شوێنێکەوە مەگەر بۆ مێژوو بگەڕێمەوە سەری، منیش لە دەست لەملانت بەولاوە هیچی ترم بۆ نەکراو بۆ نەوترا.. کە هاتینەوە سەرخۆ، پێمنا بەجەرگی خۆما و پرسیارێکم لێکردی، پرسیارێک لە دڵما ببوە گرێ، ئەویش نەناردنی پرسەنامەی "دارا"ی جوانە مەرگبوو. وتت: من لێرە لەجێی تۆ خاوەن پرسەبووم ئیتر پرسەی چی بنێرم!

چوونە کتێبخانەی سلێمانی ئەمجارانەمان وەک هیچ جارێکی تر نەبوو، کاک عومەر بەدەنگی بەرزو بێسڵەمینەوە بەسەرهاتەکانی بەندیخانەی بۆ دەگێڕاینەوە. ئەگەرچی هەندێک لە برادەرەکانی جارانمان نەدەبینی بەڵام بە هۆی قسە بە توێکڵەکانی خاوەن کتێبخانەی برادەرمانەوە هەستمان بەبوونی هەموویان دەکرد.. جا کەی گیانی دوکتۆر خەسرەوخاڵی جوانە مەرگمان لانەبووە؟ تۆش کە باسی دوا شەوی سەرهەڵگرتنەکەی دوای بەندیخانەی خۆتت بۆ دەگێڕاینەوە، ماڵی ئەوانت لە یاد نەدەکرد، وەک خۆیمان لەگەڵدا وەستابێ و قسە بۆ ئەو بکەیت و بیکەیتە شایەتحاڵ، ڕووی چەند پرسیارێکت لەو دەکرد.. چاوت بۆ کەماڵی برازای کاک عومەر دەگێڕا...

دوا سەفەری پێکەوmییمان وەک هیچ سەفەرێکی تر نەبوو.. بەیانی زوو کە بەڕێکەوتین، زۆری نەبرد کاکی شوفێر جگەرەی داگیرسان. جگەرەکێشانی جارانی تۆو بی ّزاری ئەوساتی بیرخستمەوە، کابرامان ناچارکرد کاتی لێخوڕین واز لە جگەرەکێشانەکەی بێنێ.. بۆ یەکەمجار شاری ئولفەم بینی، "قادر"ی برادەری "ژیلوان"م ناسی، ئەو قادرەی لەو چەند شەوە پێکەوەییەی تورکیاماندا تەواو پێمانەوە ماندوبوو.. چ لە ئولفەو چ لە ئەستەمبوڵ زۆر شوێنەواری کۆنمان پێکەوە کرد.. ئەوکات ترسی نەخۆشکەوتنتم لێنیشتبوو، بەڵام خواوڕاستان وا نەکەوتەوە...

وەڵامدانەوەی ئەمجارەیانت وەک هیچ جارێکی تر نەبوو.. نەخۆشیش وەک برادەرەکانت خۆشیان دەویستی و نۆرەیان بۆ دەگرتی و بەرۆکیان بەرنەدەدای.. واش هەرچەند لەو بارەیەوە لێمپرسیبیت، گەر بە "زۆر باشم" وەڵامت نەدابێتمەوە ئەوا بە"باشم" بووە، کەچی ئەمجارەیان کە لێمپرسیت: چۆنی؟ وتت: " خراپم، زۆر خراپم" بۆیە هەر ئەو کاتە ترسم لێنیشت.. چۆن نا؟ ساڵی پار، کە خۆت وتەنی "جا ئەوە بۆمن ساڵ بوو؟" هەرچەند لێرەوە تەلەفۆنم لەگەڵدا کردبێت، لەو دوورەوە دەتووت "باشم، بەدڵی تۆم، خەمتان نەبێ چاك دەبمەوەو دێمەوە ناوتان" کەچی ئەمجارەیان بە "خراپم"یش قایل نەبوویت، بە "زۆر خراپم" وەڵامتدامەوە.. خۆ کە دکتۆر فوئاد بابانی برادەری پەنجا ساڵەت تەلەفۆنی بۆکردیت و داوای "ژیلوان"ی لێکردی، تۆش تەلەفۆنەکەت دا بەمن، پێیڕاگەیاندم بەزووترین کات بتگەیەنمە نەخۆشخانەی کۆماری، هێندەی دی ترسم لێنیشت...

ڕەنگی ئەمجارەیانت وەک هیچ جارێکی تر نەبوو، زەردەچەوە لە چاویا زەردی لەخۆبڕیبوو، هیچ شتێکی ئەمجارەت وەک خۆی نەبوو.. تا دەهات دەنگت نزمتر و ڕەنگت زەردترو چاوت خەواڵوترو هەناسەشت سوارتردەبوو، تەنیا شتێک کە وەک خۆی مابوو، ڕاستگۆییەکەت بوو.. هەر کە خرایتە سەر قەرەوێڵەکە و پاڵکەوتی تەلەفۆنەکەت دەنگی لێبەرزبۆوە، کە سەیری ناوەکەت کرد، گورج داتخستەوەو وتت: "نازانم چی بە ژوان - بڵێم؟"، حەزم نەکرد خۆت قسەی لەگەڵدا بکەیت چونکە بە "زۆر خراپم"ەکە دڵیت بەردەدایەوە، بۆیە تەلەفۆنەکەم لێوەرگرتیت و دامە دەست "ژیلوان". ئیتر ئەو چەند ڕۆژەی دوایی بێئاگایی لە ئامێزی گرتیت.

جێهێشتنی ئەمجارەیانت وەک هیچ جارێکی تر نەبوو.. لە چوونە شاختدا هیوای سەرکەوتنت پێدەبەخشین. لە نسکۆ و دەربەدەرکردنیشتدا پەڕەکانی مێژووی نەتەوەکەمانت بۆ شیدەکردینەوە، پێوەندی خۆت و هاوڕێکانی وڵاتت بە ئاوارەو دەربەدەرەکانی دەرەوە گرێدەدایەوە. ڕووی

گەشی کوردت نیشانی خەڵکی ئەو شوێنە دەدا کە بۆی دەگویزرایتەوە.. لەوێ کە پێت لەسەر داوای مانگانـــەی گەڕانـــەوەت دادەگـــرت، خۆشەویستی خـاك و نەتـەوەت، بـۆ بـەناو بەڕێوەبـەری گشـتی پـەروەردەی رومـادی دەسەلماند.. لە گرتنیشتدا، کـە هێشتا زامی نەشتەرگەریی دەرهێنانی گورچیلە رزیوەکـەت خـۆش نـەببۆوە، نەبـەزینی نەتەوەکـەمانت بـەڕووی مرۆڤکوژانـدا دەتـەقاندەوە، ئەگـەرچی من ئـەو کاتـە ترسـی ئـەم کۆچـەی ئێسـتاتم لێنیشتبوو، چونکە هـەم لەخۆگرێتی تۆ و هـەم لـە جانـەوەرێتی ئـەوانیش دڵنیـابووم.. ئـەو بەیانییـە کـە خـۆم گـەیاندە ماڵتـان و پێشـتر دوکتۆر خەسرەو خاڵی جوانەمەرگ گەیشتبوو، زانیبووی دەستیان لە هیچ گیر نەبووەو هـەموو نووسراوەکانی لەگەڵ خۆیـدا بردبـوو، ئـاهێکم پیاهاتەوە.. زۆرجار کە بۆ دڵنەوایی سەردانی براکانت و باوك و دایکت و گەلاوێژخانی هەموو کەسیی منداڵـەکانتم دەکـرد، نـەمدەزانی چـۆن خۆم لە پرسە نیگاکانیان بدزمەوە، هیچ شتێکی وام لا دەستنەدەکەوت دڵیانی پێخۆشکەم.. لـە دوا سـەردانی ئـەو کاتـەمداو، لـە کـاتێکدا بـە ورەیی و خۆگریم لە ڕووی دایکێکـی نەبـەردی ئـەم نەتــەوە کلۆڵــەدا دەخوێنـدەوە، زەنگـی تەلەفۆن هەموومانی گێڕایەوە ژووره گچکەکەی خـۆت، ئـەو ژوورەی کورسـی و مـێزێکی کونجێکـی، هـەموو دونیـای تۆبـوو، دونیـای نووسین و خوێندنـەوەی پێش گرتنەکـەت، هـەر لــەوێدا بەشـــی یەکـــەمی جمهوریـــەتی کوردستانەکەت تـەواوکردو ناردت بـۆ دوکتـۆر کـەمال مەزهـەرو، ئـەویش دوای ماوەیـەك بـە نامەیەکەوە بۆی گێڕایتەوە، داوای لێکردبووی، گـەر رێـدرا چاپیکـەیت لـە بیست هـەزار دانـە کەمتری لێچاپ نەکەی‌و، دەستخۆشانەشـی بـۆ نـاردبوویت.. دەنگـی ئـەو سـەری تەلەفۆنەکـە هـەموانی شڵەژان، چونکـە بڕوایـان بـەگوێیان نـەدەکرد، کـاتێك دایانـە دەستم و ڕۆژباشمـان لەیـەکترکرد ئـەمجا لـە هـۆی پەشـۆکاوێتیان گەیشـتم، وتـت: بەمزوانـە بـەردەبین، چـەند ڕۆژێکەو دێینەوە ناوتان... لەوێشدا وتت: زۆر باشـم و خـەمتان نـەبێ! پێـم سـەیربوو چـۆن خەممان نـەبێ؟ کەس بە تەماتان نییـەو تـۆش دەڵێی خەمتان نەبێ..

ناکرێ بۆ ڕۆیشتنی ئەمجارەت خەممان نـــەبێ، ئـــەی ئـــەو پرۆژانـــەی داتنـــابوو بیاننووسیتەوە؟ کاروانە بێکۆتاییەکـەت بۆکـێ جێهێشت؟.. کاروانـە پڕئـازارو ئەشکەنجەکەت هـەر بەردەوامـە، لـە هـەر شـوێنێکی ئـەم سـەرزەوییە ئـازارو ئەشـکەنجە هـەبێ لـە کاروانەکەی تۆدا شوێنی خۆی دەکاتـەوە، تـۆ ئەگـــەرچی ئـــەو بەشـــەی کاروانەکـــەت مەینەتییەکانی نەتەوەکـەتی تیـادا کۆبۆتـەوە بەڵام هەمیشە هەستت بـە ئـازاری مرۆڤـەکانی دونیاکردووەو، من پێموایە، گەر مـەرگ رێگرت نەبوایـە ئـەوا جێگـەی ئـەو ئازارانەشـت لـە کاروانەکـەتدا دەکـردەوە... پێدەچـێ، خـۆت وتـەنی کـاروانی نەهامـەتی‌و کلۆڵـی "کۆتـایی نـەبێ". ئەو کاروانەی تۆ سەرەتاکەیت دەست پێکردو داترشت، بە شێوازی جۆراوجۆر بەڕێوە دەچـێ‌و کۆتـایی نابـێ، بۆیـە بـە کراوەیـی جێتهێشت!!

ئەو ڕاستییەی ئـەمجارەی ژیلـوان دای بەگوێمدا لـەهیچ ڕاسـتییەکی تـر نـەدەچوو.. دوای پرسـەکەت، کـە لـە باخچـە بچووکەکـەی پێشـەوەی خانووەکـەتان دانیشـتبووین، ئـەو خـانووەی بـە دڵوبـەگیان بـۆ حەوانـەوەی خاوخێزان دروستتکردو لـەم دونیای بەرینـەدا لـەوە زیـاتر شـك نابـەیت، ڕۆژێـك چییـە بـە خێزانـەوە ژیانتان تیا بەسـەرنەبرد، ئـەمڕۆ بـۆ پرسەکەی تۆ تیایدا کۆبوونەتەوە، ژیلوان وتی: " داخم ناچێ، باوکم پێمانەوە نەدەلکا، ئەوەندە لە ناوماندا نەبوو، هەمیشە لێمان دووربووە، بە پێشـــمەرگەیەتی بـــە بـــەندکراوی بـــە دوورخراوەیی، بە نەخۆشی لـەم دواییەشـدا بێکوردستان ئۆقرەی نەدەگرت، زۆر کەم نەبوایە نەدەهاتـەوە ناومان، بۆیە بیرمـان لەگەڕانـەوەی هێجگاری دەکردەوە، تا چەند تەمەن ڕێمان با پێك

سلێمانی

2005/5/27





ماموستا مەحمود مەلا عززەت، کاك نەوشیروان مستەفا

بەرلین



مەحمود مەلا عززەت

هاوینەهەواری سەرچنار 1956



ماموستا مەحمود مەلا عززەت، د. کەمال مەزهەر، د. ئیحسان فوئاد

سلێمانی 2003



لەڕاستەوە ماموستا مەحمود مەلا عززەت، شێرکۆ بێکەس

هەڵەبجە - 2002



کۆنگرەی لاوانی دیموکراتی، بەرلین 1973



وێنەیەکی خێزانی لەڕاستەوە:

ژیلوان، ڤیان، گەلاوێژ خان (خێزانی ماموستا)، ژوان، ئاریان،

ماموستا مەحمود، مەریوان

سوید - 1981

# یەکەمین وانەی کوردایەتی

چلودووساڵی رەبەق لەمەوبەر، کە هێشتا ئێمە خوێندکاری ناوەندییە بچوکەکەبوین... ساڵ لە نیوەی تێپەری کردبو کە بۆ یەکەم جار گوێمان لە ناوی ما مۆستایەکی تازە بو: "محمودی مەلا عزەت" دێت بۆ خوێندنگەکەمان.... مامۆستاکەی خۆمان کە یەکێك بوو لە عەرەبە چەپرەوەکان مانگێك زیاتر بوو گیرابوو... ئێمەی پۆلی سێی ناوەندی وبەکەلۆریا... تامەزرۆی تەواوکردنی وانەکانی کۆمەڵایەتی بووین: "جوگرافیا - مێژوو پەروەردەی نیشتمانی" بە تاسەوە خواخوای هاتنی مامۆستایەك بوین، پاش ئەوەی نزیکەی مانگێك زیاتر تێپەری کردبوو بەسەر گیرانی مامۆستاکەماندا وبێ مامۆستا مابوینەوە.

ئەو رۆژەم هەرگیز لەیاد دەرناچێت کەبۆ یەکەم جار مامۆستا محمود هاتە ژورەوە... پیاوێکی لاواز.. ئەسمەر.. کەمێك چاوەکانی چوبوون بەقوڵدا وگوێیەکانی ووشك وبێرەنگ بون.. باڵایەکی مام ناوەندی... لەبەردەمی تەختەرەشەکەدا وەستاو سەیرێکی کردین کەهێشتا هەموو بەپێوەبووین.. وتی دانیشن... لەپاشدا پیاسەیەکی زۆر خێرای بەژورەکەدا کردو روی تێکردینەوە و ووتی: "لە هیچ کەسێکی قبوڵ ناکەم بێتە ژورەوە بێ سەعی کردن.." و ئیتر یەکسەر دەستی کرد بە دەرس و دەیزانی ئاکۆی گەیشتوین... دەسا هەرواشبوو، لەو رۆژەوە، هەرگیز رێگای نەدا یەکێك بێ ئامادەکردنی مادەکە لە پۆلدا دانیشێت، کەمێك تورەو بێ زەردەخەنە و بێ پێکەنین بوو.. جۆرێك لە دڵەراوکێ و ترسی خستە ناو دڵمانەوە، ئەمان دەتوانی بەچرپەش لەگەڵیەکدا قسەبکەین... هەر لە سەرتاوە بەپێی ئەقڵی ئەو کاتەمان جۆرێك لە رق وەرسیمان لادروستبوو.. ئەم پیاوە رەش تاڵە لاوازە کێیە ئەوەندە بەزەبروزەنده.

رۆژێك کە هەرگیز بیرم ناچێتەوە.. مامۆستا مەحمود باسی هۆیەکانی دوا کەوتنی کشتوکاڵی لە عێراقدا بۆ دەکردین کە یەکێك بوو لە فەسڵەکانی کتێبی جوگرافیاکەمان ویەك یەك هۆکانی بۆ شی دەکردینەوە، لەپرێکدا خوێندکارێك دەستی بەرزکردەوە بەعەرەبی کە ئەوکاتە هەموو وانەکان بە عەرەبی بوون ووتی: "استاذ هناك نقطة اخرى" مامۆستا مەحمودیش ووتی: "تفضل" خوێنکارە کە ووتی: "قصف القرى والمدن" بەراستی شوێنی خۆی بوو چونکە گەورەترین هۆی دواکەوتن بوو، بۆردومانی شارو شاروچکە و دیهاتەکان کشتوکاڵی لە بنو بێخ دەرهێنابوو" بەڵام ئەو، خوێن پەریە ناو سەریەوە و لەپڕ یەك شەقازلەی توندی سەپاندە گوێی خوێندکارەکە و بەدەنگی بەرز و بەپاڵ کردیە دەرەوە... ئێمە هەموو وەك لاشەی مردومان لێهات و سرووە لە هیچ کەسێکمانەوە نەهات... ئەوە بەسبوو بۆئێمە کە لەدوای دەرسەکە کۆببینەوە هەر هەموومان بە پیاوێکی خراپ... یا سەربەرژێمی بزانین.. پیاوێك کەدژی نەتەوەومیلەتەکەی خۆیەتی.. ئەو کاتەش زۆربەمان سەر بە قوتابیانی کوردستان بوین.. و زۆر بەخێرایی لەرێگای رێکخستنەکانمانە وە، ئەممەمان گەیاندە پارتی ئەوسا وپێمان وتن شتێکی ئاوا رووی داوە و پیاوێکی سەربە میریە.. پاش ماوەیەکی کەم وەڵام هاتەوە کەئێوە هیچ حەقێکتان نەبێت ئێمە خۆمان چارەی دەکەین!!

رۆژگار.. رۆژگاری رژێمی رەگەزپەرست خوێنمژی بەعسە.. حوکمی عبدالکریم قاسم چەند مانگێکە رووخاوە... ئەو رێکەوتنەی بۆ ماوەیەکی کەم لەگەڵ سەرکردایەتی بزوتنەوەی کوردایەتیدا کرابوو هەڵوەشابوەوە و رۆژانە خەڵك دەگیران و دەخرانە ناو بەندیخانە و زیندانەکانەوە...

مانگێك بەسەر ئەم رووداوەدا نەرویشت کە درندەیەکی وەك "زەعیم سدیق" لە سلەیمانی بانگەوازی بۆ هەموو فەرمانبەرو مامۆستایان دەرکرد کە دەبێت ئەو فۆرمی پڕجنێوە ئیمزابکەن دژی سەرکردایەتی بزوتنەوەکەو کورد و جنێوبەسەرکردەو حزبەکەش بدرێت..

هەرکەسێك ئیمزای ئەو فۆرمە ئامادەکراوەنەکات دەگیرێت و خوا دەزانێت چارەنوسی چی دەبێت؟! رەنگە ئیتر نەبینرێتەوە...

ئەو رۆژانەو تازیاتر لە هەفتەیەك دەرس و دەورمان نەما.. بەردەوام خەریك بوین لەگەڵ مامۆستاکانمان کە نەیکەن و سەرمان شۆڕنەکەن ولییان دەپاراینەوەو کەسمان نەدەچووە ژوری پۆلەکانەوە... و هەر هەموو مامۆستاکان دەیانوت" چۆن شتی وا ئیمزا دەکەین..." بەڵام کەس نەیدەوێرا بە ماموستا محمود بڵێت.. چونکە لامان روون بوو کە یەکەم کەسە کە ئیمزای دەکات...

شەوی بەهارێکی ساردبوو... سەعات لە11شەو تێپەریبو، برادەرێکی خۆشەویستم لە دەرگای ماڵەکەمانیدا... وتی.. "دەزانیت هەموو مامۆستاکانمان ئیمزایان کرد.." یەکسەر تاسام"چۆن؟! "بەخوا!"

-"تەنها..." ئێ تەنها چی؟...

تەنها مامۆستا محمود نەیکردوە..

-کام مامۆستا مەحمود؟

-بۆ ئێمە چەند مامۆستامان بەو ناوەوە هەیە؟!

ئەوە بۆ ئەوکاتەی من روداوێکی سەیربوو..

..بەیانی کە چوینەوە بۆ خوێندنگە بەتەواوی هەواڵەکە لەناو خوێندکاراندا بڵاوبو بوەوو مامۆستاکانمان لە ژوری مامۆستاو بەرێوەبەر نەدەهاتنەدەرەوە لەپر مامۆستا محمود دەرکەوت... ئەوە یەکەمین جارم بوو لە ژیانمدا ئاوای ببینم.. دەموچاوی گەش.. وەك مانگ وابوو.. پرشنگی دەدا و یەك زەردەخەنەی زۆر کەم لەسەر لێوەکانی بوو... پێی وتین.." بچنەژورەوە."

هەموو رامانکردە ژورەوە هەرکەسە لەسەر جێگاکەی خۆی دانیشت.. ئەو ساروی تێکردین و وتی: "کورەکانم.. براکانم.. عەزیزەکانم... جێی داخە قەدەر رێگای نەدا کتێبەکانتان پێ تەواوبکەم... من بۆ کارێکی تایبەتی خۆم رەنگە لێرە نەمێنم.. خۆتان سەعی بکەن... دەردەچن... داوای لێبوردن لە هەرهەموتان دەکەم، بەتایبەتی هەرکامێکتان کە ئازارم دابێت" پێی نەوتین بۆ کوێ دەروات هەڵوێستەیەکی کردو روی تێکردینەوە" تەنها شتێك کە دەمەوێت پێتان بڵێم ئەوەیە"قەد مەهێڵن سەر شۆڕبن.. هەمیشە ناوچەوانتان بەپاکی. و بەبێگەردی بهێڵنەوە. خۆشەویستی نەتەوەکەتان لە هەموو شتێك پیرۆزترە " ئیتر دەرگاکەی کردەوە ویستی بڕوات.. لەپڕ دەنگی یەکێك لە قوتابیەکان بەرزبوەوەو هاواریکرد" بەقوربانت بین..." دەنگەکان زیادی کرد ویەك یەك خوێنەکارەکان دەیانوت" هەرهەموومان بە قوربانت بین" لە پڕ یەکێك لە خوێندکارە گەورەکان پەلاماریداو خستیە سەرشانی بەراڕەوی خوێندنگەکەدا بەرەو ژووری بەرێوەبری برد و هەر هەموو لەدواوە بە قوربانی دەبوین.. ئێمە داوای لێبوردنمان لێ دەکرد کە بەهەڵە تێی گەیشتبوین، کەنزیك بوینەوە لەژووری بەرێوەبەر دابەزی ونەچوە ژوورەوەو بەپلیکانەکاندا بەخێرایی بەرەو دەرگای حەوشە چوو.. هەردوو دەستی بەرزکردەوە سوپاسی هەمومانی کرد کە هەر لەدواوەی بوین و لە کۆڵانە باریکەکانی بەردەم قوتابخانەکەمانەوەو ونبوو.. ئەوسا بیستمان کە مامۆستا مەحمود تێکۆشەرێکی گەورەی ئەوسای پارتی بوو هەرگیز خۆی لای کەس دەرنەدەخست و ئەوانیش لەکاتی خۆییدا بۆیە، ئەو وەڵامەیان داینەوە ورێك بەرەو شاخ رویشت.

ئەو هەڵوێست و ئەو چەند قسە کورتەی مامۆستا و برام کاك مەحمود کە لە پاشدا پەیوەندیمان زۆر بەهێز بوو هەمیشە و هەتا هەتایە بوە یەکەمین وانەی کوردایەتی کە هەتا ماوم شانازی پێوەدەکەم و خۆم بە قەرزاری هەتا هەتایی ئەو کەڵەپیاوە مەزنە دەزانم دەزانم.

**ئەکرەم قەرەداخی**

